
زیاتر لە 1000 گوڵی بۆن خۆش و جوان
پێشکەش بە خوشکی موسڵمان
منتدى إقرأ الثقافي
WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM
نووسینی
خالد الحسینان
وەرگێڕانی
باوکی عبدالله
1432ك
2011ز

# زیاتر له ۱۰۰۰ گوڵی بۆن خۆش و جوان پێشکەش بە خوشکی موسڵمان

نووسینی :
خالد الحسینان

وەرگێڕانی :
باوکی عبدالله

۱٤۳۲ك ۲۰۱۱ز

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: زیاتر لە ١٠٠٠ گوڵی بۆن خۆش خۆش و جوان پێشكـەش بــە خــوشـكی موسـڵمان

بابەت: ئایینی

نوسینی: خالد الحسینان

وەرگێرانی: باوكی عبدالله

نەخشەسازی: نوسینگەی هیوا بۆ كۆمپیوتەر

چاپ: چاپی یەكەم ٢٠١١

چاپخانەی:

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ، ٤٣ ساڵی٢٠١١ی پێدراوە

# پێشەکی وەرگێر:

سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوای کە ڕێنموونی بەندەکانی کردووە بۆ چاکترین ڕێگا، درودو سڵاو لەسەر ئەو پێغەمبەرەی کە ئوممەتەکەی ئاگەدار کردوتەوە لە هەموو شتێکی باش کە خۆشگوزەرانیان دەکات بۆ ئەنجامدانی، وە لە هەموو خەراپەیەکیش کە ژیان‌و گوزەرانیان تێک دەدات بۆ خۆ لێپارستنی، هیواو ئاواتی موسڵمان لەدونیادا دەبێ ڕەزامەندی خوا بێت‌و چەسپاندنی دینەکەی بێت لەسەر زەوی، ئەو شتەش نایەتە دی مەگەر بە چاکسازی کۆمەڵگا نەبێت، کۆمەڵگاش چاک نابێت‌و بەرەو خوا ناچێت مەگەر بە چاکسازی خێزان نەبێت چونکە هەر کۆمەڵگایەك پێك هاتووە لە کۆمەڵێك خێزان، وە هیچ خێزانێکیش چاك نابێت مەگەر بە چاکبوونی ئافرەت نەبێت چونکە ئافرەت ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ بۆ دیندار کردنی پیاوەکەی، هەروەها لە یارمەتی دانی پیاوەکەی بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکانی، بۆیە ئەو شتانە هاندەرم بوو، بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی ، ئەم کتێبەی بەردەستان کتێبێکی گشتگیرە، زۆربەی هەرە زۆری بوارەکان‌و

ئەو بابەتانەی لە خۆ گرتووە کە موسڵمان بەر چاو ڕوون دەکات لە ژیانی ڕۆژانەی، تا ڕادەیەکی زۆر ڕەوێنەرەوەی بێ ئاگایی‌و ئەو نەزانینە زۆرەیە کە موسڵمان گیرۆدەی بووە لەم ڕۆژگارە، بە هیوای ئەوەی هەموو لایەك سوودی لێ ببینی‌و دوعای خێر بۆ نووسەرەکەو وەرگێڕەکە بکەن بەو هیوایەی کە خوا کاری ڕاست بۆ هەموومان بێنێتە پێش‌و لە گوناهەکانمان خۆشبێت.

# پێشەکی دانەر:

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردیگاری جیهانیان، درودو سلاو لەسەر پێغەمبەری خوا . یەکێك لە ئەرکە هەرە گرنگەکان کە پێویستە بیزانین ئەوەیە، جیاکردنەوەی شتە رێپێدراوەکان و قەدەغەکراوەکان و (الحلال والحرام)، جێ بەجێ کردنی مافی خوایە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست. پێغەمبەر فەرموویەتی :( من یرد الله به خیراً یفقه في الدین ) رواه البخاري واتە یەکێك خوا خێری بۆ بوێت شارەزای دینی خۆی دەکات)

* لەم نامیلکەیە کورتەیەك لە گرنگترین بوارەکانی ژیان و ڕاو سەرنجم کۆ کردۆتەوە کە ئافرەتان پرسیاری دەربارەی دەکەن لە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا. جا بواری شەرعی بێت یان کۆمەلایەتی یان سایکولۆجی (نفسي) بێت ......هتد. بە شێوازێکی کورتکراو. بۆ ئەوەی بۆ ئافرەت ئاسان بێت و سوودی لێی ببینێت و لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێت بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێت.

# ڕێڕەوم لەم کتێبەدا

١. ئەم کتێبە بریتیە لە کۆمەڵێك ڕاو سەرنجو فەتوای کۆمەڵێك زانا لە " لیژنەی بەردەوام بۆ ڕابۆرتی زانستیو فەتوای شەرعی" لە وولآتی عەرەبی سعودی ، وەهەروەها شیخ عبد الرحمن السعدي، شیخ محمد بن إبراهیم موفتی پێشووی وولآتی سعودیە، شیخ عبد العزیز بن باز، شیخ محمد بن صالح بن عثیمین، شیخ عبد الله بن جبرین، شیخ صالح بن فوزان ، شیخ بکر أبو زید، شیخ عبد الله بن منیع.

٢. فەتوایەکانم کورت کردۆتەوەو کەمە دەستکارییێکم کردووە بەبێ ئەوەی مەبەستی تێك بچێت.

٣. نەهێنانەوەی بەڵگەی شەرعی لە زۆربەی مەسەلەکان لەبەر کورتکردنەوەکە.

٤. باسکردنی مەسەلە هەرە گرنگەکانو ئەو فەتوایانەی کە زۆربەی ئافرەتان پرسیاری لێ دەکەن، باسنەکردنی ئەو مەسەلانەی کە بە دەگمەنوکەم ڕوودەدەن.

٥. هەر برگەیەك لە برگەکانی ئەم کتێبە بە وەلآمی پرسیارێك دادەنرێت، لەنێوان دوو کەوانە ناوی موفتیەکەم نوسیوە بۆ دڵنیا بوونی سەرچاوەکەی.

٦. لەوانەیە دوو وەلامم کۆ کردبێتەوە بۆ زیاتر تێگەیشتنی تێکستەکەو کورت کردنەوەی بابەتەکەو زیاتر سوود وەرگرتن.

٧. ئەم کتێبە تایبەت نیە بە ئافرەتان بەڵکو تایبەتە بەو شتانەی کە ئافرەتان پرسیاری دەربارەی دەکەن.

٨. کتێبەکەم دابەش کردووە بۆ (٤٣) بەش بۆ هەر بەشێکیش ژمارەی تایبەتی خۆیم بۆ داناوە.

٩. لە سەرەتادا خوێنەر لێك چوونێکی زۆر لە نێوان مەسەلەکان دەبینێت بەلام دوای ووردبوونەوە لێی، گۆڕانێکی کەم دەبینێت یان بۆ زیاتر شیکردنەوەیە یان بۆ زیاتر سوود وەرگرتنە.

# ئافرەتو پاك بوونەوە

## ❖ (٣٠) وەڵامی تێدایە

بەربەستەکانی پاك بوونەوە

١. هەر شتێك بەربەست بێت لەبەردەم گەیشتنی ئاو بۆ پێست ،دەبێت لا ببرێت بۆ دەستنوێژ هەڵگر یان خۆشۆر.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢. بۆ ئافرەتی حەیزدار ئاسایییە دەتوانێت بۆیە بۆ نینۆکەکانی بەکار بێنێت چونکە نوێژ ناکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣. بۆیەی پەنچەکانی دەبیت لابەرێت کاتێك ویستی دەسنوێژ هەڵبگریت، یان خۆی بشۆات. چونکە ناهێڵێت ئاو بگاتە نینۆکەکانی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤. تێبنی :– نوێژەکەی تەواوو دروستە ئەگەر دوای پاك بوونەوە لێی دا بوو.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥. "خەنە" ئەگەر بوبێتە تەنێك یان قالبێك لەسەر دەستەكانی یان پێیەكانی، بەربەست بێتو نەهێلێت ئاو بگاتە پێستەكەت، ئەوە دەبێ لایبەری، پێش دەست بە دەسنوێژ یان خۆشۆردن بكات، بەلام مانەوەی رەنگەكەی لە دەست یان پێ هیچ كاریگەری لەسەر دروست بوونی دەست نوێژ نیە، چونكە رەنگەكەی بەربەست نیە لە رێی گەیشتنی ئاو.

«اللجنة الدائمة»

٦. سرینەوەی قژی داپۆشراو بە خەنە، دەكرێت ئافرەت بیسرێتەوەو مەسحی بكات، پێویست ناكات سەری بكاتەوە، بەلام لە پاك بوونەوەی گەورە ( وەكو جەنابەت)، ئەوە دەبێت هەموو سەری بشوات‌و، تەنها سرینەوە نابێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

٧. سرینەوە لەسەر رووپۆش (پێچە) دروستە، ئەگەر لە لەبەركردنەوەی ئەزیەت هەبێت یان لەبەر ساردی كەش‌و هەوا، یان لە دووبارە داكەناندن‌و پێچانەوەی ئەزیەت هەبێت ، ئەوە ئاساییە، ئەگینا چاكتر وایە نەسرێتەوە لەسەری

«الشیخ إبن عثیمین»

٨. مێش: بۆیە كردنی هەندێك قژە، ئەگەر بەربەست بوو لە رێی گەیشتنی ئاو بۆ پێست، لە كاتی خۆشۆردن‌و سرینەوەی سەر

لەكاتی دەستنوێژدا، ئەوە دەبێت لایبەریت چونكە ڕێگرە لە تەواو بوونی دەست نوێژ.

٩. بەلام ئەگەر بەربەست نەبوو لە ڕێی گەیشتنی ئاو ، تەنها بۆیە بوو وەكو خەنە، ئەوە ئاساییە.

«الشيخ إبن منيع»

١٠. ئایا بەكار هێنانی كرێمی قژو ، سوراوی لێو دەست نوێژ دەشكێنێت؟

ئەو شتانەو چەوریەكانیتریش دەست نوێژ ناشكێنێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١١. ئایا زەیت بە بەربەست دادەنرێت لە ڕێگای گەیشتنی ئاو بۆ پێستەكەت لەكاتی دەستنوێژ.

ئەگەر ئەو زەیتەی كە بە ئەندامەكانی دەسنوێژەوە هەیە قالبێك (تەنێك) بێت، ببێتە ڕێگر لە گەیشتنی ئاو، ئەوە دەبێت لایبەری پێش خۆ خاوێن كردنەوە، بەڵام ئەگەر تەنێك نەبوو ئەوە هیچی لەسەر نیە لە كاتی خۆ خاوێن كردنەوە نەیشوات بەسابوون، بەڵام دەبێت لە كاتی شۆردنی ئەندامەكە دەست بەسەر ئەندامەكە دابێنێت نەوەك ئاو هەڵبخلیسكێت لەسەری.

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ (حوکمەکانی پیسی)

١٢. پیسیەکی لە سەر جلەکەی بینی لە کاتی نوێژ کردن، دەبێت لە نوێژەکەی بچێتە دەرەوەو بیبرێت، پیسیەکەی بشوات پاشان بگەڕێتەوە سەر لە نوێ نوێژەکەی دەست پێبکات.

«الشیخ إبن جبرین»

١٣. ئەگەر گومانی هەبوو لە پیسی جلەکەی لە کاتی نوێژدا: نابێت لە نوێژەکەی بڕوات هەتا دڵنیا نەبێت لە هەبوونی پیسیەکەی.

«الشیخ إبن باز»

١٤. ئەو پیسیەی کە دەکەوێتە سەر بەرماڵو رایەخ: نابێت تەنها بە ئەسفەنج بسڕێتەوە بەڵکو دەبێت ئاو بپڕژێنێتە سەری هەتا زاڵ دەبێت لەسەر ئەو پیسیەی کە کەوتووتە سەری لە میزو شتیتر، ئەگەر پیسیەکە قالبێك بێت دەبێت لایبەریت.

«اللجنة الدائمة»

١٥. پیسی ووشك زیانی نیە:-

ئەگەر پیسیەکی ووشك بە لاشەکەی یان بە جلەکەی کەوت ئاساییەو زیانی نیە. وەهەروەها چوونە گەرماوی ووشك بە پێی

پەتی، بەڵام پێیەکانت ووشك بێت ئاساییەو زیانی نیە، چونکە پیسی بە تەڕی دەگوازرێتەوە.

«الشیخ إبن جبرین»

١٦. شۆردنی جلو بەرگی پاك لەگەڵ جلو بەرگی پیس ئایا کاریگەری لەسەر یەکتر هەیە؟

وەها دڵنیاترە جلە پیسەکان بە تەنیا بشۆرێت بەو بڕە ئاوەی پێویستیەتی، هەتاکو شوێنەواری پیسیەکە لادەچێت. وە ئەگەر جلەکان (پیسو خاوێنەکان) بەیەکەوە شۆردرا بە ئاوێکی زۆر، کە شوێنەواری پیسیەکەی لابداتو نەگۆڕێت بە پیسیەکە ئەوە جلەکان هەموو خاوێن دەبێتەوە.

«الشیخ إبن باز»

١٧. شۆردنی پیسی: لە لاشەی دەسنوێژ هەڵگر یان کەسێکی تری جگە لە دەستنوێژ هەڵگر دەستنوێژ ناشکێنێت، مەگەر دەستی بە عەورەتی بکەوێت، ئەو کاتە دەستنوێژی دەشکێت.

«اللجنة الدائمة»

١٨. لێواری کراسی ئافرەتێك ئەگەر بەسەر پیسی ڕەت بوو: حوکمەکەی، وەکو حوکمی نەعلە، ئەگەر بەسەر شتێکی

پیس ڕۆیشت، پاشان بەسەر شتێکی پاکی ووشك، ئەوە پاکی دەکاتەوە.

«الشیخ محمد بن إبراهیم»

## ❖ (حوکمەکانی دەستنوێژ)

١٩. دەکرێت ئافرەت قژی بسرێتەوە(مەسح بکات) لەکاتی دەستنوێژ، ئەگەر قژەکەی لوول دراوو کەزی بوو یان هاتبێتە خوارەوە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢٠. دەست لێدانی عەورەت: بەبێ پەردە یان بەربەست دەستنوێژ دەشکێنێت، جیاوازی نیە ئەگەر دەست لێدراو گچکە بێت یان گەورە بێت.

«اللجنة الدائمة»

٢١. هاتنە دەرەوەی با لە زێی (پێشەوەی) ئافرەت: دەستنوێژ ناشکێنێت چونکە لە شوێنێکی پیس نایەتە دەرەوە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢٢. دەست لێدانی ئافرەت: ڕای ڕاستودروستر ئەوەیە، دەستنوێژ ناشکێنێت جیاوازی نیە، ئەگەر بێگانە یان خێزانت یان مەحرەمت بێت، وجیاوازی نیە ئەگەر بە لەززەت وەرگرتن بێت یان بە لەززەت وەرگرتن نەبێت،

مەگەر ئاوێكی لێ هاتە دەرەوە ( لە عەورەتی) بەهۆی دەست لێدانەكە (وەكو مەذیو ئاویتر).

«اللجنة الدائمة»

٢٣. جەنابەتو خوێندنی قورئان: نابێ جەنابەت بوو قورئان بخوێنێت، هەتاكو خۆی دەشوات، جا خوێندنەكەی لەسەر قورئان بێت یان بە ئەزبەر بێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٤. هاتنە خوارەوەی با بە بەردەوام: لەسەری پێویستە دەستنوێژ هەڵبگرێت لە كاتی هەر نوێژێك، بەڵام ئەگەر لەسەری زاڵ بوو نەیتوانی خۆی ڕابگرێت نوێژەكەی تەواوو دروستە. «الشيخ إبن جبرين»

٢٥. سڕینەوە(مەسح)ی سەری ئافرەت: لە دەستنوێژ وەكو پیاوە، لەسەری پێویستە هەموو سەری بسڕێت، هەتاكو ئەو شوێنەی كە پرچی لێ دەڕوێت لە گەڵ گوێچكەكانی، وەلەسەری پێویست نیە كەزیە شۆڕ بووەكانی بسڕێت بەڵكو سوونەتە.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٦. دەستنوێژ هەڵگرتن بە ئاوی تێكەڵاو بە كلۆر، یان بە ئاوێكی شێلوو، گۆڕاو بە قوڕو رووەك، ئاساییەو زیانی نیە، چونكە خاوێنە لەسەر حاڵەتی خۆی ماوە.

«الشيخ إبن باز»

٢٧. چوونه پێش ئاو (ئاودەست) مەرج نیە بۆ هەر دەستنوێژێك:

چوونه پێش ئاو پێویسته له میزو پیسایی‌و پاشكۆكانی.... بەڵام جگه لەم هەڵوەشێنەرەوانەی دەستنوێژ، هەڵوەشێنەریتر وەكو با بەربوون ، یان دەست لێدانی عەورەت‌و، نوستن، ئەوە دەست بە ئاو گەیاندن پێویست نیه بەڵكو تەنها دەستنوێژ هەڵدەگرێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٨. دەربڕینی نیەت بۆ دەستنوێژ: شتێكی داهێنراوه (بیدعەیه)، چونكه هیچ شتێك پێمان نەگەیشتووه له پێغەمبەرەوه (ﷺ) ، یان له هاوەڵەكانی. نیەتیش شوێنەكەی دڵه، پێویست ناكات بڵێی " نیەتم هەیه دەستنوێژ هەڵدەگرم یان نوێژ دەكەم"

٢٩. بۆرژان دەستنوێژ ناشكێنێت:

بەڵكو نوستنێكی گران دەستنوێژ دەشكێنێت، نوستنێكی وەها ئاگات لەدەورو بەرت نەمێنێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٠. حوكمی ڕاخستنی بەرماڵ له شوێنێك، كه گومانت هەبێت له پاكییەكەی:

ئەگەر زەویەکە پیس بێت و ڕایەخێکی خاوێنت لەسەر ڕاخست، نوێژەکە لەسەری دروستەو تەواوە، چونکە نێوان خۆی و پیساییەکە بەربەستێکی خاوێن دانراوە.

«الشيخ إبن فوزان»

٢١. ئایا داپۆشینی عەورەت مەرجی تەواو بوونی دەستنوێژە.

دەستنوێژەکە تەواوو دروستە. داپۆشینی عەورەت مەرجی تەواو بوونی دەستنوێژ نیە.

«الشيخ إبن باز»

٢٢. ئایا شوشتنی مردوو دەستنوێژ دەشکێنێت: دەستنوێژ ناشکێنێت، بەڵام ئەگەر مردوو شۆر دەستی بە عەورەتی مردوو کەوت، ئەوە دەستنوێژی دەشکێنێت. وە نابێت مردوو شۆر دەست لە عەورەتی مردوو بدات، مەگەر لە دوای پەردە بێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٣. ئایا خەنە لەسەر نان دەستنوێژ دەشکێنێت:

نەخێر ناشکێنێت ئەگەر لێی تەواو بووبێت، وەهیچی لەسەر نیە، دەتوانێت سەری بسرێتەوە ئەگەر چی خەنەشی لەسەر بێت، ، یان سەری پێچرا بێت بە برین پێچ، یان بە شتێکیتر لە پێداویستیەکانی ئافرەت، لە پاکبوونەوەی گچکە (دەستنوێژ) جگە لە گەورە.

«الشيخ إبن باز»

٢٤. دەست لێدانی کەلو پەلی ئاودەستو کاشیەکانی گەرماو بە پێی پەتی، هەموو ئەوانە دەستنوێژ ناشکێنن.

«الشيخ إبن باز»

٢٥. حوکمی ئەو خواردنەی لە ناو ددانەکان دا هەیە، ئایا دەبێ لایبەری پیش دەستنوێژ.

پێویست نیە لایبەری پێش دەستنوێژ هەلگرتن، بەلاّم پێویستە بۆ مرۆڤـ کاتێك کە تەواو بوو لە خواردن، ددانەکانی خاوێن بکاتەوە لە شوێنەواری خواردنی بە جێماو، ئەوە تەواوترو چاکترو دوورترە لە نەخۆشیەکانی ددان.

«الشيخ إبن فوزان»

# (ئافرەتو خۆشوشتن)

## ❖ ٢٣ وەڵامی تێدایە.

١. کردنەوەی قژی ئافرەتی حەیزدار بۆ خۆشوشتن:

ڕای دروست ئەوەیە پێویست ناکات بیکاتەوە، بەڵام بۆ زیاتر دڵنیا بوونو ڕزگار بوونمان لە کێشەو گرفت (خلاف)، با قژی بکاتەوە.

**«اللجنة الدائمة»**

٢. ئافرەت ئەگەر جەنابەتی لەسەر بوو:

دروست نیەو نابێت تەنها دەرەوەی قژی بشوات، بەڵکو دەبێت ئاو بگاتە هەموو قژی هەتا پێستی.

**«الشيخ إبن عثيمين»**

٣. ئەگەر قژەکەی لوول دراوو کەزی بوو:

لەسەری پێویست نیە قژەکەی بکاتەوە، بەڵکو لەسەری پێویستە ئاو بگاتە هەموو قژی " بەوەی کەزیەکانی لە ژێر ئاو ڕابگرێ" پاشان بیکوشی، تا ئاو دەگاتە هەموو قژی.

**«الشيخ إبن عثيمين»**

٤. بالغ بوونی ئافرەت : ئەگەر ئافرەت بالغ بوو، خەونی بینی، دوای هەڵسانەوەی لە خەو هیچ شوێنەوارێکی ئاوی نەبینی، ئەوە خۆشوشتنی لەسەر پێویست نیە.

٥. بەڵام ئەگەر ئاوی بینی ئەوە دەبێت خۆی بشوات.

**«الشيخ إبن عثيمين»**

٦. ئەوەی پێشتر خەونی بالغ بوونی بینی بێت، ئەگەر ئاوی نەبینی بوو، ئەوە هیچی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر ئاوی بینی بوو، ئەوە دەبێت لێی بکۆڵێتەوە، بزانێت چەند نوێژی نەکردووە هەتا بیکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. هاتنە دەرەوەی مەنی بە ئارەزوو پەڕین و تام و چێژ: بەبێ جووت بوونیش خۆشوشتن پێویست دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٨. ئەگەر ئافرەتێك بینی پیاوێك لە گەڵی جووت دەبێت: ئەو ئافرەتە گوناهی لەسەر نیە، چونکە مرۆڤ بەرپرسیار نیە لە حاڵەتی نووستندا.

«اللجنة الدائمة»

٩. ئافرەتێك دەستی بباتە ناو عەورەتی ( کونی کۆ ئەندامی زاوزێی): بۆ خۆ خاوێن کردنەوە بێت، یان لێدانی مەرهەمێك بێت، یان بەهۆی بەکار هێنانی ئامێرێکی پشکنین بێت، خۆشوشتن پێویست ناکات، بەڵکو دەست نوێژ پێویست دەکات.

«اللجنة الدائمة»

١٠. ئەگەر ئافرەت گومانی هەبێت لەوەی جەنابەت بووە، خۆشوشتنی لەسەر نیە تەنها بەگومان، چونکە بنچینە (أصل)، جەنابەت نەبوون‌و خاوێنیە.

«اللجنة الدائمة»

١١. جەنابەت بوو دەخەوێت پێش دەستنوێژ: گوناهی لەسەر نیە، بەڵام چاکتر وایە دەستنوێژێك هەڵبگرێت پێش خەوتنی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) وای کردووەو فرمانی پێ کردووە:

«اللجنة الدائمة»

١٢. تێکهەڵکێش بوونی چەند خۆشوشتنێك : ئەوەی خۆشوشتنێك یان زیاتری لە سەر واجب بوو، ئەوە یەك خۆشوشتن لە جیاتی هەمووی بەسە، ئەگەر نیەتی هێنا بوو، هۆکارەکانی خۆشوشتنەکەی لەسەر خۆی لابدات.

«اللجنة الدائمة»

١٣. لەشی جەنابەتدار پاکە، دەکرێ پێش خۆشوشتنی دەست بداتە قاپ‌و مەنجەڵ‌و جل‌و بەرگ. وەئەو شتانەی جەنابەت بوو، دەستی لێدەدات پیسی ناکات. وە بۆ حەیزدارو نیفاسدار هەمان حوکم هەیە.

«اللجنة الدائمة»

## ❖ ئایا خۆشوشتن شوێنی دەستنوێژ دەگرێتەوە؟

١٤.ئەگەر خۆشۆشتنەکەی خۆشوشتنی جەنابەت بوو : خۆشۆر نیەتی وابوو خۆی پاك بکاتەوە لە بێ دەستنوێژی گەورەو گچکە ئەوە شوێنی دەگرێتەوە.

١٥. بەڵام ئەگەر خۆشوشتنەکەی جگە لەمە بوو: وەکو خۆشوشتنی جومعەو خۆ فێنك کردنەوەو پاكو خاوێنی، ئەو خۆشوشتنە شوێنی دەستنوێژ ناگرێتەوە، ئەگەر نیەتیشی ئاوا بێت، لەبەر نەگونجانیان لە گەڵ یەك ( خۆشوشتنەکە سوننەتەو دەستنوێژیش فەرزێکە لە فەرزەکانی نوێژ.

«الشيخ إبن باز»

١٦. جۆنیەتی خۆشوشتنی دروست لە جەنابەتو شتیتر.

- نیەتی هەبێت.
- ناوی خوا بێنێت.
- سێ جار دەستی خۆی بشوات.
- دامێنو عەورەتی خۆی بشوات لە شوێنەواری مەنی.
- دەستنوێژێکی تەواو هەڵبگرێت.
- دەست بە خۆشوشتن بکات بە شوشتنی سەری سێ جارو زیادەڕەوی لەشوشتنی هەموو قژی بکات، پاشان ئەندامەکانیتری لەشی بشوات.

- بەلای ڕاستەوە دەست پێدەکات پاشان چەپو، هەڵیدەکرێنێت.
- دەست بەسەر ئەو شوێنەی بتوانێت لەلەشی دابێنێت.

١٧. خۆشوشتن بە ڕەشاش دروستە، ئەگەر یەك جاریش هەموو لەشت تەڕ بکات بە ئاو.

«الشيخ إبن جبرين»

١٨. حوکمی خۆشوشتن بە هەموو جۆرەکانی شامپۆ، کە لە هێلکەو لیمۆو شتیتر پێك هاتووە.

بەکارهێنانیان ئاسایە بۆ سوودو بەرژەوەندی سەرت(وەکوئەوەی بۆ تیمارکردن بە کار بێت) ، وەهیچ لاریەك نیە لە بە کارهێنانی هێلکەو گەنمو شتیتر لە خواردەمەنیەکان بۆ تیمار کردن،وە شوشتنی ئەم جۆرە شتانە لە گەرماو ئاسایەو هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن باز»

١٩. دروستە ئافرەت خۆی بشوات لە جەنابەت، بەبێ کردنەوەی کەزیەکانی قژی؟

ئەگەر سێ جار جوان قژی بشوات و ئاوی پێ دابکات ئەوە بەسە، پێویست ناکات کەزیەکانی قژی بکاتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٢٠. کاتێك خۆم شۆشت لە جەنابەتو تەواو بووم، هەندێك مەنیم لێ دێتە دەرەوە، ئایا دووبارە خۆشوشتنم لەسەر واجبە؟

نەخێر، دووبارە کردنەوەی خۆشوشتنەکەت لەسەر پێویست نیە، لەبەر ئەوەی خۆشوشتنەکە بووە، ئەو مەنیەیەی کە هاتووتە دەرەوە هیچ نرخی نیە، چونکە بەبێ شەهوەت(لەززەت) هاتووتە دەرەوە. حوکمی وەکو حوکمی میزە، چوونە ئاوەدەستو دەستنوێژ پێویست دەکات.

٢١. یان ئەگەر ئەو مەنیەیەی کە هاتووتە دەرەوە بە هۆی دەست لێدانو ماچو شتیتر لە هۆیەکانی وورژاندنی لەززەت بێت، ئەو مەنیە مەنیەکی نوێیەو، دووبارە خۆشوشتن پێویست دەکاتەوە.

«الشیخ إبن باز»

٢٢. ئایا دروستە خۆشوشتنی حەیزو جەنابەت دوا بخرێت تا کاتی بەرەبەیان؟ ئەگەر ئافرەت پێش بەرەبەیان خاوێن ببێتەوە، ئەوە ڕۆژووی لەسەر پێویست دەبێت، وەلاری نیە لە دواخستنی خۆشوشتنەکەی تا کاتی بەرەبەیان.

بەلام بۆی نیە دوای بخات تا کاتی خۆرهەلاتن، بەلکو پێویستە لەسەری خۆی بشواتو نوێژ بکات پێش خۆر هەلاتن.

«الشیخ إبن باز»

٢٣ ئایا خاوەن قژی درێژی کەزی نەکراو بەراورد دەکرێ لە گەڵ خاوەن قژی کەزی کراو؟

لەسەر ئەو کەسە پێویستە کە جەنابەت بووە یان خوێنی حەیزی پچڕایە ، هەموو لەش و قژی تەڕ بکات بە ئاو بە نیەتی پاك بوونەوە(طهارة) ئەگەر قژی درێژ بێت یان کورت، یان ئەگەر قژی کەزیکراو بێت یان بێ کەزی بێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٤. مرۆڤ چ بڵێت لە کاتی خۆشوشتنی جەنابەت لەسەرەتای خۆشوشتن و کۆتایەکەی؟ لەسەرەتای خۆشوشتن دەڵێ "بسم الله " وە لە کۆتاییەکەی دەڵێ: " أشهد أن لا إلـة إلا الله وحده لا شريك لـة ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله ، اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين "

«الشيخ إبن فوزان»

# (سڕینەوە لەسەر جووتە خوف)

## ❖ ٧ وەڵامی تێدایە

١. شەوێك و ڕۆژێك بۆ جێگیر دروستە، وەسێ ڕۆژ بە شەوەکانی بۆ ڕێبوار.

٢. کاتی مەسح کردنەکە، لەسەرەتای لەبەر کردن دەست پێ دەکات.

٣. مەرجەکانی سڕینەوە لەسەر جووتە خوف:

دەبێ لە پێکراوەکە ڕێپێدراوو دروست بێت، پاك بێت، داپۆشەری شوێنی مەبەست بێت، توند بێت، لەسەر خاوێنی لەبەرت کردبێت.

٤. جۆنیەتی سڕینەوە لەسەر جووتە خوف:

دەستەکانی دەخاتە ناو ئاو،ڕووی دەرەوەی پێیەکانی دەسڕێتەوە لە پەنجەکانی تا قاچەکانی یەك جار بەبێ سڕینەوەی خوارەوەی پێ‌ی و پاژنەی.

٥. سڕینەوە لەسەر جووتە خوف، بەتاڵ دەبێتەوە بە یەکێك لەو چوار شتە:

➢ ئەگەر خوفە لە پێ کراوەکە داکەنرا.

- ئەگــەر خۆشوشــتنێکی لەســەر پێویــست بــوو، وەکــو خۆشوشتنی جەنابەت.
- ئەگەر کونێکی گەورە لە خوفە لە پێ کراوەکە پەیدا بوو.
- کاتێك ماوەی سڕینەوەکەی تەواو بوو.

٦. حوکمی سڕینەوە لەسەر جووتە گۆرەوی لە هاوین بەبێ عوزر:

کـۆی گـشتی فـەرموودە ڕاسـتو دروسـتەکانی سـڕینەوە لەسـەر خوفو گۆرەوی، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سـڕینەوە دروسـتە لـە هاوینو زستان.

بەڵام بۆی نیە لەسەر کۆرەوی تەنكو هاوشێوەکانی مەسح بکـات، مەگەر بەو مەرجانەی کە شەرع ڕەچاوی کردوە.

«الشيخ إبن باز»

٧. حوکمی سڕینەوە لەسەر گۆرەوی تەنك یان کون؟

لــە مەرجــەکانی ســڕینەوە لەســەر گــۆرەوی، دەبــێ ئەســتووررو داپۆشــراو بێــت. ئەگــەر تــەنك بێــت، نابێـت سـڕینەوەی لەسـەر بکرێت.

«الشيخ إبن باز»

# (ئافرەتو حەیز)

❖ (٦٦) وەڵامی تێدایە.

١. پێناسەی حەیز: خوێنێکی ئاسایە، ڕەحمی ئافرەت دەریدەدات لە چەند کاتێکی دیاریکراو.

«الشيخ إبن جبرين»

٢. کاتی حەیز : ڕای پەسند کراو ئەوەیە، ماوەیەکی دیاریکراوی نیە بۆ کەمیو زۆریەکەی.

«الشيخ إبن عثيمين»

بەڵام ڕای تریش هەیە: پێش تەمەنی نۆ ساڵی خوێنەکەی خوێنی حەیز نیە، چونکە ئافرەت پێش ئەو ماوە ناکرێ دوو گیانو سك پڕ بێت، بەڵام ئەگەر گەیشتە نۆ ساڵو خوێنی بینی، ئەوە خوێنەکە خوێنی حەیزە، ئەگەرچی کەم روودەدات بەو شێوە بێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٣. یاسا : هەر کاتێك حەیز هەبوو حوکمەکانی هەیە، وەهەر کاتێك پاك ببێتەوە حوکمەکانی حەیز نامێنێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤. تێکەڵ بوونی جۆری خوێن، دوای تەمەنی پەنجاساڵی بە خوێنی حەیز دانانرێت، بەڵکو دەچێتە ژێر حوکمی خوێنی پیس (خوێنچرکە). بۆی هەیە نوێژ بکاتو ڕۆژوو بکرێت.

«الشيخ إبن باز»

-جۆنیەتی خوێنی حەیز :

- بۆنەکەی گەنیوە.
- ڕەنگەکەی ڕەشە.
- ئەستورەو تەنك نیە. «الشيخ إبن عثيمين»

٥. حوکمی ئەو کەسەی سەرەتا حەیزدار دەبێت : ئەگەر خوێنەکە لە کاتێك هات کاتی حەیز بوو، ئەوە ئافرەتەکە، چاوەروان دەکاتو ڕادەوەستێت هەتاکو دەپچڕێت، چونکە هەموو ئەو خوێنەی لەو ماوەدا هاتووە خوێنی حەیزە، وەپێویست بەوە ناکات چاوەڕوان بێت هەتاکو دووبارە دەبێتەوە. «الشيخ محمد بن إبراهيم»

٦. ئەگەر ئافرەتەکە لە خوێنەکە بە گومان بوو:

بە شێوەیەکی گشتی ئەو خوێنەی لەکۆ ئەندامی زاوزێی ئافرەت دەردەچێت، ئەوە خوێنی حەیزە هەتا بۆی دەرنەکەوێت، کە خوێنەکە خوێنی خوێنچرکەیە (الاستحاضة)

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. تێکەڵ بوونی جۆری خوێن لە حەیزدا : پاك بوونەوە ئەگەر کەمتر بێت لە ڕۆژێك، ئەوە بە پاك بوونەوە دانانرێت، چونکە خوێن دێتو دەپچڕێت. تەنها بە پچڕانی خوێن، پاك بوونەوە ڕوونادات، هەروەك چۆن ئەگەر پچرابێت کەمتر لە کاتژمێرێك.

«اللجنة الدائمة»

٨. هەندێك جار خوێن دێتە خوارەوە دوای خۆشوشتن لە حەیز.

ئەگەر ئەو خوێنەی دوای خۆ پاککردنەوە دێتە خوارەوە، زەردە خوێن یان لێڵ بێت ئەوە بە هیچ دانانرێت.بەڵکو حوکمی وەکو حوکمی میزە .

– بەڵام ئەگەر خوێنەکە خوێنێکی دیارو ئاشکرا بوو، ئەوە بە حەیز دادەنرێت، پێویست دەکات دووبارە خۆی بشواتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٩. نیشانەی خاوێن بوونەوە: لەزۆرینەی ئافرەتان ئاوە سپیەکەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٠. هەندێك لە ئافرەتان نە زەردە خوێن، نە ئاوە سپیەکە دەبینێ، بەڵکو ووشك دەبێتەوە هەتا حەیزێکی تر، وەهەر ئافرەتێكو حوکمێکی خۆی هەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١١. مانای بێ ئومێد بوون : چ کاتێك حەیز لە ئافرەت پچرا بەشێویەك کە هیچیتر نەگەڕێتەوەو، حەیزدار نەبێتەوە ئەوە بێ ئومێد بوونە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢. جووت بوون لە گەڵ حەیزدار دوای پاکبوونەوەی، پێش خۆشوشتنی، دروست نیە.

«اللجنة الدائمة»

١٣. حەیزدارو دەست لێدانی ئەم کتێبانەی کە ئایەتی تێدایە : لەسەر حەیزدارو، جەنابەت بوو، بێ دەستنوێژیش قەدەغە نیە چونکە بەقورئان دانانرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٤. حەیزدارو لێنانی خەنە : دەکرێو دروستە خەنە لە دەستو سەرو پێی بدات، چونکە ئاسایە هیچی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٥. خواردنی ئەو حەبانەی کە حەیزداری دەکات : بۆی دروستە، ئەگەر پزیشك بڕیاڕی داو هیچ زیانێك بە ئافرەتەکە نەگەیەنێت.

«اللجنة الدائمة»

١٦. زیانەکانی بەکار هێنانی حەبی نەهاتنی حەیز.

- بریندار بوونی منداڵ دانی.

- دەبێتە هۆی تێکچوونی شێوەی کۆرپەڵە لە دوا ڕۆژدا.

- دەبێتە هۆی نەزۆکی بۆ ئەو ئافرەتانەی کە شوویان نەکردووە.

١٧. بە کار هێنانی حەبی نەهاتنی حەیز لە مانگی رەمەزان و حەج.

هیچ گوناهی لەسەر نیە، بە مەرجێك هیچ زیانێکی تەندروستی نەبێت. «اللجنة الدائمة»

١٨. ئەو حەیزەی کە دروست دەبێت لە ئەنجامی خواردنی حەب.

دەبێت پرسیار لە پزیشك بکات، ئەگەر وتی ئەو خوێنە خوێنی حەیزە، ئەوە حەیزە، وەئەگەر وتی ئەوە چەند لیکاو گوشراوێکە بە هۆی حەبەکان پەیدا بووە، ئەوە حەیز نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٩. ئەگەر حەبەکان بوونە هۆی هاتنە خوارەوەی خوێنی حەیزو خوێنەکەی بۆ هات، ئەوە نابێت نوێژ بکات، چونکە حەیز، ئەگەر خوێنەکەی هەبوو، حوکمەکەی هەیە، هەروەك چۆن، ئەگەر حەبی نە هاتنی حەیزی خواردو خوێنی حەیزی پچڕا، ئەوە نوێژو ڕۆژووی خۆی دەکاتو ڕۆژووەکانیش ناگێڕێتەوە، چونکە حەیزدار نەبووە، چونکە حەیز حوکمەکەی لە گەڵ هۆیەکەی دەسوڕێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٠. دەکرێ حەیزدار: وێردە شەرعیەکان وەکو ( سبحان الله، الله أکبر)، وە وێردەکانی ئێوارەو بەیانییان‌و وێردەکانی نوستن‌و هەڵسانەوە بڵێت، وە کتێبی زانستی فیقهی‌و فەرموودەو تەفسیر شتی‌تریش بخوێنێتەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

٢١. ئەو خوێنەی کە لە ئەنجامی کردارێکی پزیشکی پەیدا دەبێت: حوکمەکەی حوکمی خوێنی حەیز نیە، گەڕاندەوەی حوکمی ئەو خوێنە بۆ پزیشکەکانە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٢. ئامۆژگاری پزیشکی بۆ حەیزدارەکان.

- پێویستە لەسەری هەتاکو پێی دەکرێ دەست بە هێمن‌و ئارامی لەسەرخۆیی بگرێت.

- ژەمە خواردنی سوک‌و،ئاسان هەرەس بوو بخوات.

- نزیك زگ شێلان نەبێتەوە.

- نزیك جووت بوون مەکەوە ( لەڕووی شەرعەوەش قەدەغە کراوە)

- بایەخ دان بە شوشتنی ئەندامە ناوەکیەکان ( ئەویش لە پێشەوە بۆ دواوە نەك بە پێچەوانە).

- نزيك دەرمانی پزيشكی مەكەوە، مەگەر لە چوار چێوەی تەسك نەبێت، وەئاگەداری بەكار هێنانی هێور كەرەوەكان ببە، وەكو (الأسبرين)

- بايەخ و گرنگی دان بەدەم و ددان بە تايبەتی.

٢٣. بەكارهێنانی ئەو شتەی كە حەيز دەپچڕێنێت لە لايەن ئافرەتانەوە: دروستە بە دوو مەرج :

١. ترسی زيان گەياندنی بەخۆی نەبێت.

٢. دەبێت بەرێپێدانی پياوەكەی بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٤. بەكار هێنانی ئەو شتەی كە حەيز دەپچڕێنێت لە لايەن ئافرەتەوە بەدوو مەرج دروستە:

- مەبەستی فێڵ نەبێت، بەوەی كە فەرزێك لەسەر خۆی لابدات، وەكو ئەوەی پێش ڕەمەزان بەكاری بێنێت بۆ ئەوەی رەمەزان بە ڕۆژوو نەبێت يان نوێژ لە سەر خۆی لابدات يان شتیتر.

- دەبێت بە رێپێدانی پياوەكەی بێت: چونكە بە حەيزدابوونی ئافرەتەكەی، ڕابواردن لە گەڵی قەدەغە دەبێت، وەئەگەر ئافرەتەكە تەڵاق دراو بێت، ئەوە پێش خستنی كەوتنی مافی پياوەكەی تێدايە، لە گەڕاندنەوەی ئافرەتەكەی ئەگەر گەڕانەوەی هەبێت. «الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ حوكمە پەیوەستەکان لەسەر حەیزدار.

٢٥. نوێـژ: لەسـەر حـەیزدار نوێـژی فـەرزو سـوننەت قەدەغەیـەو، دروست نیە،وە نابێت بیان گێڕێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٦. ڕۆژوو: لەسەر حەیزدار ڕۆژووی فـەرزو سـوننەت، قەدەغەیـە، بەڵام دەبێت ڕۆژووی فەرز بگێڕێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٧. تـەواف بـەیت: تـەوافی فـەرزو سـوننەت لەسـەری قەدەغەیـەو دروسـت نیـە، بـەڵام کردەوەکـانیتر وەکـو سـەعی کـردن لـە نێـوان سـەفاو مـەروە، ڕاوەسـتانو خـەوتن لـە موزدەلیفـەو مەناسیکەکانیتر لەسەری قەدەغە نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٨. لا چـوونی مـافی تـەوافی ماڵئـاوایی لـە ئەسـتۆی: ئەگـەر ئافرەتەکـە مەناسـیکەکانی حـەجی تـەواو کردبێـت، پاشـان حەیزدار بووبێت، پێش چوونە دەرەوەی بۆ وولاتەکەی، ئەوە بەبێ تەوافی ماڵئاوایی دەردەچێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٩. مانەوە لە مزگەوت: لەسەر حەیزدار قەدەغەیە لە مزگەوت بمینێتەوە، هەتاکو نوێژی جەژن.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٠. جووت بوون: قەدەغەیە لەسەر پیاوەکەی لە گەڵی جووت بێت، یان ئافرەتەکە خۆی بۆ پیاوەکەی مل کەچ بکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣١. تەڵاق :لەسەر پیاو قەدەغەیە ئافرەتی حەیزدار تەڵاق بدات، کاتێك لە حەیزە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٢. حوکم دان لەسەر (براءة الرحم): واتە ڕەحمەکەی بەتاڵ بێت لەمنداڵ.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٣. حوکمی واجب بوونی خۆشوشتن: واجبە لەسەر حەیزدار کاتێك پاك دەبێتەوە هەموو لاشەی خۆی بشوات.

«الشيخ إبن عثيمين»

❖ حاڵەتی گۆڕانی لە ناکاو لە حەیز چەند جۆرێکە:

٣٤. زیاد بوون و کەم بوون: وەکو ئەوەی سوڕی (عادة) ئافرەتەکە شەش ڕۆژە بەردەوام دەبێت بۆ حەوتەم ڕۆژ، یان حەوت ڕۆژە بە شەشەم ڕۆژ پاك دەبێتەوە.

ڕای دروست‌و ڕاست ئه‌وه‌یه‌، چ كاتێك خوێنی بینی ئه‌وه حه‌یزداره‌، وه‌چ كاتێك پاكژ بووبێته‌وه لێی، ئه‌وه پاكبوونه‌وه‌یه‌، جا چ له سوڕی (عاده‌ی) خۆی زیاتر بێت یان كه‌متر بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٥. به پێش كه‌وتن یان دوا كه‌وتن: وه‌كو ئه‌وه‌ی سوڕه‌كه‌ی له كۆتایی مانگ بێت له سه‌ره‌تای مانگ خوێنی حه‌یز ببینێت، یان سوڕه‌كه‌ی له‌سه‌ره‌تای مانگ بێت له كۆتاییه‌كه‌ی خوێن ببینێت.

ڕای ڕاست‌و دروستر ئه‌وه‌یه چ كاتێك خوێنی بینی ئه‌وه حه‌یزداره‌، وه‌چ كاتێك لێی پاك بووبێته‌وه ئه‌وه پاكژه‌، جا چ پێش كه‌وتبێت یان دوا كه‌وتبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٦. زه‌رده خوێن‌و خوێنی لێڵ: به شێوه‌یه‌ك ئه‌گه‌ر خوێنه‌كه‌ی به‌زه‌رد ببینێت، وه‌كو ئاوی برین ، یان به لێڵ له نێوان زه‌ردو ڕه‌ش، ئه‌گه‌ر ئه‌و حاڵه‌ته ئه‌گه‌ر له كاتی ماوه‌ی حه‌یزه‌كه بێت، یان به‌ماوه‌ی حه‌یزه‌كه لكا بێت، پێش خۆخاوێن كردنه‌وه "ئه‌وه حه‌یزه" حوكمه‌كانی حه‌یزی بۆ جێگیر ده‌بێت، به‌ڵام ئه‌گه‌ر دوای پاك بوونه‌وه بێت، ئه‌وه حه‌یز نیه.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٧. پچڕ پچڕ بوون لە کاتی حەیز: بەشێوەیەك ڕۆژێك خوێن دەبینێت، ڕۆژێك پاك دەبێتەوە، ئیتر بەم شێوە، ئەوە دوو حاڵەتە:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر ئەو حاڵەتە لە گەڵ ئافرەتەکە بەردەوام بێت لە هەموو کاتەکانی، ئەوە ئەو خوێنە، خوێنی خوێنچرکەیە (الأستحاضة) بۆ ئەو کەسەی دەیبینێت، حوکمەکانی خوێنچڕکەی بۆ جێگیر دەبێتو جێ بەجێی دەکات.

«الشیخ إبن عثیمین»

حاڵەتی دووەم: لە گەڵ ئافرەتەکە بەردەوام نەبێت، هەندێك جار تووشی دەبێت،وە ئافرەتەکە کاتێکی دیاری کراوی هەبێت بۆ پاك بوونەوەکەی.

ڕای ڕاستو دروستر ئەوەیە: هەر کاتێك خوێنەکەی پچڕا کەمتر لە ڕۆژێك، ئەوە پاك بوونەوە نیە، مەگەر شتێك ببینێت بەڵگە بێت لەسەر پاك بوونەوەکەی، وەکو ئەوەی پچڕانەکەی لە کۆتایی سوڕەکەی (عادەکەی) بێت یان خوێنە سپیەکە ببینێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

٣٨. ووشك بوون لە خوێن: بەشێوەیەك ئەگەر ئافرەتەکە تەنها تەڕییەك ببینێت، ئەوە ئەگەر لە نێوان ماوەی حەیزەکەی بێت یان پێوەی لکا بێت پێش خۆشوشتن، ئەوە حەیزە، بەڵام ئەگەر دوای خۆشوشتنو پاك بوونەوە بوو، ئەوە حەیز نیە.

چـونکه ئـەم حاڵەتـە وەکـو زەردەخـوێن‌و خـوێنی لێـڵ دادەنرێت، وەئەوەش حوکمەکەیەتی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٩. ئـەو کەسـەی خـوێنی حـەیزی لێ پـچڕا بێـت: لـەو کاتـەی کـە هـەموو جـار دەپـچڕا، دوای سـوڕی خـۆی، پاشـان لەبـەر ئەنجامدانی ئیشێك یان کارەساتێکی لـە ناکاو خـوێنی بـۆ گەڕاوە، ئەو خوێنە خوێنی حەیز نیە، بەڵکو خوێنێکی پیسە، بە هۆیەوە قەدەغە ناکرێت لە نوێژو ڕۆژوو.

«الشيخ إبن باز»

٤٠. پەڵە خوێن: ئـەوەی پەڵـە خـوێن ببینـێ لـە کـاتی ڕۆژەکـانی سـوڕی مانگانـەی نـەبێت، ئـەوە لـە نوێـژو ڕۆژووەکـەی دەستبەردار نابێت چونکە ئەو خوێنە خوێنی پیسە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤١. چـوونە ژوورەوەی حـەیزدار بـۆ ئـەو شـوێنەی بـە مزگـەوت لکاوە، دروست نیە. ئەگەر مزگەوتەکـە بریتـی بـوو لـە چـەند نهۆمێـك، وەدانیـشتووی نهۆمـەکانی خـوارەوەو سـەرەوە گوێبیـستی دەنگـی بـانگ دەبـوون، ئـەوە نوێـژی هـەموویان دروستە، چونکە ئەو نهۆمانە بۆ مزگەوت دەگەڕێتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٤٢. بەکار هێنانی ئافرەت بۆ ئەو شتانەی کـە خـوێن دەپـچڕێنێت لـە ڕۆژەکـانی حـەیزو نیفاسـی لـە حـەب یـان دەرزی کـە بـە

هۆیانەوە خوێنەکەی دەپچڕێت و خۆی دەشوات و پاك دەکاتەوە، ئەوە ئەو ئیش و خواپەرستیانە ئەنجام دەدات، وەکو سەرجەم ژنە پاکژەکان، وەنوێژو ڕۆژووی دروستە.

«الشیخ إبن باز»

٤٣. پێش خولی مانگانە بە پێنج ڕۆژ شتێکی قاوەیی لێی دەردەچێت، ئایا لە نوێژو ڕۆژوو بەردەوام ببێت لەم کاتە؟

ئەگەر ئەو چەند ڕۆژە جیا بێت پەیوەندی بە خوێنی حەیز نەبێت، ئەوە حەیز نیە. بەڵام ئەگەر ئەو پێنج ڕۆژە دوابەدوای ڕۆژەکانی حەیز بێت، ئەوە حەیزەو بە سوڕی مانگانەی حەیزی دادەنرێت.

«الشیخ إبن باز»

## ❖ هۆیەکانی گۆڕانی سوڕی مانگانە لە لای ئافرەتان:

٤٤. بەکارهێنانی ئەو حەب و دەرمانانەی کە حەیز قەدەغە دەکات، ئەو حەبانە کاریگەری لەسەر سوڕی مانگانەی ئافرەت هەیە پێشی دەخات یان دوای دەخات یان زۆرو کەمی دەکات.

٤٥. پێچ پێچۆکە ( اللولب): مەبەست لێی ئەو شتەیە کە بە کار دێت بۆ قەدەغە کردنی سکپڕی (ئاوس) بوون، ئەو پێچ پێچۆکە کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر سوڕی مانگانەی ئافرەت،

بە شێوەیەك خوێنەكەی كەم دێتە دەرەوە، بەڵام ماوەی حەیزەكەی زیاد دەكات، لەجیاتی حەوت ڕۆژ ، دە ڕۆژ حەیزدار دەبێت. بەهۆی كەم هاتنە دەرەوەی خوێن.

«الشيخ إبن جبرين»

٤٨. خوێنێك بۆم دێت بەسێ ڕۆژ پێش سوڕی مانگانەی ئایا حوكمەكەی چیە؟

ئەگەر ئافرەتەكە سوڕ مانگانەی خۆی بزانێت ( بە ژمارە یان بە ڕەنگ یان بە ماوە) ، ئەوە نوێژەكەی لێ دەگەڕێت لە كاتی سوڕەكەی، پاشان خۆی دەشوات، نوێژی خۆی دەكات، ئەو خوێنەی پێش سوڕی مانگانە پەیدا دەبێت، ئەوە بە خوێنی پیس دادەنرێت، لەبەر ئەو خوێنە واز لە نوێژو ڕۆژوو ناهێنێت. بەڵكو لەسەری پێویستە هەموو كاتێك خوێنەكە بشوات‌و خۆی بپارێزێت‌و دەست نوێژ بشوات بۆ هەر نوێژێك؛ وەكو خوێنی خوێنچركە( الأستحاضة) دادەنرێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٤٩. لە ڕۆژەكانی سوڕی مانگانە دوو ڕۆژ خوێنی حەیزم بۆ پەیدا دەبێت پاشان دەپچڕێت‌و ڕۆژی چوارەم پەیدا دەبێتەوە، جا چ بكەم لە ڕۆژی سێیەم لە ڕۆژەكانی سوڕی مانگانە؟

لەبەر ئەوەی ئافرەتەکە دەزانێت لە ڕۆژەکانی سوڕی مانگانەی خۆیەتی، ئەوە نوێژو ڕۆژووی لەسەر نامێنێت لە ناوەندی سوڕی مانگانەی ئەگەر چی خوێنەکەشی ببچڕێت چەند ڕۆژێك لە کاتی ڕۆژەکانی سوڕی مانگانەی، لەبەر ئەوەی هەر لە کاتی سوڕی مانگانەکەیەتی هەتاکو نیشانەیەکی پاکبوونەوەی خۆی نەبینێت، وەکو خوێنە سپیەکە.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٠. جیاوازی نێوان جەنابەتدارو حەیزدارو نیفاسدار

ناکرێو نابێت حەیزدارو نیفاسدار لە گەڵ جەنابەتدار بەراورد بکرێت، چونکە ماوەکەیان زیاترە، بە پێچەوانەی جەنابەتدار ماوەکەی کورتەو، دەتوانێت هەر ئەو کاتە خۆی بشوات، کە لەو شتە تەواو دەبێت کە پێی جەنابەت بووە.

«الشيخ إبن باز»

٥١. خوێنی کەم لە کاتی سوڕی مانگانەو لە کاتیتر جگە لە سوڕی مانگانە.

ئەگەر ئەو پەڵە خوێنانە لە کاتی سوڕی مانگانە بوو، ئافرەتەکە بەو حەیزەی دانا کە دەیناسێت ئەوە حەیزە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٢. هاتنی خوێنو پچڕانی لە هەمان مانگ.

حەیز چ کاتێك هات ئەوە حەیزە، جا جیاوازی نیە، چ ماوەکە لە نێوان ئەو حەیزەو حەیزەکەیتر درێژو زۆر بێت یان کورت بێت.
ئەگەر حەیزدار بوو بێت و پاك بوو بێتەوە، پاشان دوای پێنج یان شەش ڕۆژ دووبارە سورەکەی گەڕایەوە، ئەوە دادەنیشێت نوێژو ڕۆژوو ناکات چونکە حەیزدارە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٣. درێژ بوونی ماوەکەو گۆڕانی ڕەنگەکەی:
ئەگەر ئافرەت پاکژ بوو بێت پاشان ئەم خوێنە نەناسراوەی بینی کە دەزانێ خوێنی حەیز نیە، بەڵکو " زەردە خوێنە یان خوێنی لێڵە یان ڕەشە"، ئەوە بە حەیز دانانرێت نوێژو ڕۆژوو بۆ خۆی دەکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٤. دوای دوو ڕۆژ لە ڕۆژەکانی سوڕی مانگانەی پاکژبوو بێت و خۆی شوشبێت، پاشان تووشی خوێن بوو بێتەوە دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ.
ئەو دوو ڕۆژەی کە خوێنی تێدا بینیوە کاتی حەیزیەتی، دادەنیشێت و نوێژی تێدا دروست نیە. بەڵام ئەو دوو ڕۆژەی کە تێدا پاکبوویتەوە، نوێژی خۆی تێدا دەکات دوای خۆشوشتنی.

«اللجنة الدائمة»

٥٥. ئافرەتێـك سـەرەتای هـەموو مانگێـك شـەش ڕۆژ حـەیزدار دەبوو، پاشان خوێنەكە لە گەڵی بەردەوام دەبوو حوكمەكەی چی‌یە ؟

شەش ڕۆژ دادەنیشێت سەرەتای هەموو مانگێكو حوكمی حـەیزی بـۆ جـێگیر دەبێـت. وە ڕۆژەكـانی‌تر خوێنـچڕكەی (الأستحاضـة) هەیە، خۆی دەشواتو نوێژی خۆی دەكاتو گوێ بە خوێن نادات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٦. ئافرەتێك خـوێنی بـۆ پەیدا بـوو، وازی لـە نوێـژ هێنـا، دوای چەند ڕۆژێك سوڕی ڕاستەقینەی مانگانەی بۆ هات.

چاكتر وایە ئەو نوێژانەی لە ڕۆژە یەكەمـەكان وازی لـێ هێنـا بـوو، بیانگێڕێتەوە، وەئەگەر نەیانگێڕێتەوە هیچی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٧. ئافرەتێك نەشتەرگەریەكی كرد دوای نەشـتەرگەریەكەو پـێش سـوڕی مانگانـەی خـۆی خـوێنێكی ڕەش هاتـە خـوارەوە پاشـان تووشی سوڕی مانگانەی خۆی بوو.

ئەو خوێنەی لە ئەنجامی نەشتەریەكەی پەیـدا دەبـێ حوكمەكـەی حوكمی حەیز نیە، گەڕانەوەی حوكمی ئەو خوێنە لەم حاڵەتـە بـۆ پزیشكەكانە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٨. ئافرەتێك لەبەر بە ساڵا چوونی تەمەنی، خوێنی لێ پچرا بێت، وە لە کاتی هەڵسانی بە گەشتێك خوێنی بۆ هاتو لە گەڵی بەردەوام بوو.

ئەوەی دیار بێت ئەو خوێنە، خوێنی حەیز نیە، لەو کاتەی تووشی ئەو خوێنە دەبێت بۆی هەیە نوێژو ڕۆژوو بکات. چونکە زۆربەی زاناکان ماوەی (٥٠) ساڵیان بۆ کۆتایی هاتنی حەیزی ئافرەتان دیار دەکەن.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٩. ئافرەتێك بۆ ماوەی نۆ یان دە ڕۆژ سوڕی مانگانەی بۆ دێت، پاشان خۆی دەشواتو پاك دەبێتەوە دوای ئەوە، لە ماوەی جیا جیا بۆی دێت.

ئەوەی دوای سوڕی مانگانەی خوێنی بینیوە لەبەر هەڵسانی بە کارێك یان کارەساتێکی لە ناکاو، ئەوە خوێنی حەیز نیە بەڵکو ئەوە هەموو خوێنی پیسە،لە نوێژو ڕۆژوو قەدەغەی ناکات.

«اللجنة الدائمة»

٦٠. چاکتر وایە بۆ حەیزدار:

لەسەر سروشتی خۆی بمێنێت، ڕازی بێت بەوەی خوا بۆی داناوە، شتێکی وەها بەکار نەهێنێت کە خوێن لە خۆی قەدەغە بکات.

٦١. ئەگەر ئافرەت لە كاتی سوڕی مانگانەی ڕۆژێك خوێنی بینی، ڕۆژێكی دواتر بەدرێژایی ڕۆژ خوێنی نەبینێت، چی بكات باشە؟

ئەوەی دیار بێت ئەو پاكبوونەوەو ووشكەتیەی كە بۆی هاتووە لە ڕۆژەكانی حەیزی، هەر بۆ حەیز دەگەڕێتەوە، بە پاك بوونەوەی تەواو دانانرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٢. لە ئەنجامی خواردنی چەند حەبێكی دژی سك پڕبوون خوێنێكی لێڵی لێهات كە حەیزەكەی لێ تێكدا ، پرسیار لە پزیشك بكەن ئەگەر ووتی ئەم خوێنە حەیزە ئەوە حەیزە ، وەئەگەر ووتی ئەوە چەند ئاوگێكە (لیكاو) بەهۆی حەبەكان پەیدا بووە ئەوە حەیز نیە، ئەوە وەڵامی ئێستا منە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٣. ئایا ئافرەت پاك دەبێتەوە ئەگەر خوێنی نەبینێت؟

ئەگەر دابو نەریتی وا بوو خوێنە سپیەكە نەبینێت هەروەك چۆن لای هەندێك ئافرەت وایە، ئەوە پاكژ دەبێتەوە، وەڕۆژووی خۆی دەگرێت . بەڵام ئەگەر دابو نەریتی وابێت خوێنە سپیەكە ببینێت بۆ پاكبوونەوە، ئەوە ڕۆژوو ناگرێت هەتاكو خوێنە سپیەكە دەبینێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٤. سوڕی مانگانەم لە نێوان حەوت هەتا هەشت ڕۆژە، هەندێك جار لە ڕۆژی حەوتەم نە خوێن نە پاکبوونەوە دەبینم، چی بکەم؟

پەلە مەکە هەتاکو ئەو خوێنە سپییە دەبینی کە ئافرەتان دەیناسنەوە، ئەو خوێنە نیشانەی پاکبوونەوەیە. تەنها ڕاوەستانی خوێن پاکبوونەوە نیە، بەڵکو پاکبوونەوە بە بینینی نیشانەکانی پاکژبوونەوەیەو، بە کۆتایی هاتنی ماوەی ئاسایی حەیزە.

«الشيخ إبن جبرين»

٦٥. ئەگەر ئافرەتێك حەبی دژە حەیز یان پێچ پێچوکەی (اللولب) بەکار هێناو خوێنی حەیزی درێژتر بووبێت لە کاتی دیاری کراوی خۆی، حوکمەکی چییە، ئایا لەسەر سوڕی مانگانەکەی بڕوات یان چی بکات؟

دەڵێن لەبەر ئەوەی خوێنەکە خوێنی حەیزە، ئافرەتەکە واز لە نوێژ دێنێت، ئەگەر چی ماوەکە لە ماوەی عادەتی درێژتر بووبێت، بەڵام ئەگەر جگە لەوە بێت، ئەوە بە خوێنی حەیز دانانرێت.

«اللجنة الدائمة»

– هەندێك لە زانایەکان دەڵێن: ماوەکە درێژتر نا بێت لە عادەتی یەکەمی، ئەگەر سوڕی مانگانەی یەکەمی حەوت ڕۆژ بووبێتو،

سیٚ ڕۆژ درێژی کردبێت، دەڵێن: ڕۆژەکانی حەیزی لە حەوت ڕۆژ زیاتر نا بێت، چونکە ئەو زیاد بوونە ڕووی نەدەدا مەگەر بە هۆیەك کە خۆی کردوویەتی، بۆیە واز لە نوێژ ناهێنێت بە هۆی ئەو شتە، ئەوەش بۆ زیاتر دڵنیا بوونە.

«الشيخ إبن جبرين»

٦٦. دوا کەوتنی حەیز بە هۆی حەب بەکار هێنان.

بێ گومان نوێژی خۆی دەکات کاتێك حەیزەکەی دوا دەکەوێت، ئەگەر چی دوا کەوتنەکە دوو مانگیش بێت.

«الشيخ إبن جبرين»

# ئافرەتو خوێنچڕکە

## (الإستحاضة)

❖ ٨ وەڵامی تێدایە.

١. پێناسەی خوێنچڕکە (الأستحاضة):

هەبوونی خوێنە بە بەردەوامی لە لای ئافرەت، بە شێوەیەك کە نە پچڕێت. یان ماوەیەکی کورت لێی دەپچڕێت وەکو ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢. حوکمەکانی خوێنچڕکە وەکو پاکبوونەوەیە مەگەر لە دوو شت نەبێت:-

- دەستنوێژ لەسەری پێویست دەبێت بۆ هەر نوێژێك کە کاتەکەی دادێت، بەڵام ئەگەر نوێژەکە کاتی دیاری کراوی نەبوو، ئەوە هەر کاتێك کە ویستی بیکات، دەستنوێژی بۆ دەشوات.
- کاتێك کە دەیەوێت دەستنوێژ هەڵبگرێت، ئەوە شوێنەواری خوێنەکە دەشواتو پارچە پەمۆییێك لەسەر کۆ ئەندامی زاوزێدا دادەنێت، بۆ ئەوەی خوێنەکە خۆی بگرێت، دوای ئەوە چ هاتە دەرەوە زیانی نیە.

٣. ئەوەی لە حاڵەتی خوێنچرکە گوماناوی بوو.

لەوانەیە ڕوداوێك ڕوبدات بە هۆیەوە ئافرەت تووشی خوێن بەربوون بێت لە كۆئەندامی زاوزێی، وەكو كردنی نەشتەرگەریەك لە ڕەحمی، یان لە شوێنێكیتر، ئەوەش دوو جۆرە:-

- ئافرەتەكە بزانێت نابێت حەیزدار بێت دوای نەشتەرگەریەكە، وەكو ئەوەی نەشتەرگەریەكەی ڕەحم دەرهێنان بێت لە ڕەگو ریشاڵەوە، یان داخستنی بێت بە شێوەیەك هیچ خوێن ایێی نەیەتە دەرەوە، ئەو ئافرەتە حوكمەكانی خوێنچڕكەی بۆ جێگیر نابێت، بەڵكو حوكمەكەی حوكمی ئەو كەسەیە كە زەردە خوێن، یان خوێنی لێل، یان تەڕایەتی دوای پاك بوونەوە دەبینێت، بە هۆیەوە نابێت واز لە نوێژو ڕۆژوو بێنێت، جووت بوون لە گەڵی قەدەغە ناكرێت. وە خۆشوشتن لەم جۆرە خوێنە پێویست نیە، بەڵام لە سەری پێویستەو دەبێت كاتی نوێژەكان خوێنەكە بشوات و پارچە پەڕۆكێك یان شتیتر لەسەر كۆ ئەندامی زاوزێ دابنێت و دەستنوێژ بشوات كە كاتی نوێژ دادێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

- نەزانێت كە حەیزەكەی دەپچڕێت دوای نەشتەرگەریەكە بەڵكو لەوانەیە حەیزدار بێت. ئەوە حوكمەكەی وەكو حوكمی خوێنچڕكەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤. خۆشوشتن پێویست نیە لەسەر خاوەن خوێنچڕکە بۆ هیچ نوێژێك مەگەر یەك جار ئەویش کاتی پچرانی حەیزەکەی.

«الشيخ إبن جبرين»

٥. جووت بوون لە گەڵ خاوەن خوێنچڕکە دروستە.

٦. ئەگەر خوێنەکە نەدەپچڕا مەگەر بە کەمی نەبێت ئەوە تووشی خوێنچڕکە بووە، دروست نیە دابنیشێت ( نوێژوو ڕۆژوو نەکات) مەگەر کاتی سوڕی مانگانەی نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. حەبی قەدەغەی سوڕی مانگانەی خوارد لەبەر خاتری حەج، وەدوای حەج بۆ ماوەیەکی درێژ تووشی خوێن بوو.

ئەگەر خوێنەکە لە گەڵ ئافرەتەکە بەردەوام بوو ،ئەم ماوە درێژە، ئەوە خوێنی حەیز نیە ، بەڵکو خوێنی خوێنچرکەیە، بۆیە لەسەری پێویستە تەنها ڕۆژەکانی سوڕی مانگانەی دابنیشێت لە هەر مانگێك، کە پێشتر لە کاتەکەی ڕاهاتبوو. پاشان خۆی دەشوات و نوێژ دەکات و دەست نوێژ هەڵدەگرێت بۆ هەر نوێژێك لە گەڵ بەکارهێنانی ئەم شتەی کە هاتنە خوارەوەی خوێن ڕادەگرێت بە پێی توانای.

«اللجنة الدائمة»

٨. تووشبوی خوێنچڕکە سێ حاڵەتی هەیە:

أ- ئەگەر سوڕی مانگانەی هەبێت: کاتێك سوڕی مانگانەی خۆی هات واز لە نوێژ دێنێت، پاشان خۆی دەشوات‌و نوێژ دەکات، جا جیاوازی نیە ئەگەر مانگەکەی زۆر بێت یان کەم. جا ئافرەتی وەها هەیە مانگی بیست ڕۆژە، پێنج ڕۆژ تێدا حەیزدار دەبێت پانزە ڕۆژیش تێدا پاك‌و خاوێن دەبێت، پاشان پێنج ڕۆژ حەیزدار دەبێت‌وپانزە ڕۆژیتر پاك‌وخاوێن دەبێت ئیتر بەو شێوە. وەئافرەتی وا هەیە مانگی سی‌و پێنج ڕۆژە، حەوت ڕۆژ حەیزدار دەبێت، بیست‌و هەشت ڕۆژ پاك‌و خاوێنە ئیتر بەم شێوە. مانگی ئافرەت، ئەوەیە کە حەیزێکی تەواوو پاکبوونەوەیەکی تەواوی تێدا دەبینێت.

ب-ئەگەر سوڕی مانگانەکەی لە یاد نەبێت، یان سوڕی مانگانەکەی بەردەوام نەبێت، هەندێك جار چوار ڕۆژو هەندێك جار شەش ڕۆژ بێت، دوای ئەوە لێی تێکەڵ بێت نەزانێت چ خوێنەکە: هاو نموونەی ئەو کەسە ئیش بە جیاکردنەوە دەکات، جیاکردنەوەی خوێنی حەیز لە خوێنی خوێنچڕکە، خوێنی حەیز خوێنێکی ڕەشی ئەستورە، خوێنی خوێنچڕکە، خوێنێکی سووری تەنکە، ئەم حاڵەتە پـێی دەوترێت ( جیا کەرەوە). لە کاتی خوێنە ئەستورەکە دادەنیشێت‌و، لە کاتی خوێنە تەنکەکە نوێژ دەکات.

ج– ئەوەی خوێنەکانی هەموو لێ تێکەڵ دەبێت، ئەو خوێنە لەو خوێنەکەیتر ناناسێتەوە، وەهیچ سوڕی مانگانەی نیە، ئەوە پێی دەوترێت " سەر لێشێواو"، ئەو ئافرەتە ئیش بە درێژترین سوڕی مانگانەی ئافرەتەکانی وەکو دایکی، یان داپیری، یان خوشکی دەکات. ئەگەر سوڕی مانگانەیان حەوت ڕۆژ بێت ،ئەویش حەوت ڕۆژ دادەنیشێت.

«الشيخ إبن جبرين»

# ئافرەت‌و تەڕایەتی‌و شلەکان

## ❖ ٣٤ وەڵامی تێدایە

١. زەردەخوێن: خوێنێکی زەردە لە ئافرەت دێتە دەرەوە.

٢. لێڵ: شلەیەکی شێلوە لە ئافرەت دێتە دەرەوە، خوێنێکی سووراویە، بەڵام سوریەکەی دیار نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣. ئاوە سپیەکە: ئاوێکی سپیە، ڕەحمی ئافرەت فڕێی دەداتە دەرەوە کاتێک کە حەیزی دەپچڕێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤. هەندێك ئافرەت ئاوە سپیەکەی نیە، بەڵکو شلەیەکی لێڵ لە گەڵی دەبێت لە حەیزێکەوە تا حەیزێکی ترەوە، جا ئەو ئافرەتە نیشانەی پاکبوونەوەی ئەوەیە، خوێنەکەی بوەستێت ئەگەرچی زەردە خوێنەکەی بمینێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥. ئاوە شێلوو شلە زەردەکە، کە پێش حەیز دێتە خوارەوە:

ئەگەر لە پێشینەکانی حەیز بێت ئەوە حەیزە " ئەویش بەو ئێش و ئازارو ژانە سکە دەیزانێت کە زۆر جار حەیزدار تووشی دەبێت" وەئەگەر ئەم نیشانانە دەرنەکەوت ئەوە پاکبوونەوەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦. ئاوە شێلوەکەو شلە زەردەکەی دوای حەیز: چاوەڕوان نەمانی دەکات، چونکە ئاوە شێلوەکەی دوا بەدوای حەیز، ئەویش حەیزە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. دەردراوەکان ( ئەو شتانەی ئافرەت دەریان دەدات) ، ئەو دەردراوانەی کە لە کاتی حەیز نایەتە دەرەوە، هیچیان حوکمی حەیزی نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨. ئەو شتانەی کە لە کۆئەندامی زاوزێی ئافرەت دەردەچێت بەبێ لەززەت. خۆشوشتن پێویست ناکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

❖ ئافرەت دوو ڕێگای هەیە کە دەردراوەکان لێی دەردەچێت، هەر هەموو دەردراوەکان دەستنوێژ شکێنەرن.

٩. ڕێگایەك كە میزی لێ دەردەچێت: ئەو دەردراوانە "پیسن"، وە دەستنوێژ شكێنەرن، چونكە هەمووی لە میزڵدان دێتە دەرەوە.

١٠. ڕێگایەك كە منداڵ لێی دەردەچێت: ئەو دەردراوانەو تەڕاییانە "پاكن"، چڵوبەرگو لەش، پیس ناكات بەڵكو دەستنوێژ شكێنەرە

«الشيخ إبن عثيمين»

١١. كە دەڵێن دەستنوێژ شكێنەرە مەرج نیە پیس بێت، چونكە با (فس) كە لە مرۆڤ دێتە دەرەوە پاكە، چونكە دانەری شەریعە چوونە سەر ئاوی پێویست نەكردووە بۆی، لە گەڵ ئەوەش دەستنوێژ شكێنەرە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢. "شلەی بەردەوام" كە لە ڕەحمی ئافرەت دێتە دەرەوە پاكە، ئافرەتەكە دەستنوێژ هەڵناگری مەگەر كاتی نوێژ دادێت، لەو كاتەشدا، ئەوەندە نوێژەی (فەڕزو سوننە) دەیەوێت دەكات. وەئەوەندە قورئانەی دەیەوێت دەخوێنێت، جیا جیاوازی لە نێوان كەمو زۆر نیە، وەلەسەری پێویستە ئاگەداری خۆی بێتو خۆی بپارێزێت، هەتاكو دەچێتە ناو كاتێكی تر.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢. (شلەو ئاوی پچڕ پچڕ): چاوەڕوانی کاتی نوێژ دەکاتو دەستنوێژ هەڵدەگرێتو نوێژ دەکات، هیچی لەسەر نیە ئەگەرچی لە کاتی نوێژەکەش هاتە دەرەوە، ئەوە ئەگەر حاڵەتەکەی دیار نەبوو، کاتی وا هەبێت بێتە دەرەوە، کاتی واش هەبێت نەیەتە دەرەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٤. بەڵام ئەگەر پچڕ پچڕ بوو، ئەوە چاوەڕوانی ئەو کاتە دەکات کە تێدا دەپچڕێت.

١٥. بەڵام ئەگەر ترسا لە نەمانی کاتی نوێژەکە، ئەوە دەستنوێژ هەڵدەگریو ئاگەداری خۆی دەبێتو نوێژی خۆی دەکات، وەجیاوازی نیە لەنێوان کەمو زۆر.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٦. ئەو شلەی کە لە رەحم دێتە دەرەوە:

تەنها ئەندامەکانی دەستنوێژ دەشوات، بەبێ شوشتنی ئەو شلەیە، چونکە پاکژە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٧. ئەو ئافرەتەی لەبەر نەزانیو نەفامی لە کاتی تووشبونی ئەو ئاوو شلانە دەستنوێژ هەڵناگرێتەوە.

پێویستە لەسەری بۆ خوای گەورە بگەڕێتەوە، تەوبە بکات، وەنوێژەکان ناگێڕێتەوە بەڵام خۆی ماندوو دەکات لە ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان.

١٨. ئەگەر ئافرەتەکە لە شوێنێك بوو کەس لە لای نەبوو، وەکو ئەو ئافرەتەی کە لە گوند دەژیا، وە بە خەیاڵیدا نەهاتووە کە ئەو ئاوانە دەستنوێژ شکێنەرە، ئەوە هیچی لەسەر نیە.

١٩. بەڵام ئەگەر لە شوێنێك بوو، زانای لێ هەبوو لەبەر تەمبەڵی و بێ موبالاتی خۆی پرسیاری نەکردبێت، ئەوە گێڕانەوەی نوێژەکانی لەسەر پێویست دەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٠. ئەو ئاوەی دوای خۆشوشتنی جووت بوون دەردەچێت،ئەگەر بە بێ لەززەت وەرگرتن بوو خۆشوشتن پێویست ناکات، بەڵام دەستنوێژ هەڵدەگرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢١. وەئەو شتەی لە ئافرەت دەردەچێت لە گەڵ میز بەبێ لەززەت ئەوە " وەدییەو" پیسە، وەکو میز. تەنها شوشتنی شوێنەکە پێویست دەکات.

«اللجنة الدائمة»

## ❖ جیاوازی نێوان وەدیو مەزیو مەنی:-

٢٢. وەدی: شلەیەکە زۆرجار دوای میز کردن دەردەچێت، رەنگی سپیەو پەیتەو بۆنی نیە.

٢٣. مەذی: ئاوێکی پەیت نیە، سپیەو لینجە، کاتی دەست گەمەو یاد کردنەوەی جووت بوون و شتیتر دێتە خوارەوە، وەلەوانەیە مرۆڤ هەست بە هاتنە دەرەوەی نەکات، دێتە دەرەوە لەسەرەتاییەکانی لەززەت وەرگرتن، "هەردوو ئاوەکە وەدیو مەذی پیسنو دەستنوێژ شکێنەرن، دەبێ ئاو بپرژێنیە ئەو شوێنەی کەبەری کەوتووە، دەستنوێژیش هەلدەگریتەوە.

٢٤. مەنی: هی پیاو پەیتەو سپیە، هی ئافرەت پەیت نیەو زەردە، خۆشوشتن پێویست دەبێت لێی.

٢٥. ئەو شلە سپیەی کە لە ئافرەت دێتە دەرەوە لە کاتی خۆ پاکردنەوە لە حەیز ئایا دەستنوێژ دەشکێنێت یان نا؟

هەموو ئەو شتانەی لە کۆئەندامی زاوزێو میز کردن دێتە دەرەوە دەستنوێژ شکێنەرە، چوونە ئاودەست پێویست دەکات.

«الشیخ إبن باز»

٢٦. ئایا دەستنوێژ هەلگرتنەوە بۆ هەر نوێژێك پێویست دەبێت، بۆ ئەو ئافرەتەی کە تەڕایەتی لە ڕەحمی دێتە دەرەوە ؟

ئەگــەر ئــەو تەڕایەتیـیــەی باســکرا بــەردەوام بێـــت لەزۆربـــەی کاتەکان، پێویستە بـۆ هـەر کەسێك کـە ئـەو تەڕایەتیـە دەبینێـت دەستنوێژ هەڵبگرێتەوە بۆ هەر نوێژێك کە کاتەکەی دادێت، وەکـو خـــاوەن خوێنـــچڕکەی نەخۆشـــی ( مـــستحاضة) یـــان خـــاوەنی میزەچۆڕکێ. بەڵام ئەگـەر تەڕایەتیەکـە هەنـدێك جـار بێـت، ئـەوە حوکمەکـەی وەکـو حـوکمی میـزە، کـەی هـەبوو دەسـتنوێژەکەی دەشکێنێت ئەگەرچی لەناو نوێژیش دابێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٧. هەندێك جار بەبێ هـاتنی کـاتی حـەیز، هەنـدێك دەردراو بـۆم پەیـدا دەبێـت، کـە ڕەنگیـان کاڵـەو بـەرەو زەردی دەڕوات، هەنـدێك جـار واز لـە نوێـژ دەهێـنم، هەنـدێك جـاریش نوێـژ دەکەم، حوکمەکەی چییە؟

ئەوەی ئافرەت دوای پاکبوونەوە لە حـەیزی دەیبینێـت لـە زەردە خـوێنو شـلەی شـێلو، بـە حـەیز دانانرێـت، بـەڵکو نوێـژو ڕۆژوی لەسەرە، بۆ پیاوەکەشی حەلالە لە گەڵی جووت بێت .

«اللجنة الدائمة»

٢٨. حوکمی دەردراوەکـانی بۆریـچەی منـداڵبوون، ئـەوەی کـە لـە ئافرەت دێتە دەرەوە؟

دەستنوێژ دەشکێنێت، ئەو شوێنەی بەریکەوتوە لە لەش و چڵ و بەرگی پیسی دەکات، بۆیە لەسەر ئافرەت پێویستە بچێتە سەر ئاوو دەستنوێژ هەڵبگرێتەوە، کاتێك ویستی نوێژ بکات، وە ئەو شوێنەی بەریکەوتووە لە چڵ و بەرگ و لەشی بشوات.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٩. ئەو ئافرەتەی کە بەردەوام دەردراوەکانی لێ دەردەچێت:

دەچێتە سەرئاو (ئاودەست) کۆئەندامی زاوزێی پاکژ دەکاتەوە، شتێکی لەسەر دادەنێت بۆ ئەوەی نەهێلێت هیچ شتێکی لێ دەربچێت، وە بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژ هەڵدەگرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٣٠. هاتنە دەرەوەی دەردراوەکان (ئاوگ) لە ئەنجامی ماچ و دەستگەمە.

خۆشوشتن واجب ناکات مەگەر مەنی بێت و بە پەلەو بە لەززەت هاتبێتە دەرەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

٣١. ئاگەداری: ئەگەر خوێن هاتە خوارەوە لە کاتی سوڕی مانگانەی ئافرەت، ئەگەر کەمیش بێت، پاشان پچرا، کاتێك ئافرەتەکە بەڕۆژوو بێت، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە،

ڕۆژووەکەی دەشکێنێت پاشان دەیگێڕێتەوە، خۆشوشتن لەسەری واجب دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٣٢. ئەو شلە زەردەی دێتە خوارەوە بۆ کچی گەنجو بەساڵا چوو بەبێ خەون بینین( إحتلام)

- ئەگەر ئەو شلە ( مذی) بێت ئەوە خۆشوشتن پێویست ناکات .

- بەڵام ئەگەر مەنی بوو‌بێتو بە لەززەت یان بە خەون بینین هاتبێتە خوارەوە، ئەوە خۆشوشتن لەسەری واجب دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٣٣. ئەو شلە زەردەی کە دێتە خوارەوە پێش حەیز بەڕۆژێك یان زیاتر:

ئەگەر لە پێشینەکانی حەیز بێت ئەوە حەیزە، ئەویش بەو ئێشو ئازارو ژانە سکە دەزانرێت کە زۆر جار حەیزدار دەیبینێت، بەڵام ئەگەر ئەو ئاوە زەردە پێش حەیز بێتو هیچ نیشانەکانی حەیزی لە گەڵ نەبوو، ئەوە هیچ نیە.

- شلە شێلوو لێڵەکەی دوای حەیز، ئافرەتەکە چاوەڕوان دەکات هەتاکو نامێنێت، چونکە ئەو شلە شێلوەی لە گەڵ حەیز، حەیزە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٤. بەردەوام بوونی شلە زەردەکە دوای پاکبوونەوە:

ئەگــەر ئــافرەت ئــاوە ســپیەکەی نــەبینێبێت، کــە نیــشانەی پاکبوونەوەیەتی، ئەوە ئەو ئاوە زەردە شوێنی دەگرێتەوە.

- وە هەنــدێك جــار ئــافرەت ئــاوی ســپی‌و ئــاوی زەرد نابینێــت‌و نیەتی، بەڵکو ووشکبوونی هەیە تــا حــەیزێکی تــر، هــەر ئافرەتێــك جۆرە حوکمێکی هەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

# ﴿ ئافرەتو سك پڕبوون ﴾

## ❖ ٣٨ وەڵامی تێدایە

١. ئەو خوێنەی کە دێتە درەوە لە ئافرەتی دوو گیان.

ئەو خوێنەی کە ئافرەت تووشی دەبێت لە ناکاو، یان بە هۆی کارەساتێك، یان بە هۆی هەڵگرتنی شتێك، یان بە هۆی کەوتنە خوارەوە لە شتێكو ئتیر بەو شێوە، ئەوە حەیز نیە ، بەڵکو ئەوە خوێنی پیسە ، حوکمی ئەو ئافرەتە، وەکو ئافرەتە پاکەکانە، نوێژو ڕۆژووی خۆی دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٢. حیکمەت لە هەبوونی حەیز: خوای گەورە دروستی کردوە بۆ خواردنی کۆرپەڵە لە ناو سکی دایکی، کاتێك سکەکە پەیدا دەبێت، حەیزەکە دەپچڕێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

٣. ئافرەتی دووگیان حەیزدار نابێت.

«الشیخ إبن باز»

٤. تووشی خوێن بەربوون (نزیف) بوو چۆن نوێژ بکات؟

حوکمەکەی ئەوەیە لە نوێژو ڕۆژووەکانی دادەنیشێتو نایکات کاتی سووڕی مانگانەی پێشووی، پێش ئەوەی ئەو ڕووداوە

تووشـی بوویێـت. کاتێـك ماوەکـە تـەواو بـوو خـۆی دەشـوات و نوێژو ڕۆژووی خۆی دەکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥. چـونیەتی نوێــژ کــردن: زۆر بـــە جــوانی کۆئەنــدامی زاوزێی بـشوات و بیپێـچێتەوەو دەسـتنوێژ هــەڵبگرێت کـە کـاتی نوێـژ دادێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦. دروسـتە بۆ ئەو ئافرەتـەی کـە تووشـی خـوێن بـەربوون بـووە، نوێـژەکانی نیـوەڕوو عەسـر، یـان بــە پێـچەوانە ، وە نوێـژی مەغریب و عیشا یان بە پێـچەوانە کـۆ بکاتـەوە بـە دوا خـستنی یان بە پێشخستنی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. دەرهێنانی ڕەحم لە ڕەگەوە بۆ ڕێگا گرتن لە منداڵبوون. ئەگەر پێویست و گرنگ بێت ئاسایییە، ئەگـەر پێویـست نـەبوو ، دەبێ واز بێنێت و نەیکات.

«الشيخ إبن باز»

٨. بەستنەوەی رەحم:

بۆ حاڵەتی پێویست دەبێت وەکو ئەوەی ئافرەتەکە نەخۆشی باڵەپەستۆو (ضغط) ،یان نەخۆشی شەکرەی هەبێتو، منداڵبوونەکە ئاسایی نەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٩. حەبی قەدەغەکردنی سك بڕی:

لە حاڵەتی پێویست هیچی لەسەر نیەو ئاساییەیە، بە شێوەیەکی کاتی بەکاری بێنێت.

«الشيخ إبن باز»

١٠. بەکارهێنانی هۆکارەکانی رێکخستنی ڕەحم:

گوناهی لەسەر نیە، بەڵام دەبێت لە ساڵی یەکەمو دووەمی شیردانی بێت، تاکو سکی داهاتووی زیانی پێ نەگەیێنێت.

«الشيخ إبن باز»

١١. پەیتاندنی دەستکرد:

هەندێك لە زانایانی سەردەم ڕێگایان پێداوە، بەڵام بە چەندەها مەرج و ئاگەداری تا شتێك روونەدات کە خوا قەدەغەی کردوە، بەڵام من لەوانەم کە ڕاوەستاوم لە ئاست ئەم بابەتە، ئامۆژگاری بە نەکردنی دەکەم، چونکە لەوانەیە دەرگایەکی شەڕو خەراپەی وا بکاتەوە کۆتایی نەبێت. «الشيخ إبن باز»

١٢.له باربردن:

دروست نیه بۆ ئافرەت کۆرپەڵەی خۆی لەبار ببات، ئەگەر چی لە زیناش بێت، لەسەری پێویستە بۆ خوای گەورە بگەڕێتەوەو تەوبە بکاتو، بابەتەکەش نەدرکێنێت. منداڵەکەش بۆ پیاوەکەی دەگەڕێتەوە.

«الشيخ إبن باز»

١٣.ئایا له باربردنی کۆرپەڵەی کەم ئەندام دروستە؟

لە بار نەبردنی کۆرپەڵە واجبە، هەتاکو ئەگەر پزیشکەکان ئامۆژگاریان کردو وتیان کۆرپەڵەکە بەو نزیکانە دەمرێت، یان بە کەم ئەندامی لە دایك دەبێت، هەر دروست نیە، چونکە کوشتنی گیانێکی بێ تاوانە بەبێ هۆ قەدەغەیە.

١٤.لیژنەکە ئامۆژگاری پیاوو ئافرەتەکە دەکات کە گومانی باشیان بەخوا هەبێت، داوای سەلامەتی بۆ ئافرەتو سکەکەی بکەن لە هەموو خەراپەیەك.

«اللجنة الدائمة»

١٥.سنووردار کردنی وەچە: دروست نیە مەگەر ئافرەتەکە نەخۆش بێتو، سك پڕبوون زیانی بۆی هەبێت، هەروەها ئەگەر منداڵیکی زۆری هەبێت، دووگیانی لەسەری قورس بێت، هیچی تێدا نیە ئەگەر حەب بخوات بۆ ماوەیەکی دیاری کراو،

تا ئەو کاتەی هەندێك باری سووك دەبێت و دەتوانێت پەروەردەیان بکات.

«الشیخ إبن باز»

١٦. مندالّی لوولەکان: زانایەکان فەتوایان بە قەدەغەکردن و نەکردنی داوە، لەبەر ئەوەی ئاشکرا کردنی عەورەت و دەست لێدانی کۆ ئەندامی زاوزێ و شێواندی ڕەحمی تێدایە، ئەگەر چی مەنیەکە هی ئەو پیاوە بێت کە مێردی ئافرەتەکەیە. بۆیە من وا دەبینم کە پێویستە لەسەر مرۆڤ رازی بێت بە حوکمی خوای گەورە چونکە ئەو ( یجعل من یشاء عقیماً) واتە ئەو کەسەی بیەوێت نەزۆکی دەکات.

«الشیخ إبن جبرین»

- بە کارهێنانی ئەو شتانەی کە سکپڕبوون قەدەغە دەکات، ئەویش دوو جۆرە:

١٧. قەدەغە کردنێکی بەردەوام ئەوە دروست نیە چونکە پچرانی وەچەی تێدایە، ئەوەش دژی مەبەستی دانەری شەرعە لەزۆربوونی گەلانی ئیسلامی.

«الشیخ إبن عثیمین»

١٨. قەدەغەی بکات قەدەغەکردنێکی کاتی، وەکو ئەوەی ئافرەتێك بێت زوو زوو دووگیان بێت، دووگیانیش زۆر ماندووی

بکات، بۆیە حەز دەکات سکپڕبوونەکەی خۆی ڕێك بخات هەر دوو ساڵ جارێك یان بەو شێوە، ئەوە دروستە بەو مەرجەی پیاوەکەی ڕێگای پێ بداتو هیچ زیانێکی لەسەر ژنەکەی نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

- به کارهێنانی شتێك بۆ خستنو لەبار بردنی سکەکەی ئەوەش دوو جورە:

١٩. مەبەست لە خستنی، نەهێشتنی بێت، ئەوەش ئەگەر دوای فوو کردنی روح بێت تێیدا، ئەوە قەدەغەیە بەبێ گومان، چونکە کوشتنی گیانێکە بەبێ هەق کە کوشتنی حەڕامە.

٢٠. وەئەگەر پێش فوو کردنی روح بێت تێیدا، ئەوە زانایەکان ڕاوو سەرەنجی جیاوازیان هەیە لە دروست بوونی.

١. هەیە قەدەغەی کردووە.

٢. هەیە دروستی کردووە.

٣. هەیە ووتویەتی دروستە ، ئەگەر نەبووبێتە (علقة) ، واتە چل ڕۆژ لەسەری نەڕۆیشت بێت.

٤. وەهەیە ووتویەتی: دروستە ئەگەر نەبووبێتە شێوەی دروستی مرۆڤ .

- ئەوەی چاکترو دڵنیاتر بێت، لە بار خۆی نەبات، مەگەر لەبەر پێویستیەك بێت، وەکو ئەوەی ئافرەتەکە نەخۆش بێت

بەرگەی دووگیانی نەگرێت، یان شتێکی هاوشێوەی ئەوە بێت.
ئـەو کـات دروسـتە لـەباری ببـاتو بیخـات، مەگـەر کـاتێکی بەسەردا تێپەڕیبێت شێوەی مرۆڤـ لێ دروسـت بووبێـت ، ئـەو کات نابێت وابکات قەدەغەیە والله أعلم.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢١. مەبەست لە خستنی کۆرپەڵەکە نەهێشتنی نیە:
بەڵکو هەوڵدانێکە بۆ هاتنە خوارەوەی لە کۆتایی ماوەی سکەکەی ئـەوە دروسـتە، بـە مـەرجێك هـیچ زیانێـك بـە ئـافرەتو منداڵەکـە نەگات.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢٢. ئاگەداری:
ئەو حاڵەتانەی کـە خـستنو لـەباربردنی کۆرپـەڵـەی تێـدا دروسـتە لەوانەی پێشوو، هەموو دەبێت بەڕێپێدانی پیاوەکەی بێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢٣. حوکمی بڕینی مارەیی لە ئافرەتێك چۆیە ؟ کـە سـکی پـڕە لە زینا؟
مارە کردنەکـەی بەتاڵـە، لەبـەر فـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ) ( لا توطا الحامل حتی تضع) واتـە ئـافرەت مـارە ناکرێتـەوە، هـەتاکو

سکە پڕەکەی دادەنێت. بۆ پیاوەکەش حەرامە لە گەڵی جووت بێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٤. جووت بوون لە گەڵ ئافرەتی دووگیان.

هیچی تێدا نیە، ئەگەر هیچ زیانی نەبێت لە سەر سکەکەی.

«اللجنة الدائمة»

٢٥. تەڵاق دانی دوو گیان دەکەوێت؟

بەڵێ دەکەوێت و دروستە، لە ماوەی سک پڕییەکەی خەرجی و بەخێو کردنی لەسەر پیاوەکەی واجبە.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٦. کەمترین ماوەی دووگیان شەش مانگە.

«اللجنة الدائمة»

٢٧. قەدەغە کردنی سک پڕی لەبەر نەبوونی: دروست نیە چونکە ڕۆزیان لەسەر خوای گەورەیە.

«اللجنة الدائمة»

٢٨. لە بنەڕەتدا دروست نیە ئافرەت سک پڕی قەدەغە بکات، یان وەچەی خۆی سنووردار بکات، مەگەر بە هۆی سکەکەی زیانێك بە ئافرەتەکە بگات، یان لەبەر پێویستی شیردانی ئەو منداڵەی کە هەیەتی. لەم حاڵەتە دەبێت قەدەغەی بکات.

«اللجنة الدائمة»

٢٩. دەبێت خەرجی ئافرەتی دووگیان لە جیاتی (خلع) بێت.(خلع: ئافرەت مارەیی خۆی بداتەوە پیاوەکەی لە بەر داواکردنی تەلاق لە پیاو). دروستەو دەبێت، ئەو شتە دیارو باوە لە راپەوی حەنبەلیەکان.

٣٠. ئەگەر پیاوێك ئافرەتەکەی یەك جار تەلاق دا، دیارکەوت کە دووگیانە، ئایا بۆی دروستە بیهێنێتەوە؟

بەڵێ بۆی دروستە بیگێرێتەوە پێش دانانی سکەکەی، رازی بێت یان پێی ناخۆش بێت.

بەڵام دوای دانانی سکەکەی بۆی نیە بیگێریتەوە، بەڵام بۆی هەیە دووبارە بیخوازێتەوەو هاوسەرگیری بکەنەوە، بە مارەیی‌وەلی‌و شاهێدی نوێ.

«الشيخ السعدي»

٣١. ئەگەر ئافرەتی دووگیان کۆرپەلەی خۆی خست.

ئەگەر کۆرپەلەکە دەستی بە دروست بوون کردبێت، ئەوە نیفاسدارە، بە رۆژوو نابێت. ئەگەر وەها نەبێت( دەستی بەدروست بوون نەکردبوو) ئەوە خوێنچڕکەیە، بەرۆژوو بوونی لەسەر پێویستە ئەگەر بتوانێت.

٣٢. پاداشتی ئەو ئافرەتەی کەدەمرێت بەهۆی منداڵبوون :

پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی(والمرأة تموت بجمع شهيد)رواه أبو داود

واتــه ئـەو ئافرەتـەی بـەدوو گيـانی دەمرێـت شـەهيدە. مەبەسـتی ئەوەيە دەمرێت بە شتێك لە گەڵيەتیو لێی جيا نەبووبێتەوە، ئـەو ئافرەتەی لە حاڵەتی منداڵبوون دەمرێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٣. ئەو خوێنەی کە لە دووگيان دێتە دەرەوە:

خوێنی پيسە، خوێنی حـەيز نيـە، لەسـەری پێويـستە دەسـتنوێژ هـەڵبگرێت بـۆ هـەر نوێـژێك کـە کاتەکـەی دادێـتو حەلاليـشە بـۆ پياوەکەی (لە گەلی جووت بێت)

«اللجنة الدائمة»

٢٤. کاتێـك ئـافرەتی دوو گيـان سـکەکەی دانـاو خـوێن نەهاتـە دەرەوە، ئايـا دروسـتە بـۆ پياوەکـەی لـە گـەڵی جـووت بێـتو ئافرەتەکە نوێژەکانی خۆی بکات؟

ئەگەر ئافرەتی دووگيـان سـکەکەی دانـاو خـوێن نەهاتـە دەرەوە، ئەوە خۆشوشتنو نوێژو ڕۆژووی لەسەر واجب دەبێت. دروسـتيش دەبێـت بـۆ پياوەکـەی لـە گـەڵی جـووت بێـت دوای خۆشوشـتن، چونکە زۆر جـار لـە منداڵبوونـدا خـوێن هـەر دێتـە دەرەوە ئەگـەر کەميش بێت، لە گەڵ منداڵبوونەکە يان دوای منداڵبوونەکە.

«اللجنة الدائمة»

٣٥. ئایا دروستە بۆ ئەو ئافرەتەی کە زیان دەبینێت بە سکەکەی ، سکەکەی لەبار ببات؟

دروستە دڵۆپە ئاوەکەی (نطفة) لەبار ببات‌و بیخات، پێش ئەوەی چل ڕۆژ تەواو بکات، بە دەرمانێکی ڕێپێدراو، دوای چل ڕۆژیش دەبێت ئەگەر سکەکەی مەترسیەکی ڕاستەقینەی لەسەر گیانی ئافرەتەکە هەبێت، یان زیانی بۆ لاشەی هەبێت، ئەویش بە ڕاپۆرتی پزیشکە خاوەن شارەزاو پسۆڕەکان.

**«الشیخ إبن جبرین»**

٣٦. کفرانەی (کفارة) کوشتنی ئەو منداڵەی روحی تێدا فوو کراوە، ئەویش ئەو منداڵەیە کە چل ڕۆژی بەسەردا تێپەریوە.

ئازاد کردنی بەندەیەکە، ئەگەر نەیبێت بەڕۆژوو بوونی دوو مانگە لەسەر یەکتر، وەکو تەوبەکردنێك‌و گەرانەوە بۆ لای خوا.

**«الشیخ إبن فوزان»**

٣٧. ئافرەتێکی دوو گیان یەك مانگە ئاو دەبینێت‌و لێ دێتە دەرەوە.

ئەو ئاوەی دێتە خوارەوە دەستنوێژ شکێنەرە، بەڵام پاکە، جل‌و بەرگ‌و لاشە پیس ناکات.

**«الشیخ إبن عثیمین»**

٣٨. ئافرەتێك كۆرپەڵەكەی لەبار برد، تەمەنی مانگێكو نیو بوو، وە نەشتەرگەریەكی خاوێن كردنەوەی بۆ ئەنجام درا، پانزە ڕۆژ دوای نەشتەرگەریە خوێن بەردەوام دەهاتە خوارەوە، وازی لە نوێژ هێنا لەم ماوەیە.

لەسەری پێویستە هەموو نوێژەكانی ئەم ماوە بگێڕێتەوە، كە وازی لێ هێنابوو، چونكە ئەو خوێنەی كە دەهاتە خوارەوە خوێن بەربوون (نزیف) بوو. چونكە ئەگەر تەمەنی كۆرپەلەكەی لە باری بردووە كەمتر بێت لە (٨١ ڕۆژ) ، ئەوە ئەو خوێنەی دێتە خوارەوە خوێن بەربوونە(نزیف)، واز لە نوێژ ناهێنێت لەبەر ئەم خوێنە. بەڵام ئەگەر تەمەنی كۆرپەڵە (٨١)ڕۆژ یان زیاتر بێت، ئەوە ئەو خوێنەی كە دێتە دەرەوە دوای لەباربردنەكە خوێنی نیفاسە، واز لە نوێژ دێنێت لەبەر ئەم خوێنە تاكو پچڕانی، یان تاكو دەبێتە چل ڕۆژ پاشان خۆی دەشوات و نوێژی خۆی دەكات.

**«الشيخ إبن فوزان»**

# «ئافرەتو نیفاس»

## ٢٤ وەلامی تێدایە

١.پێناسەی نیفاس : خوێنێکە لە ڕەحم دێتە دەرەوە بە هۆی منداڵبوون یان لە گەڵ منداڵبوونەکەی یان دوای منداڵبوون یان پێش منداڵبوونی بە دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ بە ئازارو ژانەوە.

«الشیخ إبن عثیمین»

- نیفاسدار چەند حاڵەتێکی هەیە..

٢. خوێنەکەی بپچڕێت پێش چل ڕۆژو نەگەڕێتەوە، ئەوە خۆی دەشواتو نوێژو ڕۆژی خۆی دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٣. خوێنەکەی بپچڕێت پێش چل ڕۆژ، بەڵام پاشان بگەڕێتەوە پێش چل ڕۆژ، لەم حاڵەتە ئەگەر خوێنەکەی لێ پچرا، خۆی دەشواتو نوێژو ڕۆژووی خۆی دەکات، وەئەگەر بۆی گەڕاوە خوێنەکەی نیفاسەو دادەنیشێتو نوێژو ڕۆژوو ناکات.

«اللجنة الدائمة»

٤. لە گەڵی بەردەوام بێت هەتاکو چل ڕۆژ: لەو ماوە هەمووی دادەنیشێتو نوێژو ڕۆژوو ناکات، وە ئەگەر پچڕا خۆی خاوێن دەکاتەوە، نوێژو ڕۆژووی خۆی دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٥. بەردەوام بێت دوای چل ڕۆژ: ئەو حاڵەتە بە دوو شێوە دەبێت:

یەکەم: لە گەڵ سوڕی مانگانەی ڕێککەوێت، کاتی سوڕی مانگانەی هات (دوای چل ڕۆژەکە) ، ئەوە لەم حاڵەتە کاتی سوڕی مانگانەی دادەنیشێت.

«اللجنة الدائمة»

دووەم: سوڕی مانگانەی ئافرەتەکە نەکەوێتە ئەو کاتە، ئەوە خۆی دەشوات دوای چل ڕۆژ نوێژو ڕۆژوی خۆی دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٦. خوێن ببینێت پێش منداڵبوون بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ : ئەگەر ئێش و ئازاری لە گەل بوو ئەوە نیفاسە لەبەر خوێنەکە واز لە نوێژو ڕۆژوو دێنێت.

«اللجنة الدائمة»

٧. ئەگەر ئێش و ژانی لە گەڵدا نەبوو: ئەوە خوێنێکی پیسە، هیچ گرنکی پێ نادرێت. وەقەدەغەی ناکات لە نوێژو ڕۆژوو.

«اللجنة الدائمة»

٨. پێویستە لەسەر خاوەنی خوێنچرکە: لە کاتی کۆتایی هاتنی نیفاس خۆی بشوات.

«الشيخ إبن فوزان»

٩. گـۆڕانی ڕەنگــی خــوێنی نیفــاس: ئەگــەر شــلە لینجەكــە، نیشانەكانی پاكبوونەوەی تەواوی تێدا دەرنەكەوت، ئەوە هەر حوكمی خوێنی نیفاسی لەسەر جێ بە جێ دەكرێـت، پـاكو خاوێن نابێت هەتا نیشانەی پاكو خاوێنی تەواو دەبینێت.

«اللجنة الدائمة»

١٠. ئەو خوێنەی لە ئافرەت دەردەچێت لەو كاتـەی كـە سـكەكەی بە نەشـتەرگەری دادەنێـت، حوكمەكـەی حـوكمی نیفاسـە، وە ئەگەر خوێن نەبینێت ئەوە نوێژو ڕۆژووی خۆی دەكات.

«اللجنة الدائمة»

١١. لاشەی ئافرەت دوای تووشبونی بە نیفاس: لاشەی پیس نیـە، خواردن لـە گـەڵی، یـان دەسـت گەمـە كـردن لـە گـەڵ هـەموو ئەندامەكانی جگە لە كۆئەندامی زاوزێی قەدەغە نیە.

«اللجنة الدائمة»

- ئەو خوێنەی دەردەچێت دوای كۆرپەڵە لە باربردن.

١٢. ئەگــەر ئــەو كۆرپەڵەیــە شــێوەی مرۆڤــی پێــوە دیــار بــوو، دەستەكانو پێیەكانو هەموو ئەندامەكانی لەشـی، ئـەوە ئـەو خوێنە خوێنی نیفاسەو ناتوانێت نوێژو ڕۆژوو بكات.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٣.وە ئەگەر كۆرپەڵەكە شێوەی مرۆڤی پێوە دیار نەبوو. ئەوە خوێنی منداڵبوون نیە، دەستنوێژ هەڵدەگرێت بۆ هەر نوێژێكو ئاگەداری خۆی دەبێتو ڕۆژوو دەگرێت ،مەگەر لەو ڕۆژانەی كە دەكەوێتە ناو سوڕی مانگانەی خۆی.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٤.چ كاتێك كۆرپەڵە دروست دەبێت؟

زۆربەی جار دەبێتە ٩٠ ڕۆژ.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٥.ئەگەر ئافرەتەكە منداڵەكەی لە قۆناغی (علقة) یان بابۆڵە (مضغة) لە باربرد شێوەی مرۆڤی تێدا دروست نەبووبێت، خوێنی نیفاسی نیە، بە خوێنی پیس دادەنرێت، نوێژو ڕۆژووی خۆی دەكات لە گەڵ هەبوونی ئەم خوێنە، دەستنوێژ هەڵدەگرێتەوە بۆ هەر نوێژێكو خۆی دەپارێزێت ای،ی، بە پەمۆییێك یان شتێكی تری هاوشێوەی.

«اللجنة الدائمة»

١٦. ڕۆیشتنە دەرەوەی ئافرەتی تووشبوو بە نیفاس:

وەكو ئافرەتەكانیترە، هیچی لەسەر نیە ماڵەكەی خۆی جێبهێڵێت بۆ پێویستی، بەڵام چاكترە بۆ سەرجەم ئافرەتەكان، لە ماڵەكانیان بن، لەبەر فەرموودەی خوای گەورە (وقرن في بيوتكن

ولا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى) واته لـه مـالّى خۆتـان بمێننـەوەو وەكو نەفامەكانى سەردەمى نەزانى جوانى خۆتان دەرمەخەن.

«الشيخ إبن باز»

١٧. ئايا دروستە ئافرەتى تووشبوو بە خوێنى منداڵبوون تەڵاق بدەى؟ دروست نيە، بەڵكو تەڵاق دانێكى بيدعەيە وەكو حەيزدار

«الشيخ إبن عثيمين»

١٨. كەمترين كاتى نيفاس ماوەيەكى سنووردارى نيە.

ئەگەر هاتوو پاك بووبێتەوە لە كاتێك كە دە ڕۆژ لەسـەر مـاوەى منداڵبوونەكـەى ڕۆيـشتبێت يـان كـەمتر يـان زيـاتر، خۆشوشـتنى لەسەر پێويست دەبێـت، حـوكمى ئافرەتـە پاكبووەكـانى لەسـەر جێ بەجێ دەكرێـت.

«الشيخ إبن باز»

١٩. هەندێك لە ئافرەتان تووشى منداڵ بوون دەبن، كاتێك كە دەچـنە نـاو كـاتى نوێـژ، ئايـا دواى تـەواو بـوونى نيفاسـەكەى، گێڕانـــەوەى ئـــەو نوێژانـــەى لەســـەرە، كـــە كاتەكـــەى داهاتبوو،نەيكردبوو؟

گێڕانەوەى لەسەر نيە، ئەگەر كەمتەرخەمى نەكردبێت لـە كردنـى، بـەڵام ئەگـەر نوێژەكـەى دواخـستبێتو پـشت گـوێى خـستبێت،

هەتاکو کاتەکەی بەرەو نەمان چووبێت‌و پاشان منداڵی بووبێت، ئەوە گێڕانەوەی لەسەر پێویستە دوای پاکبوونەوەی لە نیفاس.

«الشیخ إبن باز»

٢٠. ئەگەر ئافرەتی نیفاسدار پاکبووبێتەوە پێش چل ڕۆژ پاشان خوێنەکەی بۆ بگەڕێتەوە لە کاتێك کە ئەو بە ڕۆژووە.

لەسەری پێویستە واز لە نوێژو ڕۆژوو بێنێت، لەو ڕۆژانەی کە خوێنی بۆ گەڕاوەتەوە، چونکە خوێنەکە نیفاسە، بۆ پاك بوونەوەی چل ڕۆژ دەوێت.

«الشیخ إبن باز»

٢١. دروستە ئافرەتی نیفاسدار قورئان بخوێنێت؟

لەسەر ڕای دروستی زانایان دروستە، تاوەکو لە خێرو پاداشتی قورئان خوێندن‌و فێربوونی حوکمە شەرعیەکان کێبی خوا بێ بەش نەبێت، وە دوعایەکانیش دەخوێنێت.

«الشیخ إبن باز»

٢٢. حوکمی هاتنە دەرەوەی زەردایی لە میانەی نیفاس‌و بەدرێژایی چل ڕۆژ؟

ئەو شتەی لە ئافرەت دەردەچێت لەدوای منداڵ بوون حوکمەکەی حوکمی خوێنی نیفاسە، جا یەکسانە ئەگەر خوێنەکە ئاسایی یان زەرد یان شێلو بێت، چونکە ئەو کاتە کاتی خوێنی نیفاسە

هەتاكو چل ڕۆژ تەواو دەكات، وەدوای ئەوە، ئەگەر خوێنەكە ئاسایی بوو، وەهیچ پچڕانی نەبوو ، ئەوە خوێنی نیفاسە ، ئەگەر نا ئەوە خوێنی خوێنچڕكە (الإستحاضة)ەیە یان لەم جۆرەیە.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٣. ئافرەتێك دوای پاكبوونەوەی لە خوێنی نیفاس بە دە ڕۆژ چەند پەڵە خوێنی سادەی بینی كاتەكەشی كاتی سوڕی مانگانەی حەیزی نیە.

ئەگەر كاتەكە لە گەڵ كاتی سوڕی مانگانەی حەیز نەبوو ، ئەوە نە نوێژ، نە ڕۆژوو واز لێ دێنێت، چونكە ئەو خوێنە خوێنی پیسە، وە ئەوەی وازی لێ هێناوە لەسەری پێویستە بیگێڕێتەوە، لەو ڕۆژانەی كە پەڵە خوێنەكانی بینی بوو.

«اللجنة الدائمة»

٢٤. لە دوای چل ڕۆژی منداڵبوونەكەی، خوێنەكەی گۆڕا ئایا ڕۆژو بگرمو نوێژ بكەم؟

ئافرەتی نیفاسدار ئەگەر خوێنەكەی لە گەڵ ماوە ، سەرەوەی چل ڕۆژو خوێنەكەی نەگۆڕا، ئەگەر ماوە زیادەكە لە گەل كاتی سوڕی مانگانەی حەیزی پێشووی ڕێكەوت، دادەنیشێت، بەلاَم ئەگەر لە گەڵ سوڕی مانگانەی حەیزی پێشووی ڕێكنەكەوت ئەوە خۆی دەشوات و نوێژو ڕۆژووی خۆی دەكات. «اللجنة الدائمة»

# ﴿ ئافرەتو جلو بەرگ ﴾

❖ ٦١ وەڵامی تێدایە.

١. پێناسەی باڵا پۆشی: داپۆشینی هەموو لەشیەتی ، دەمو چاوو دەستەکان جوانیەکەشی دەگرێتەوە، بەشتێك کە بێگانە نەتوانێت هیچ جوانیەك لە جوانیەکانی ببینێت ئەوەی خۆی پێ جوان دەکات. خۆ داپۆشینەکەی بە جلو بەرگو مانەوە لە ماڵ دەبێت.

« الشيخ بكر أبو زيد »

٢. پێناسەی خۆ دەرخستن:

جوانی دەرخستنی ئافرەت بۆ پیاوە بێگانەکان.

- خۆ دەرخستن بەو شتانە دەبێت:

٣. داکەناندنی باڵا پۆشەکەیو، دەرخستنی شتێك لە لاشەکەی بەرامبەر پیاوی بێگانە.

٤. ئافرەت شتێك لە جوانیە دەسکەوتووەکەی دەربخات، وەکو ئەو جلو بەرگانەی لە ژێر عەبایەکەیەتی.

٥. قاچ لە زەوی دانو تەق تەقە کردنیان بۆ دەر خستنی جوانیە شاراوەکانی، بە لەنجەو لار ڕۆیشتنی.

٦. قسە ناسك کردنو تەنك کردنەوەی قسەکەی.

٧. تێکەڵی لە گەڵ پیاوەکان، دۆقە کردنو تێکەڵی قەڵەبالغیش دەگرێتەوە.

« الشيخ بكر أبو زيد »

٨. ئەو فەرموودە " إن المرأة إذا بلغت لم يصلح أن يرى منها إلا هذا وهذا، وأشار إلى وجهه وكفيه" ضعيف، ئەگەر ئافرەت بالغ بوو دروست نیە جگە لەمەو لەمەی ببینرێت. ئامـاژەی بـۆ دەستو دەمو چاوی کرد. لاوازە.

«اللجنة الدائمة»

٩. ئەوەی دروستە بۆ مەحرەمەکانی دەریبخات.

دەمو چاوو، دەستەکانیو خڕخاڵەکانو گوارەکـانیو بازنـەکانیو ملوانکەکەیو سەرو قاچەکانی.

«اللجنة الدائمة»

١٠. دروست نیە بۆ ئافرەت دەستو قۆڵەکانی لە بازاڕ دەربخات، چونکە هۆکـاری فیتنـەو لـە خـشتنە بردنـە. چـونکە هەنـدێك لـە ئافرەتـان ئەنگوسـتیلە لـە پەنجـەکانیان هەیـە، بـازن لـە دەستەکانیان هەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١١. خۆ دەرخستن لەبەردەم خزمەتکارو شوفێرەکان:

حوکمەکەی حوکمی پیاوەکانیترە ، دەبێ ئافرەت خۆی بالآ پـۆش بکات لێیان، وەدروست نیە، نابێت لە گەڵ یەکێکیان بە تەنیا لـە شوێنێك بێـت.

«الشيخ إبن باز»

١٢. دەرخستنی ڕوخسار لە لای پیاوی کوێر:

خۆ دانەپۆشینی لە لای پیاوی نا بیناو کوێر گونـاه نیـەو ئاسـایە. لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) " أعتدي عند ابن مكتـوم فإنـه رجل أعمى" واتە عیددەکەت لەلای ابن مكتبوم بگـرە چـونکە ئـەو کابرایەکی کوێرە (پێغەمبەر (ﷺ) بەفاتیمەی کـچی قـەیس دەڵـێ کە پیاوەکەی تەلاقدا بەلاّم فەرموودەی " أفعمياوان أنتما، ألستما تبصرانة " واتە خۆ ئیوە کوێر نین، ئەی ئێوە ئەو نابینن" لاوازە.

«الشيخ إبن باز»

١٣. یەکێك لەماناکانی خۆڕازاندنەوە، جوان کردنی ڕوخسـارە بـە کلی چاوو هاوشێوەی، وەدەرخستنیەتی بۆ بێگانە.

١٤. ئافرەتــە بــە ساڵاچــووەکان: ئەوانــەی حــەیزیان نــەماوەو منداڵیان نابێت، لەبەر گەورە بـوونی تەمـەنیان. گوناهیـان لەسـەر نیە رووی خۆیان دەربخەن بۆ جگە لە مەحرەمەکانیان، بەلاّم بـالآ پۆشینیان چاکترەو باشترە " وأن يستعففن خير لهن "

«الشيخ إبن باز»

١٥. بالآ پۆشینی ئافرەتی موسڵمان بەرامبەر ئافرەتی گاور:

ڕای ڕاستودروستر ئەوەیە ئافرەت بۆی هەیە سەرەوەی ناووكو خوراەوەی چۆكی دەربخات، جیاوازی نیە ئەگەر ئافرەتەكە موسڵمان یان گاور (كافر) بوو، بەڵام نێوان ناوكو چۆك عەورەتە بۆ هەر هەموویان، نابێت هیچ ئافرەتێك لە ئافرەتێكی تر ببینێت. جا ئەگەر موسڵمان بوو یان موسڵمان نەبوو یان دوور بوو یان نزیك. «اللجنة الدائمة»

١٦. بالآ پۆشینی خزمەتكار:

لەسەری پێویستە بالآی بپۆشێت لە خزمەتكراوەكەی. وەنابێت لە لای ئەو جوانی خۆی دەربخاتو بەتەنیا (خەڵوەت) لە لای ئەو بێت، لەبەر ئەو بەڵگە زۆرانەی كە لە سەری هەیە.

١٧. لەبەر كردنی جلو بەرگی تەسك: شوێنەواری نێگەتیڤی زۆرە لەسەر لاشەی ئافرەت:

- تووشبونی حەساسیەتی پێست.

پاڵەپەستۆ كردنی لەسەر ماسولكەكانی ناوەوە.

- نەزۆكی

- دەبێتە هۆی بەرز بوونی پاڵەپەستۆی خوێن بە هۆی تەسك بوونی ڕێگای دەمارەكان، هەروەها كاریگەری لەسەر كۆئەندامی جوولە هەیە.

١٨. لەبەر کردنی جلوبەرگی سپی: هیچی تێدا نیە بە دوو مەرج:

- بە جلو بەرگی پیاوان نەچێت لە شێوەکەو دروونەکەی.

- بەو جلوبەرگە نەچێتە بازاڕەکان، چونکە خۆ ڕازاندنەوەی تێدایە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٩. مەرجەکانی لەبەر کردنی عەبای شەرعی:

- ئەستوور بێت ژێرەکەی دەرنەخات، خەسڵەتی پێوەلکانی نەبێت.

- دەبێت داپۆشەر بێت بۆ هەموو لاشەی، بەرین بێتو پارچە پارچەکانی لەشی دەرنەخات.

- تەنها لە پێشەوە کرابێتەوەو سەر قۆڵی تەسك بێت.

- جوانکاری تێدا نەبێت کە چاوەکان بۆ خۆی ڕابکێشێت، نابێت بە هیچ شێوەیەك نیگارو نەخشو نووسینو نیشانەی لەسەر بێت.

- نابێت هاوشێوەی گاورەکان بێت یا هاوشێوەی پیاوەکان.

- دەبێت عەبایەکە لە تۆقی سەر دابنێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٠. ئەو جلو بەرگەی کە دروستە:

هیچی لەسەر نیە لە بەکارهێنانی پێچە، ئەگەر ڕوخساری داپۆشێت، " جگە لە هەردوو چاوی یان یەك چاو"، ئا بەو شێوە ئافرەتەکە بە بالآ پۆش دادەنرێتو جوانیەکەی خۆی دەرنەخستووە، وە هەر گەلێك ڕێو شوێنو عادەتی خۆی هەیە، مەگەر لە حەج نەبێ (پێچە) بەکار ناهێنێت بەڵکو ڕوخسارەکەی دەپۆشێت ( بەبێ پێچە)

«الشيخ إبن باز»

٢١. نیقابی فراوانو بەرین:

وا دەبینین بە شێوەیەکی تەواو قەدەغەیە نابێت بەکاری بێنێتو لەسەر ئافرەت پێویستە لە خوا بترسێت لەم شتە، ئەو پێچەو نیقابەی کە شتێك لە ڕوخساری، یان رومەتی، یان پێلوەکانی،یان لەوە سەرەوەتر وەکو نێو چاوانو برۆی دیار بێت، ئەوە دروست نیە لەبەر ئەو فریودانەو لە خشتە بردنەی کە تێیدایە، هەروەها دەرخستنی بەشێك لە ڕوخساریشی تێدایە.

«الشيخ إبن عثيمين وإبن فوزان»

٢٢. وەشێخ إبن جبرين دەفەرمێت:

دروست نیە بەشێوەیەك بێت هەندێك لە ڕوخساری وەکو لووتو برۆیەکانیو هەندێك روومەی دیار بێت، چونکە بە هۆیەوە تەماشا

کەرەکان فریو دەدات، وەپێویستە لەسەر روو پۆشەکەی پێچەیەك لەبەر بکات، بینینی لێ قەدەغە نەکات بۆ داپۆشینی ئەو روخسارەی کە لەوانەیە دەربکەوێت لە گەڵ داپۆشینی رووپۆش.

- **جلو بەرگی ئافرەتی موسڵمان:**

دروستە بۆ ئافرەت هەر رەنگێك لەبەر بکات ئەگەر مەرجەکانی باڵا پۆشی تێدا بێت.

**«اللجنة الدائمة»**

٢٣. منداڵی پارچەڵە قەدەغە دەکرێت لە بینینی ئافرەتو، چوونە ژوور لێی بەبێ پەردەو بەربەست، ئەگەر گومانی ئەوەیان لێ دەکرا کە لەززەت وەردەگرن لە بینینی یەکتر، یان فیتنەو ئاشوبی لێدەکەوتەوە لە لایەن منداڵە پارچەڵەکە یان لە لایەن ژنەکان، وە کاتێك منداڵەکە لە کاروباری ئافرەتان تێدەگەیشت.

**«اللجنة الدائمة»**

٢٤. روونکردنەوەی واتای فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) " أيما أمراة وضعت ثيابها في غير بيت زوجها فقد هتكت ستر ما بينها وبين الله" رواه أحمد. واتە هەر ئافرەتێك جلەکانی خۆی دابکەنێتو لەبەر بکاتەوە جگە لەماڵی پیاوەکەی ئەوە هیچ پەردەیەکی شەرمی لەنێوان خۆیو خوا نەهێشتووە. مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) خواش زاناترە.

– قەدەغەی بکات لەوەی بە ئاسانی جلەکانی خۆی دابنێت لە ماڵێکتری جگە لە ماڵی پیاوەکەی بە شێوەیەك کە عەورەتی دیار بێتو تاوانبار بکرێت بە ئەنجامدانی کارێکی خەراپو گومان لێکراو.

٢٥. بەڵام داکەناندی جلوبەرگ لە شوێنێکی بڕوا پێکراوو دڵنیا، وەکو ماڵی کەسو کاری مەحرەمەکانی بۆ گۆڕینی جلەکانی بە جلی تر، یان لەبەر هەناسەدان، یان لەبەر شتێکی تر لەم شتە دروستانەی کە دوورە لە خشتنەبردنو ئاشوب، ئەوە هیچی تێدا نیە. «اللجنة الدائمة»

## ❖ جلو بەرگە قەدەغە کراوەکان.

٢٦. بۆ ئافرەت دروست نیە جلوبەرگی تەنك لەبەر بکات، بە هەنجەتی بە ساڵاچوونی. «الشيخ إبن فوزان»

٢٧. دروست نیە بۆ ئافرەت پێچەیەك لەبەر بکات ئەگەر تەنك بوو، سەرو ڕوخساری نەپۆشێت.

٢٨. لەبەر کردنی پانتۆڵ:

دروست نیە لەبەر کردنی، چونکە لێکچوونی بە پیاوان تێدایە، چونکە ئەوانەی پانتۆڵ لەبەر دەکەن پیاون، پێغەمبەری خواش نەفرەتی لەو ژنانە کردووە کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.

«اللجنة الدائمة»

٢٩. دروست نیه بۆ ئافرەت جلێك لەبەر بكات وێنەی مرۆڤـ یان ئاژەڵی تێدا بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٠. دروسـت نیـه بـۆ ئـافرەت جلێكـی كـورت لەبـەر بكـات كـه عەورەتی یان كەمێك له عەورەتی دیار بێت.

«اللجنة الدائمة»

٣١. دروست نیه بۆ ئافرەت ئەو جلو بەرگانـه لەبـەر بكـات كـه تایبەته به گاورەكان

«اللجنة الدائمة»

٣٢. دروست نیه بۆ ئـافرەت ئەگـەر لـەلای پیـاوی بێگانـه بـوو، جلەكانی لەت لەت (قلّیش) بێت له ژێـرەوە قاچـەكانی دیـار بێـت، یان كەمێك له قاچەكانی دیار بێت، چونكه ئـافرەت هـەموو لەشـی عەورەتە.

«اللجنة الدائمة»

٣٣. دروست نیه بۆ ئـافرەت عەبایەكـەی لەسـەر شـانی دابنێـت ،كاتی دەرچوونی لەبەر ئەوەی لێكچوونی تێدایه له گەڵ پیاوان.

٣٤. دروسـت نیـه بـۆ كـچه قوتـابیەیـەكان ئـەو پۆشـاكه كـورتو تەنكانه لەبەر بكەن، كه شوێنی جـوانو دڵڕفێنـی تێـدا دیـار بێـت لەبەر چەند نمایشێكی مۆسـیقیو سـەماكردن، چـونكه ئـەو شـتە،

ئـارەزووی ئـەو پیاوانـە دەبزوێنێـت کـە لـەوێ ئامـادە بووینـە، وەهۆیەکانی خەراپەکاری دەبزوێنێتو هانی دەدات.

«اللجنة الدائمة»

٢٥. جلو بەرگی بەناووبانگ: ئەو جلەیە کە چاوەکان بۆ خـۆی رادەکێشێت، هەستی سەرسورمانو پێکەنین دەبزوێنێـت، وە ئـەو جلە نیە کە عەورەت داپۆشێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٦. ئافرەت بۆ داپۆشـینی عـەورەتی لـە بێگانـە، نابێـت تـەنها سەری بەدەستەسـرێك یـان شـتی تـر بپۆشـێت بـە شـێوەیەك کـە هەندێك قژی دیار بێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٧. دەرخستنی دەستەکانی بۆ جگە لە مەحرەمەکانی : دروست نیە، چونکە ئافرەت هەموو لەشی عەورەتە.

«اللجنة الدائمة»

٢٨. دروست نیە ئافرەت ڕوخساری خـۆی دەربخـات بـۆ پیـاوی بێگانە؟

ئافرەت با ڕوخساری خۆی دەرنەخات بەرامبەر پیاوەکان، چونکە قەدەغەیـەو نابێـت، بالاپۆشـینەکەی تـەواو نابێـت، مەگـەر بـە داپۆشینی ڕوخسار نەبێت، چونکە " کۆ کـەرەوەی جوانیـە" خـوا

فەرموویەتی " وليضربن بخمرهن على جيوبهن" فرمانی پێیان کردوە کە پێچەکەی خۆیان شۆر بکەنەوە لە سەرەوە بۆ (جیب) کە کەلێنەکەی سەر سینگیەتی، وەئەگەر لەسەرەوە شۆڕ بووبێتەوە، ئەوە ڕوخسارو سینگیشی دەپۆشێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٣٩. حوکمی لەبەر کردنی جلوبەرگی کورت کە قاچەکانی بەدیار بکەوێت؟

پێویستە لەسەر ئافرەت شتێك لەبەر بکات هەموو لەشی داپۆشێت، ئەگەر لە لای پیاوی بێگانە بوو ، بۆی دروست نیە هیچ شتێك لە لەشی یان ڕوخساری یان دەستەکانی یان قاچەکانی بەدەربخات، ئەگەر کەمیش بێت

«الشيخ إبن جبرين»

٤٠. واتای فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) " المرأة عورة فإذا خرجت إستشرفها ا لشيطان" واتە ئافرەت عەورەتە کاتێك لە ماڵ دەردەچێت شەیتان سەرکاری دەکاتو بەڕێوەی دەبات:

- ئافرەت هەتا لەماڵی خۆی بێت چاکترە بۆیو داپۆشراوترە، وەدوورترە لەوەی کە هەڵبخەڵەتیو فریو بخوات، یان خەڵکی تووشی فریودان بکات، کاتێك کە دەردەچێت شەیتان هەڵیدەخەڵەتێنێتو خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێنێت، چونکە

هۆكارێكی ئەنجامداوە، لەو هۆكارانەی كە شەیتان لەسەری زاڵ بێت، مەگەر ئەو كەسە نەبێت كە خوا ڕەحمی پێ كردووە. دەرهەق بە ئافرەت شەرع وای پێ باشە لە ماڵ بێتو نەچێتە دەرەوە، مەگەر بۆ پێویست نەبێتو بە خۆ داپۆشینێكی تەواو نەبێت بۆ هەموو لەشی، وەواز لە جوانیو بۆن لە خۆدان بێنێت، بە تایبەتی لە بازاڕەكانو سەیرانگەكانو لە شوێنە جەنجالو قەڵەباڵغەكان.

٤١. جۆرێك لە ئافرەتان لە كەسو كاری دۆزەخن.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " صنفان من أهل النار لم أرهما...... نساء كاسيات عاريات، مميلات مائلات، رؤوسهن كأسنمة البخت مائلة، لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها ...... " رواه مسلم. دوو جۆرە خەڵك هەن كەسو كاری دۆزەخنو نەشم بینیون ...... ئافرەتی خۆداپۆشەری ڕووت، خۆیان لایان داوە خەڵكیش لادەدەن، قژی سەریان كردۆتە تۆپەڵە وەكو پشتی ووشتر، ناچنە بەهەشتو بۆنەكەشی ناكەن.

٤٢. واتای " كاسيات عاريات" ووتراوە لەماناكانی.

- هەندێك لەشی داپۆشراوەو ئەویتر ڕووتە.

- چلو بەرگەكەی تەنك بێتو وەصفی ژێرەوەی بكاتو بەبێ لەبەركردنی جلێك لە ژێرەوەی.

- یان جلەکانی تەسك بێت پارچەکانی لەشی ئافرەتەکە جیا بکاتەوە، یان بەشێك لە پارچەکانی جیا بکاتەوە.

٤٣. ئاگەداری: وەهەروەها دەچێتە ناو ئەو باسە ئافرەتێك عەبایەکی بە نەقش و نیگار لەبەر بکات لە گەڵ خۆ دانەپۆشینی، وەهەروەها ئەگەر پێچە یان رووپۆشێك لەبەر بکات، تەواوی چاوەکانی یان دەوربەری چاوەکانی یان رومەتی دیار بێت.

٤٤. وەفەرموودەی (ﷺ) : "ممیلات مائلات" واتا ئافرەتەکە لە کاتی رۆیشتنەکەی بە لەنجەولار دەڕوات، ڕاست و چەپ دەکات بە قۆڵەکانی یان بە پارچەکانی لاشەی، یان لەبەر ئەوەی پێڵاوی بن بڵندی لەبەر کردووە.

٤٥. وەفەرموودەی (ﷺ) " رؤوسهن کأسنمة البخت مائلة" " البخت" جۆرێکە لە ووشتر، ئافرەتەکە ببینی سەری خۆی چوواندبێت بەپشتی ووشتر، بەشێوەیەك هەموو قژی سەری خۆی کۆ کردبێتەوەو لوولی دابێت.

«اللجنة الدائمة»

٤٦. دروست نیە بۆ ئافرەت بەرامبەر جگە لە مەحرەمەکانی خۆی شتێك لەبەر بکات ناوەندی لەشی توند بکات بەهیچ جورێك، جا ئەم شتە بە قایش بچێت یان شتیتر بێت ، وەجیاوازی نیە

ئەگەر لەناو نوێژ بێت یان لە دەرەوەی نوێژ، چونکە قەبارەی کۆمی بەدیار دەخات‌و پارچەکانی لەشی دیار دەکەوێت.

**«الشيخ محمد بن إبراهيم»**

٤٧. دروست نیە بۆ ئافرەت لە حاڵەتی هەستانەوەی جلەکانی وێك بێنێنەوە چونکە پارچەکانی لەشی بەدیار دەکەوێت.

**«الشيخ محمد بن إبراهيم»**

٤٨. ئەو جل‌و بەرگانەی کە نووسینی ئینگلیزی لەسەر هەیە:

دروست نیە ئەم جل‌و بەرگانە لەبەر بکرێت کە نووسینی ئینگلیزی لەسەر هەیەو نووسینەکەی عەرەبی نیە، مەگەر دوای ئەوەی مرۆڤـــ دڵنیا بێت لە نووسینەکە ، دڵنیا بێت کە نووسینەکە شتێکی تێدا نیە، کە شەرەف لە کەدار بکات، یان شتێکی تێدا بێت کە گەورەکردنی گاورەکانی تێدا بێت.

**«الشيخ إبن عثيمين»**

٤٩. لەبەرکردنی جاکێتی پێستی.

ئەو پێستەی کە دیباغە کراوە لە پێستی ئەو ئاژەڵ‌و مردوانەی کە بەسەر بڕین حەلال دەبن، وەکو ووشترو مانگا ئەوە دروستە بەکارهێنانیان لە هەموو شتێك.

٥٠. بەڵام پێستی سەگ‌و بەرازو هاوشێوەکانی کە حەلال نابێت خواردنی بە کوشتنەوەو سەر بڕینی ، ئەوە لە پاکبوونەوەی ب

"دیباغ" ناکۆکی هەیە لەنێوان زانایەکان، چاکتر وایە واز بێنێت لە بەکارهێنانیان.

«الشيخ إبن باز»

٥١. راپۆرتە پزیشکیەکان دەڵێن: زۆربەی ئەو ئافرەتانەی تووشی شێرپەنچەی پێست دەبن لەو ئافرەتانەن کە لاشەی خۆیان دەدەنە بەر خۆر بۆ ئەوەی بتوانن رەنگی برۆنزی بەدەست بهێنن.

٥٢. مەلەوانی کردنی ئافرەت لە جێگای تایبەتو بەجلوبەرگی تایبەت:

ئەوەی پێویستە لەسەر ئافرەت نێوان ناووکو چۆکی داپۆشێت بە شتێکی ئەستور، تەنك نەبێت، بەرین بێتو تەسك نەبێت، قەبارەی عەورەتی تێدا دیار نەبێت، ئەگەر لە نێوان ئافرەتان بوو.

«اللجنة الدائمة»

٥٣. حەزی جیابوونەوەی هەبێت لە جلو بەرگ لە خەڵکیتر:

ئەگەر مەبەستی لەم شتە، خۆ بەزل زانینو فیز بێت لەسەر خەڵکیتر دروست نیە، بەڵام ئەگەر لە بەر جوانیو خۆڕازاندەوەی رێپێدراو بێت دروستەو دەبێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٤.  لەبەر کردنی ئەو جلو بەرگانەی کە ئایاتی قورئانی، یان دوو ووشەی شایەدومانی لەسەرە: هیچی لەسەر نیە لەبەریان بکات، بەڵام دەبێ رێزی نووسراوەکان بگرێت لەوەی سوکایەتیان پێبکات، نابێت پێیان بخەوێت، یان لەسەر ئەو شوێنە دابنیشێت کە ناوێك لەناوەکانی خوای گەورەی لەسەرە، وەنابێت پێیان بچێتە گەرماو.

«اللجنة الدائمة»

٥٥.  خەرج کردنی پارەی زۆر لە بۆ جلو بەرگو جوانکاری، خەرج کردنی ئەو پارە زۆرە لەبەر رۆیشتنی لە گەڵ دابو نەریتی دەوروبەری، وەتەنها بۆ خۆ هەڵکێشان، ئەوە هەموو لەو زێدەرەوی‌و دەستبڵاوییەیە کە لێمان قەدەغە کراوەو زایەع کردنی پارەیە، پێویستە لەسەر موسڵمان مام ناوەند بێت لەم شتە، رۆژی قیامەت دەربارەی ئەم پارەو پولانە لێمان دەپرسنەوە، لەکوێ پەیدات کردووەو لە چی خەرجت کردووە.

«الشيخ إبن فوزان»

٥٦.  لەبەر کردنی پانتۆڵ لەلای پیاوەکەی:

ئاساییەو هیچی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٧. حوكمی خاوەن ئەم قسە: ئافرەتی ڕەسەن‌و ئابڕودار (شریف) پێویستی بە بالاپۆشین نیە، ئەوە بانگەشەیەکی بەتاڵەو دژی قورئان‌و سوونەیەو دژی عەقل‌و سروشتی مرۆڤایەتی‌یە. چونکە پیاوان دڵیان بە هەموو ئافرەتێکی سفور بەند دەبێت‌و ئەزیەتیان دەدەن هەرچەند ئافرەتەکە پاك بێت. وەلەوانەیە شەیتان لە خشتەی ببات لەبەر زۆر هەوڵدانی خەراپەکاران، وەئەگەر ئافرەتەکە ئابڕودار بێت ئەو ئابروداریە زیاتر دەبێت کاتێك خۆی بەجلی شەرعی بالاپۆش دەکات.

«الشیخ إبن عثیمین»

٥٨. جوانی دەرخستن لە وولاتانی گاوران:

خۆ دەرخستن (سفووری) دروست نیە لە وولاتانی گاورەکان، بەڵکو دەبێت خۆی بالاپۆش بکات لە پیاوانی بێگانە جا جیاوازی نیە موسڵمان بن یان گاور.

«الشیخ إبن باز»

٥٩. لەبەر کردنی شتی کورت لە بەردەم منداڵەکان:

دروست نیە بۆ ئافرەت شتی کورت لەبەربکات لەبەردەم منداڵەکانی یان مەحرەمەکانی، وەنابێت هەموو جوانیەکی خۆی دەربخات، مەگەر ئەوەندە نەبێت کە باوەو عادەتیە، ئەوەی

بەدەرخستنی هیچ فریودانێکی تێدا نیە. وەدەبێت تەنها لای پیاوەکەی کورت لەبەر بکات.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٠. حوکمی لەبەرکردنی جلوبەرگی تەسك یان تەنك لەلای ئافرەتان؟

دروست نیە، چونکە ئەو شتە دەبێتە خورەوشتو دابو نەریتێکی باو، خەڵکیش جێبەجێی دەکات، بەشێوەیەك ژنەکەش هۆگری ئەم جلە دەبێتو پاکی دادەنێت، لەبەر کردنی ئەو جلو بەرگە پانو بەرینەی لا گران دەبێت، چونکە لەسەری ڕا نەهاتووە.

«الشيخ إبن جبرين»

## (بۆ چی ئافرەت جوانی خۆی دەردەخاتو بەدوای جلوبەرگی بێ ئابڕوویی دەگەڕێت)

- لاوازی ئیمانو نەترسان لەخوای ڕەحمان:

ئافرەت ئەگەر سزای خوای لەیاد کرد لەبەر سەرپێچی فرمانەکەی، ئەوە ئەو شتەی بیەوێت دەیکات لەبەر شەیتان لەسەر زاڵ بوونیو دڵ نەرمی(لەبیروباوەڕی) ، لەبەر ڕۆیشتنی دوای ئارەزووەکانی ئەو دەروونەی، کە هەردەم فرمان کەرە بە خەراپە، وەلەبەر ئەوەی کردەوە خەراپەکانی دەڕازێندرێتەوە لە لایەن شەیتانەکانی مرۆڤو جنۆکەوە: بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " إطلعت في النار فرأيت أكثر أهلها النساء " رواه البخاري واتە سەیرێکی دۆزەخم کرد بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتن.

- خەراپی پەروەردەکەی:

ئەگەر بنەماڵەو خێزان پەروەردە کردنی ڕۆڵەکانی لەسەر چاکە پشتگوێ خستو بایەخی پێ نەدا ئەوە لەڕێی گومرایی دەڕۆن. چونکە کچ پەروەردەی خۆی لەکەسو کاری وەردەگرێت، کاتێک دەبینێ دایکی جوانی خۆی دەردەخاتو سفورە ئەویش وادەکات.

- هۆکارەکانی ڕاگەیاندن.

لەگەڵ هەمە جۆر بوونی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی تازە، دوژمنانی خورەوشتی جوان هەموو هەوڵو توانای خۆیان خستۆتە گەڕ، بۆ ئەوەی ئەم ڕاگەیاندنە بۆ خزمەتی مەرامە گڵاوەکانیان بەکار بێنن، وەیەکێك لە هەرە مەرامە گرنگەکان : دەرهێنانی ئەو مرواریە پارێزراوەیەو فڕێدانیەتی بۆ ناو چڵکاوەکانی نزمیو هیچ پووچی.

-چاولێکردن:

لەو ڕۆژگارە شتی سەرنج ڕاکێشەرو لە خشتەبەرو ئاشوب، گەلێك زۆر بوونە، هەندێك لە ئافرەتان خوویان بە چاولێکردنو خۆ وەگەڵدان گرتووە، بەشێوەیەکی شێتانە، وە بە تایبەتی چاولێکردنی ئەو ئافرەتە ڕۆژ ئاواییانەی کە لە ئەخلاقو خورەوشتی باش هەرەسیان هێناوە، ئەو ئافرەتانەی هیچ غەمێکیان نیە، تەنها دەرخستنی جوانیەکانی لەشیان نەبێت، بەبێ ئەوەی چاودێری هیچ ڕەوشتێکی جوان بکەن.... جا لێرە ئافرەتی موسڵمان دێت، لاسایی جلو بەرگو خو ڕەوشتە نزمەکانیان دەکاتەوەو چاوی لێ دەکات .

-برادەری خەراپ: ووتراوە " الصاحب ساحب" واتا برادەر ڕاکێشەرە بۆ خورەوشتی باش یان خەراپ.

**هەڵبژێراوە لە کتێبی " التبرج والأحتساب عليه"**

# ﴿ ئافرەت و نوێژ ﴾

## ❖ ٩٤ وەڵامی تێدایە

**ئەوەی پەیوەستە بە حوکمەکانی نوێژ**

**١. هیچ جیاوازیەك نیە نێوان نوێژی پیاوو ژن.**

ئەو جیاوازیانەی هەندێك لە زانایەکان باسیان کردوە هیچ بەلگەیەکی لەسەر نیە، حوکمی ئەو فەرموویە گشتییە " صلوا کما رأیتمونی أصلي" واتە نوێژ بکەن وەك چۆن من دەبینن نوێژ دەکەم.

**«الشیخ إبن باز»**

سووننەت وایە ئافرەت وەکو پیاو نوێژ بکات لە کڕنووشەکانی و سەجدەکانی و خوێندنی قورئانی بە دەنگ.

**٢. ئەگەر ئافرەت نوێژ بکات و شتێکی کەم " لە عەورەتەکەی دیار بێت، وەکو قاچ و پێیەکان و سەری یان هەندێکی " نوێژەکەی دروست نیە.**

**«الشیخ إبن باز»**

٣. ئـافرەت هـەمووی عەورەتــە لــە نوێــژ، تــەنها ڕوخــسارو دەستەکانی نـەبێت، بـەڵام ئەگـەر یـەکێکی بێگانـەیان لا بێـت ئەوە دایدەپۆشێت.

«اللجنة الدائمة»

## ❖ ئایا ئافرەت نوێژ بەدەنگی بەرزو ئاشکرا بکات؟

٤. خوێنـدن بـە دەنگـی ئاشـکراو بـەرز: سوونـنەتە بـۆ ئـافرەت بەدەنگی ئاشکراو بەرز بخوێنێت لە نوێـژەکانی، جـا جیـاوازی نیە نوێژەکە فەرز بێت یان سووننەت،بەڵام دەبێت لەو نوێژانـە بێت کە بە دەنگەو ئاشکرایە، -وەکـو شـەو نوێـژ- وە نابێت پیاوی بێگانە گوێی لێ بێت، نەوەك تووشی ئاشوبـو فریودان بێت بە دەنگەکەی، یان لە خەڵکی بشوێنێتو تێك بدات.

«الشیخ إبن فوزان»

٥. بەڵام لە نوێژەکانی ڕۆژ : ئەوە بە نهێنـی دەخوێنێت، چونکە لە نوێژەکانی ڕۆژ خوێندنەکە نهێنیە، ئەوەندە دەنگی خـۆی هەڵدەبڕێت کە خۆی گوێی لێ بێت.

«الشیخ إبن فوزان»

٦. قەدەغەیەو حەڕامە لەسەر ئافرەت جلو بەرگی وا لەبەر بکـات وێنە، یان خاچی لەسەر بێت، نوێژەکەی بەو شـتانە دروسـتە، بەڵام تاوانبار دەبێـت.

٧. پژمینی هات کاتێك لەناو نوێژە.

سوپاسی خوا دەکات بە نهێنی لە نێوان خۆیو خوا، وەدەنگی خۆی هەڵنابڕێت لەکاتی سوپاسکردنەکە.

«الشیخ إبن فوزان»

٨. بەکارهێنانی هێما (الإشارة) لەو ناو نوێژدا.

نوێژەکەی پێی بەتاڵ نابێت. نموونەکەی، پرسیارکەرێك پرسیاری لێ بکات، تۆش لە ناو نوێژدا سەرت جولاند، وەکو هێمایەك بۆ ڕازی بوونت، ئەوە هیچی تێدا نیەو ئاسایییە، جا یەکسانە چ سەرت بەکار بێنیت یان دەست.

«الشیخ إبن باز»

٩. جولە کردنی زۆر لە ناو نوێژدا:

ئەگەر نوێژکەر هاتە ئەو بڕوایەی کە جوڵەی بێ سوودی زۆرەو هەمووش لەسەر یەکترە، ئەوە لەسەری پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، ئەگەر نوێژەکەی فەڕز بوو، وەلەسەری پێویستە پەشیمان ببێتەوەو تەوبە بکات لەم کردەوە. بەڵام ئەو ڕایەی کە بە سێ جوڵە سنوورداری دەکات ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

«الشیخ إبن باز»

١٠. نوێژ کردنی ئافرەت بەرامبەر ئاوێنە یان وێنە.

پێویسته لەسەر ئافرەت لە هەموو شتێك دوور بكەوێتەوه كە لە نوێژەكەی بێ ئاگای دەكات، یان لێی تێك دەدات، نابێت لە شوێنێك نوێژ بكات كە وێنەی هەڵواسراو یان دانراوی لێ بێت......" لەو نەخشەو نیگارانەی سەرنجی نوێژكەر ڕادەكێشێن‌و نوێژەكەی لێ تێك دەدەن.

١١. ئەنیشك دانانی لەسەر زەوی لە كاتی سەجدە بردن.

سوونەت وایە كە ئەنیشكەكانی بەرز بكاتەوە، جا جیاوازی نیە چ نوێژی فەرز بێت یان سوونەت، وە پاڵ دەدات بەناو لەپەكانی لە كاتی سەجدە بردن.

«الشیخ إبن باز»

١٢. ئەگەر خوێن لە لووتی نوێژكەر هاتە دەرەوە.

ئەگەر كەم بوو چاوپۆشی لێ دەكرێت‌و لادەدرێت بەدەستەسڕێك یان بە شتیتر، بەڵام ئەگەر زۆر بوو نوێژەكە دەبڕێت‌و خۆی خاوێن دەكاتەوە لێی، پاشان سەر لە نوێ، لەسەرەتاوە نوێژەكەی دەست پێ دەكاتەوە

«الشیخ إبن باز»

١٣. ئەگەر زەنگی دەرگا لێ دراو ئافرەتەكە نوێژی دەكرد.

- ئەگەر نوێژەكەی سوونەت بوو، ئەوە بوار تێدا فراوانە، لاری نیە ئەگەر نوێژەكەی بپچڕێنێت‌و بزانێت كێ لە دەرگا دەدات.

- بەلاّم ئەگەر لە نوێژی فەرز بوو نابێت پەلە بکات، مەگەر شتێکی گرنگ هەبوو ترسی فەوتانی هەبێت، وەئەگەر دەکرا ئافرەتەکە بە چەپلّە لێدان ئاگەداری بکاتەوە، ئەوە باشە.

«الشيخ إبن باز»

١٤. ئەو دوو گیانەی کە بەردەوام لەبەر هاتنە خوارەوەی میز دەنالێنێت.

واز لە نوێژ ناهێنێت، بەلّکو لەسەری پێویستە دەستنوێژ هەلّبگرێت بۆ هەموو نوێژێك وەکو ئەوەی تووشی (استحاضة) بووبێت، وەبە پێی توانای خۆی دەپارێزێت بە پەمۆیەك یان شتیتر، وە نوێژەکانی لەکاتی خۆی دەکات.

«الشيخ إبن باز»

١٥. نوێژکردن لە شوێنێك کە وێنەی لیّ بێت واتا وێنەی گیانلەبەر.

نوێژەکە دروستە، ئەگەر موسلّمان بەشێوەیەکی شەرعی ئەنجامی دا، بەلاّم پەیدا کردنی شوێنێك کە هیچ وێنەی لیّ نەبێت، ئەوە باشترەو چاکترە.

«الشيخ إبن باز»

١٦. نوێژکردن بەڕوو نەکردنە ڕووگە بە نەزانی:

ئەگەر لە بیابان بوویێت و هەوڵیدابێت، دوای هەوڵدانەکە نوێژەکەی کردبێت، نوێژەکەی دروستەو گێڕانەوەی لەسەر نیە.

بەڵام ئەگەر لە ئاوەدانی بێت، لەسەری پێویستە بیگێڕێتەوە، چونکە دەتوانێت پرسیار لە ئاراستەی رووگە بکات.

«الشيخ إبن باز»

١٧. چاکتر وایە بۆ ئافرەتان نوێژی شێوان دوا بخەن.

ئەگەر بەبێ ئەزیەت بۆیان ڕەخسا، بەڵام نابێت دوای بخەن بۆ دوای نیوە شەو. «الشيخ إبن باز»

١٨. دزی کردن لە نوێژ.

لە تاوانە هەرە گەورەکانی دزی، دزی کردنە لە نوێژ، پێغەمبەر(ﷺ) "أسوأ الناس سرقة الذي يسرق من صلاته ، قالوا يا رسول الله كيف يسرق من صلاته ؟ قال : لا يتم ركوعها و لا سجودها" رواه أحمد. واتا خەراپترینی خەلکی ئەو کەسەیە دزی لە نوێژ دەکات. ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا. چۆن دزی لە نوێژ دەکرێت؟ فەرمووی کڕنووشەکان و سەجدەکانی تەواو نابات

١٩. خواردنەوەو کپ کردنی باوەشك بە تایبەتی لە ناو نوێژ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " إذا تثائب أحدكم في الصلاة فليكظم ما استطاع، فإن الشيطان يدخل" رواه بخاري واتە ئەگەر یەکێکتان باوەشکی هات لە ناو نوێژ، با ئەوەندەی توانای هەیە

بیگێرێتەوەو بیخواتەوە، چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوەی. ئەویش بە دەستە خستنە سەر دەمی.

٢٠. ئایا ئافرەت نوێژی ئافرەتێکی تر دەبڕێت ئەگەر بە پێشیدا بڕوات؟ بەڵێ نوێژی دەبڕێت، بەڵام ئەگەر بەدوای پارێزەرەکەیدا(سترە) بڕوات، ئەگەر ئافرەتەکە پارێزەری (سترە) هەبوو، یان لە دوای بەرماڵەکەی بڕوات، ئەگەر لەسەر بەرماڵ نوێژی دەکرد، یان لە دوای شوێنی سەجدەکەیدا بڕوات، ئەگەر ئافرەتەکە پارێزەر (سترە)ی نەبوو بەرماڵیشی نەبوو ، ئەوە هیچ زیانی نیەو هیچ کاریگەری نیە لەسەر نوێژەکەی.

❖ ئاگەداری: بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە لەدوای ئیمام نوێژ بکات ئەوە هیچ شتێك نوێژکەی ناپچڕێنێت چونکە پارێزەرەکەی ئیمام پارێزەری (سترە) ئەوانی دوای خۆشیتی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢١. ئەگەر ئافرەتەکە لە ناو فڕۆکەدابوو ، لەوە ترسا نوێژەکەی بچێت نوێژەکەی دەکات، ئەگەر چی جلەکانیشی، پیس بێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٢. نوێژ کردن لەناو فڕۆکە.

ئەگەر کاتی نوێژ داهات و فڕۆکەکە بەردەوام بوو لە فڕین، لەفەوتانی کاتی نوێژەکەش دەترسا پێش نیشتنەوەی لە یەکێك

لـه فرۆكەخانـەكان، لەسـەری پێویـست دەبێـت لـە كـاتی خـۆی نوێژەكە بكات، بەپـێی توانای لە كڕنوش‌و سـەجدەكان رووەكـەی بەرامبەر رووگە بێت.

٢٢. بەلام ئەگـەر زانـی فڕۆكەكـە دەنیـشێتەوە پـێش ڕۆیـشتنی كـاتی نوێژەكـە، بـە ئەنـدازەی ئـەوەی بتوانێـت نوێژەكـەی تێـدا بكات، یان نوێژەكە لەو نوێژانە بێت بتوانێت كۆی بكەیەوە لە گەڵ نوێژی‌تر، وەكو نوێژی نیوەڕۆ لەگەل عەسر، یان مەغریب لـە گـەڵ نوێژی شێوان، وەزانی فڕۆكەكە دەنیشێتەوە پێش ڕۆیشتنی كاتی دووەم بـە ئەنـدازەی ئەوەنـدەی بتوانێـت نوێژەكـەی تێـدا بكـات، ئەوە زۆربەی زانایەكان بۆ ئەوە دەچن كە دروسـتە لـە نـاو فڕۆكـە ئەنجامی بدەی.

«اللجنة الدائمة»

٢٤. منداڵ هەلگرتن لە ناو نوێژ:

هیچی تێدا نیە، ئافرەت منداڵەكەی هەڵبگرێت بە مەرجی ئەوەی.

أ. ئەگەر خاوێن بوو.

ب. وەپێویست بوو هەڵبگیرێـت، لەبەر گریانەكەی، یـان ئەگـەر هەڵینەگیرێت بێ ئاگایی بكات لە نوێژ.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٥. حوكمی مانەوەی ئافرەتێك لەگەل پیاوێكی نوێژ نەكەر.

دروست نیە بۆی لە گەڵی بمینێتەوە هەتا ئەگەر منداڵیشی لێ هەبێت. وەدروست نیە بۆی، خۆی بداتە دەستی چونكە گاورە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٦. لەكاتی نوێژ كردنی لە حەرەمی مەكە دروستە ئافرەت نوێژەكەی بپچڕێنێت بۆ ئەوەی فریای منداڵەكەی بكەوێت؟

ئەگەر بۆی ڕەخسا پارێزگاری لە منداڵەكەی بكات بەبێ پچڕانی نوێژكەی باشە ئەگەر نا ، با نوێژەكەی بپچڕێنێت لە ترسی منداڵ ونبوونی.

«اللجنة الدائمة»

❖ ئەگەر تێپەربووەكە لە پێشت، یان لە نێوان خۆت و سوترەكەت ئافرەت بێت، ئەوە نوێژەكەت دەپچڕێت، مەگەر لە مزگەوتی حەرام (مەككە) بێت، لەوێ چاوپۆشی لێ دەكرێت چونكە ناتوانرێت كۆنترۆل بكرێت. «اللجنة الدائمة»

٢٧. ئەگەر ئافرەتی خوێندكار بچێتە ناو ژووری وانە ووتنەوە لەگەڵ هاتنی نوێژی نیوەڕۆ، وانەكەش دوو كاتژمێر بەردەوام بێت، چی بكات؟

بەدوو کاتژمێر نوێژی نیوەڕۆ ناڕوات، چونکە کاتی نیوەڕو لە لادانی خۆر دەستپێدەکات لە تاقی ئاسمان تا نوێژی عەسر، ئەو کاتەش لەدوو کاتژمێر زیاترە.

- ئەگەر گونجا لەکاتی وانەکەش بیکات ئەوە چاکترە.
- وەئەگەر وا رێککەوت وانەکانەی تەواو نەدەبوو مەگەر بە چوونە ناو کاتی عەسر، وەچوونە دەرەوەی لە وانەکە زیانی پێ دەگەیاند یان گران بوو، ئەوە لەم حاڵەتە بۆی دروستە هەردوو نوێژی نیوەڕو عەسر کۆ بکاتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٨. ئافرەتێکی نەخۆش بە دانیشتن نوێژ دەکات ئایا سەرین دابنێت بۆ سەجدە لەسەر بردن؟

ئەو سەرین دانانە یان هەر شتێکی تر لەرێو شوێنو سووننەتی پێغەمبەر(ﷺ) نیە، بەڵکو لە کەراهەت نزیکترە، بەڵام ئەو بەسەری ئیشارەت دەداتو شۆڕ دەبێتەوە، بۆ سەجدەکانی زیاتر لە کڕنوشەکانی.

٢٩. لە کاتی هەستانەوەش بە چوار مەشقی دادەنیشێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٠. نوێژ دواخستن بەهۆی نەخۆشی دروست نیە.

دروستە بۆ ئافرەت بەپێی توانای خۆی نوێژ بکات، بەراوەستان یان بە دانیشتن یان بەپاڵ کەوتن، وەبۆی هەیە دوو نوێژ (نوێژی نیوەڕۆ عەسر) کۆ بکاتەوە لەکاتی یەکێکیان وەنوێژی مەغریب و عیشا لەکاتی یەکێکیان.

«اللجنة الدائمة»

٣١. بیرو هۆش ڕۆیشتن لەکاتی نوێژ کردن.

نوێژەکە دروستە بەڵام پاداشتەکەی کەم دەبێتەوە بەقەد ئەوەی کە بیرو هۆشت ڕۆیشتووە.

- بێویستە لەسەرت بە گوێرەی توانات خەیاڵو دالغە لێدان لە خۆت دووربخەیەوە هەتاکو ترست بۆ فەراهەم دێت لە ناو نوێژەکە.

- ئەویش بەوە دەکرێت خۆت سەرقاڵ بکەی بەو قورئانەی کە دەیخوێنیت.

- هەست کردن بە گەورەیی و چاودێری خوا بکەی بە پێی توانا.

- وەزۆر پشتی خۆت بەخوا ببەستە لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی خوا.

«اللجنة الدائمة»

٣٢. ئەگەر نوێژێکی لە یاد چووبێت دوای نوێژەکە نوێژێتری کرد ئایا هەموو نوێژەکانی بگێڕێتەوە؟

نەخێر لەسەری نیە هەموو نوێژەکانی بگێڕێتەوە، بەڵکو تەنها ئەو نوێژە دەگێڕێتەوە کە لە یادی کرد بوو.

«اللجنة الدائمة»

٣٣. ئەگەر ئافرەتەکە نوست تاوەکو کاتی خۆر هەڵاتن، ئایا دوو ڕەکعەتی بەیانی بکات یان نەیکات؟

ئەوەی خەو لەسەری زاڵ بوو، هەڵنەستا تا وەکو خۆر هەڵات، با نوێژی بەیانی بکات ،هەروەك چۆن پێشتر دەیکرد، وەسوونەتی بەیانیش پیش نوێژەکە بکات.

«اللجنة الدائمة»

٣٤. ئایا دروستە بۆ پیاو ئافرەتەکەی قەدەغە بکات لە چوونە مزگەوت ؟

نەخێر بۆی دروست نیە قەدەغەی بکات، ئەگەر هاتوو ئافرەتەکەی داپۆشراو بێت، هیچ شوێنێك لە لاشەی دیار نەبوو.

«اللجنة الدائمة»

٣٥. دروستە حەیزدار بچێتە مزگەوت؟

حەرامە ئافرەتی حەیزدار لە مزگەوت دابنیشێت، یان لەو ڕەشماڵەی بۆ نوێژی ئافرەتان دادەنرێت لە نزیك مزگەوت، چونکە

ئەویش مزگەوتە، وەتێپەڕبوون بەو شوێنانە هیچی تێدا نیەو دروستە.

«اللجنة الدائمة»

٣٦. هۆیەکانی ترسان (خشوع) لە نوێژ:

- دەبێت بزانێت نوێژ قسەکردنو موناجاتە لە گەڵ خوا، با گەورەییو ترسی خوا لای نوێژکەر ئامادە بێتو هەستی پێ بکات.

- لەسەرخۆ بوونو پەلە نەکردن لە نوێژ.

- لێکدانەوەو ووردبوونەوە لە ئایەتە خوێندراوەکان، وێردەکانی تری نوێژو تێکەڵ بوون لە گەڵیان.

- خوێندنەوەی ئایەتەکان بە شێوەیەکی رێكو پێكو جوان، بە ئاوازێکی خۆش،وە دەنگ خۆش کردن پێیان.

- سەیرکردنی شوێنی سەجدەو ئاوڕ نەدانەوە.

- دوورکەوتن لە هەموو شتێك کە نوێژکەر سەرقاڵ دەکەن.

٣٧. چاو نوقاندن لەکاتی نوێژ:

لە شتە نا پەسندەکانی نوێژە (مکروهات)، ئەو چاو نوقاندنە بە کردەوەی مەجوسیەکان دەچێت، لە کاتی ئاگر پەرستنیان چاویان دەنوقێنن. وەگوتراوە ئەوە کردەی یەهودیەکانە لە نوێژەکانیان، وەئیسلام رەشکەرەوەی هەموو دینەکانی پێشووە.

٣٨.   ئاورِ دانەوە بەلای چەپ و ڕاست بەبێ پێویست بوون.

لە شتە نا پەسندەکانی نوێژە (مکروهات) چونکە کاتێك مرۆڤ هەڵدەستێ نوێژ دەکات خوای پەروەردگار بەرامبەر ڕوخساریتی، ئەو ئاوڕدانەوەیە خورەوشتێکی خەراپە چونکە پشت کردنە لە خوای گەورە.

❖ **بەڵام ئاورِ دانەوە بۆ کاری پێویست نا پەسند نیە.**

٣٩.   چۆنیەتی فوو کردن کاتێك تووشی خورپەخورپی(وەسوەسە)ی شەیتان دەبیت لە نوێژدا.

فوو کردن: فوو کردنێکە لە گەڵ هەندێك تف، واتە فوو کردنێکی تێکەڵە بە شتێکی کەم لە تف، وەئەگەر خورپە خورپەکە (وەسوەسە) هاتەوەو دووبارە تووشی بوو، ئەوە لەسەری پێویستە پشت بەستن بەخوا (إستعاذة) تازە بکاتەوە ئەگەر بە دڵیش بێت و سێ فوو لە لای چەپی بکات و پشتی خوی بە خوا ببەستێت لە شەیتان.

«الشيخ إبن جبرين»

٤٠.   منداڵەکانی ئەو ئافرەتەی کە نوێژ ناکات.

ئەو منداڵانەی لە پیاوێکی نوێژنەکەر یان ئافرەتێکی نوێژنەکەرە، ئەوە منداڵی خۆیانن و بۆ ئەوانیش ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە، لەبەر هەبوونی گومانی مارەکردن.

«اللجنة الدائمة»

٤١.   یەکێك هەست بەوە بکات کە میزی دێتە خوارەوە لەناو نوێژدا، ئایا نوێژەکەی بە تاڵ دەکات؟

ئەم هەستکردنە دەست نوێژ بەتاڵ ناکاتو نوێژیش بەتاڵ ناکات، چونکە تەنها خورپە خورپی شەیتانە، مەگەر لای روون بێتو دڵنیا بێتو کە میزی لیّ هاتووتە دەرەوە.

«الشيخ إبن باز»

٤٢.   ئەگەر لە یادی کرد بێت ئایا فاتیحەی خوێندوە یان نا ، چی بکات؟

ئەگەر ئەو گومانە لەسەری زاڵ بوو ،وەڕاهاتبوو بخوێنێت ئەوە ناپەسندە (مەکروهە) دووبارە بکاتەوە، پاشان ئەگەر دووبارەی کردەوە بۆ زیاتر دڵنیا بوون، ئەوە پێویست ناکات سەجدەی سەهو ببات، وەئەگەر بردی هیچ نیەو ئاسایە.

«الشيخ إبن جبرين»

٤٣.   ئایا دروستە بۆم نوێژ بکەم کاتێك من هەست بە ژانەکانی منداڵبوون دەکەم؟

ئافرەت نوێژی خۆی دەکات لە کاتی پاکبوونەوەی لە حەیز یان نیفاس، بەلاّم ئەگەر خوێنی بینی پێش منداڵ بوونی بە ڕۆژێك یان زیاتر یان کەمتر، ئەوە بۆ نیفاس دەگەڕێتەوە، ئەوە نوێژی تێدا

ناکات، بەڵام ئەگەر خوێن نەبینێت، ئەوە بێ گومان نوێژ دەکات، ئەگەرچی هەست بە ژانەکانی منداڵبوون بکات، هەروەك چۆن نەخۆش نوێژی خۆی دەکات کاتێك هەست بە ژانی نەخۆشیەکەی دەکات، چونکە لەبەر ئەو ژانە نوێژەکەی لەسەر لاناچێت تاوەکو هۆش و بیری لای خۆی بێت.

هاتنە دەرەوەی با لە پێشەوەی ئافرەت نوێژ بەتاڵ دەکات؟

هاتنە دەرەوەی با لە پێشەوەی ئافرەت دەستنوێژ ناشکێنێت.

«اللجنة الدائمة»

٤٤. ئەگەر ئەو ئافرەتەی بەردەوام ئاو لێی دێتە خوارەوە دەستنوێژ هەڵبگرێت بۆ نوێژی فەرز، ئایا بۆی دروستە نوێژی سوننەت بکات و قورئان بخوێنێت؟

بۆی هەیە چەند نوێژی (فەرزو سوننەت) دەیەوێت بیکات، وە ئەوەندە قورئانەی دەیەوێت بخوێنیت تا دەچێتە ناو نوێژەکەی تر.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٥. ئافرەت و نوێژ کردنی لە دوو شوێنە پیرۆزەکە چاکترە یان لە ماڵی خۆی؟

سەبارەت بە مەککە: ئەو چەندەها پاداشتە بەدەست دێت لە هەموو شوێنێکی مەککە، کاتێك ئافرەتەکە لە مەککە لە ماڵی خۆی نوێژ کرد، ئەو پاداشتە چەندینەی بۆ هەیە إن شاء الله

بەڵام سەبارەت بە مەدینە: ئەو پاداشتە چەندینە تایبەتە بە مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام ئافرەت ئەگەر لە ماڵی خۆی نوێژ بکات لە مەدینە لەبەر فرمانی پێغەمبەر (ﷺ) ،ئەوە ئومێد وایە ئەو پاداشتە زۆرەی دەست بکەوێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٦. ئایا ئافرەت نیقاب بکات لە کاتی نوێژکردنی؟

لە کاتی نوێژ کردن ئافرەت نیقاب بکات پەسند نیە (مکروهە)، چونکە نیقابەکە دەکەوێتە نێوان نێوچاوو لووتی نوێژکەرەکە.

«كتاب المغني»

٤٧. ئەگەر دەرچوونی ئافرەت بۆ نوێژی تەراویح زایەع بوونی هەندێك لە مافەکانی ماڵی لێ بکەوێتەوە، ئەگەر کەمیش بێت، حوکمی دەرچوونەکەی چییە؟

لە ماڵەکەی دەرناچێت، لەماڵ دەمێنێتەوەو کارەکانی ماڵەوە ئەنجام دەدات، چونکە هەڵسانی بە کارو باری ماڵەوەی واجبەو دەرچوونی بۆ مزگەوت رێپێدراوە، ئەگەر هیچ زیانێکی لێ نەکەوێتەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٨. حوكمی داپۆشینی هەر دوو دەستو پێیەكانی لە كاتی نوێژدا؟

پێویستە دایانپۆشێت لەناو نوێژدا لە هەموو حاڵەتێك، ئەگەر چی پیاویشی لا نەبێت، چونكە ئافرەت هەموو لەشی عەورەتە لە ناو نوێژ تەنها ڕوخساری نەبێت، ئەگەر پیاوی بێگانە لەوێ ئامادە نەبوو.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٩. بەردانەوەی قژ بۆ ئافرەت دروستە بۆ سەر نێو چاوانی؟

هیچی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر لایبداتو سەجدەكەی لەسەر زەوی ببات ئەوە چاكترە.

«الشيخ إبن باز»

٥٠. ئاوێكی سپیم لێ دێتە خوارەوە هەندێك جار لە كاتی نوێژ كردن؟

ئەو ئاوە پیسە حوكمی میزی هەیە، دەستنوێژ پێویست دەكات دوای چوونە سەر ئاو (ئاودەست،) بەڵام خۆ شوشتن واجب ناكات، ئەگەر هاتنە دەرەوەكەی بەبێ لەززەت بێت، وەپێویستە ئەو شوێنەو جلوبەرگەی بەریكەوتووە بیشوات.

«اللجنة الدائمة»

## ئەو شتانەی پەیوەستە بە گێڕانەوەی نوێژە ڕۆیشتووەکان

٥١.   ئـەو ئافرەتـەی پـێش نوێـژی بـەیانی پـاك دەبێتـەوە ئایـا دروستە نوێژی مەغریبو عیشا بکات؟

ئەگەر ئافرەتی حەیزدارو نیفاسدار پێش نوێـژی بـەیانی پـاکبۆوە، لەسەری پێویستە نوێژی مەغریبو عیشا بکات.

«الشیخ إبن باز»

٥٢.   ئەوەی پاکبۆوە پێش مەغریب ئایا نوێژی نیوەڕۆ عەسر بکات؟

ئەگەر ئافرەتی حەیزدارو نیفاسدار پێش خۆر ئاوا بوون پـاکبۆوە، لەسەری پێویست دەبێت، نوێژی نیوەڕۆو عەسر بکات.

«الشیخ إبن باز»

٥٣.   ئەوەی خاوێن بۆوە لە کاتی عیشا ئایا نوێـژی مـەغریب لـە گەڵ عیشا بکات؟

ئەگەر ئافرەتی حەیزدارو نیفاسدار پاکژبۆوە لە کاتی عیشا، ئـەوە لەسەری پێویستە نوێژی مەغریبو عیشا بکات.

«الشیخ إبن باز»

٥٤.   ئەوەی پاکژ دەبێتەوە لە کاتی عەسر؟

ئەگەر حەیزدار یان نیفاسدار پاکژبۆوە لە کاتی عەسر لەسەری پێویستە نوێژی نیوەڕۆو عەسر بەیەکەوە بکات.

«الشيخ إبن باز»

٥٥. لە خەو هەڵسا بۆ کردنی نوێژی بەیانی، بەڵام کاتەکە دوای خۆر هەڵاتن بوو خوێنی بوو بینی، ئایا لەسەری پێوستە نوێژەکە بگێڕێتەوە؟

بەڵێ لەسەری پێویستە نوێژەکە بگێڕێتەوە ، چونکە (خوێن نەهاتنە دەرەوەکە) ئەصڵو بنچینەیە، وە ئەگەر بنچینەش نەهاتنە دەرەوەی خوێن بێت، ئەوە ئەو واتایە دەگەینێت، پێش حەیز بوونی چووەتە ناو کاتی نوێژەکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٦. ئەگەر ئافرەت لەبەر ژانی منداڵ بوون دوو ڕۆژ وورِ بێت، نوێژەکانی لەبیر بکات هیچ خوێنێکیش نەبینێت، ئایا نوێژەکانی بگێڕێتەوە؟

بەڵێ نوێژەکانی دەگێڕێتەوە، چونکە ئەو وورِبوونە، نەخۆشیە یان ئێشە، یان هاوشێوەی ئەو شتانەیە، بەو شتانە نوێژەکەی لەسەر لاناچێتو خوێنیشی نەبینیوە ببێتە نیفاس.

«الشيخ السعدي»

٥٧. ئەگەر ئافرەت کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ تووشی حەیز بوو وەکو نموونە، وەئەویش هێشتا نوێژی نیوەڕۆی نەکردبوو، گێڕانەوەی ئەو نوێژەی لەسەر پێویستە، چونکە گێڕانەوەی یەك نوێژ ئەزیەت نیە بۆی کاتێك خاوێن‌و پاکژبۆوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٨. گێڕانەوەی نوێژ ڕۆیشتووەکان.

– دەبێ یەکسەر ئەو کات بکرێت ( نابێت نوێژەکە دوا بخرێت بۆ کاتێکی‌تری هەمان نوێژ لە بەیانی).

– وەدەبێت ڕێك‌و پێك‌و لەدوای یەك بێت، هەروەك چۆن خوای گەورە فەرزی کردووە بەشێوەیەك نوێژی بەیانی بکەی ئینجا نیوەڕۆ.

«اللجنة الدائمة»

٥٩. حوکمی ئەو کەسەی نوێژی بەیانی دوای خۆر هەلاتن دەکات.

ئەگەر بە ئەنقسەت وابکات، ئەوە کوفرێکی ئەنجام داوە لە لای هەموو زانایەکان، وەدروستیش نیە بۆ موسڵمان شەونخونییێك بکات، زایەع کردن‌و فەوتانی نوێژی بەیانی لێبکەوێتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٦٠. گێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەکانی.

ئەگەر بە ئەنقەست وازی لە نوێژ هێنا بێت، ئەوە گێڕانەوەی بۆ نیە، وەلەسەری پێویستە تەوبە بکات لەسەر ئەو گوناهەی کە ڕۆیشتووە، وەبەردەوام بێت لەسەر کردەوە باشەکانی لە ڕۆژەکانی داهاتوودا.

بەڵام ئەوەی وازی لێ دێنێت لەبەر نەخۆشی یان لەبەر لەبیرچوون یان لەبەر خەوتن، ئەوانە نوێژەکەیان دەگێڕنەوە.

«الشيخ إبن باز»

٦١. ئافرەتێك بۆ نوێژی بەیانی دوای خۆر هەڵاتن هەڵساو خوێنی بەخۆیەوە بینی:

لەسەری پێویستە نوێژی بەیانی بگێڕێتەوە دوای پاکبوونەوەی، چونکە بنەڕەت (ئەصل) وایە خوێن نەهاتبێتە خوارەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٢. حەیزدار ( ئەگەر خاوێن بۆوە) ئەو نوێژەی لەسەر واجب دەبێت، ئەگەر بە ئەندازەی یەك کڕنوش لە کاتەکەی مابێت لەسەرەتای کات یان لە کۆتاییەکەی.

- نموونەی سەرەتای کات:

ئافرەتێك حەیزدار بوو دوای خۆر ئاوا بوون بە ئەندازەی یەك کڕنوش، لەسەری واجبە دوای پاکبوونەوەی نوێژ مەغریب

بکاتــەوە، چــونکە گەیــشتووتە کاتەکــەی بــە ئەنــدازەی یــەك کڕنوش(ڕەکعەت) پێش حەیزدار بوونی.

«الشیخ إبن عثیمین»

٦٢. نموونەی کۆتایی کات:

ئافرەتێك پاکدەبێتەوە لە حەیز پێش هەڵاتنی خـۆر بـە ئەنـدازەی یەك رەکعەت، ئەوە لەسـەری پێویـستە نوێـژ بـەیانی بگێڕێتـەوە، چـونکە گەیـشتووتە بەشـێك لـە کاتەکـەی بـە ئەنـدازەی یـەك رەکعەت. «الشیخ إبن عثیمین»

## ﴿ئەوەی پەیوەستە بە نوێژی سونەت﴾

٦٤. نوێژی چێشتەنگاو ( صـلاة الـضحی): سـەرەتای کاتەکـەی دوای خۆر هەڵاتن بە کەمێك دەست پێ دەکات. بەڵام چاکتر وایـە بکرێـت دوای بـەرز بوونـەوەی خـۆرو داهـاتنی گـەرما. کـەمترین رەکعەتی چێشتەنگاو دوو رەکعەتە، بۆ زۆریەکەشی سنووری نیە.

٦٥. نوێژی تەسبیحات ( صلاة التسابیح)

ڕای ڕاسـتو دروسـتر ئەوەیـە فەرموودەکـە پەسـند نیـە، بـەڵکو شـازەو دەقـی فەرموودەکـە نەویـستراوەو پێـچەوانەی فـەرموودە

ڕاستەکانیترە، کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) زانراوە سەبارەت بە نوێژی سوننەت.

«اللجنة الدائمة»

٦٦. ئەو ئافرەتەی کە بانگی بەیانی لەسەر دراوەو نوێژی ویتری نەکردوە چی بکات؟

ویترەکەی دوا دەخات بۆ چێشتەنگاو، دوای بەرز بوونەوەی خۆر، ئەگەر ئافرەتەکە ڕاهاتبوو ۳ ڕەکعاتی دەکرد بەڵام ئەو شەوە پێی نەکرا ، لەبەر نەخۆشی یان نووستن، ئەوە نوێژی چێشتەنگاو چوار ڕەکعەت دەکات بەدوو سلام دانەوە ( دوو ڕەکعەت، دوو ڕەکعەت). وە ئەگەر ڕاهاتبێت پێنج ڕەکعەت بکات، ئەوە شەش ڕەکعەت نوێژ چێشتنەگاو دەکات بە سێ سەلام دانەوە، ئیتر بەم شێوە.

«الشيخ إبن باز»

٦٧. نوێژی سوننەت نابێتە واجب ئەگەر هاتوو مرۆڤ زۆری کردوو لەسەری ڕاهات. ئەگەر دەستی بەنوێژ یان ڕۆژی سوننەت کرد بۆی هەیە بیپچڕێنێت، بەڵام چاکتر وایە تەواوی بکات مەگەر حەج و عومرە نەبێت، ئەگەر دەستی پێیان کرد ئەوە دەبێتە واجب تاوەکو تەواوی دەکات ئەگەر هاتوو سوننەتیش بێت.

«الشيخ إبن باز»

٦٨. نوێژی تەوبە:

لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە: (( مامن عبد يذنب ذنبا ثم يتطهر فيحسن الطهور، ثم يصلي ركعتين ثم يتوب الله من ذنبه إلا تاب الله عليه)) رواه أحمد.

واتە هەر بەندەیەك گوناهێك ئەنجام بدات، پاشان بە جوانی دەستنوێژ هەڵبگرێت، پاشان دوو ڕەكعەت نوێژ بكات، پاشان لە گوناهەكەی پەشیمان ببێتەوەو تەوبە بكات، ئەوە لێخۆشبوونی خوای بۆ مسۆگەر دەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٦٩. نوێژی پرس كردن( صلاة الأستخارة):

چۆنیەتەكەی : دوو ڕەكعەت بكات وەكو نوێژە سوننەتەكانیتر، پاڕانەوەو دوعایەكە دوای سەلام دانەوە دەبێت. پاڕانەوەكەش ئەو پاڕانەوە دەبێت كە لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە ( اللهم إني أستخيرك بعلمك ....... ) تا كوتایی دوعایەكە

«الشيخ إبن باز»

٧٠. بانگ دانی بەیانی لە كاتی كردنی نوێژی ویتر.

نوێژە ویترەكەی تەواو دەكات هیچ كێشەی تێدا نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧١.   ئەوەی سەرەتای شەو، نوێژی ویتر دەکات کۆتاییەکەشی هەڵدەستێتەوە، ئەوەندە نوێژەی کە دەیەوێت جووت جووت (واتە دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت) دەکات بەبێ ویتر، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ( لا وتران في ليلة )) واتە دوو نوێژی ویتر لەیەك شەو نابێت.

«الشيخ إبن باز»

٧٢.   نوێژی چێشتەنگاو لە کاتی کارکردن:

ئەگەر مامۆستا یان فەرمانبەرەکە کاتی هەبوو، بۆی هەیە دوو ڕەکعەت چێشتەنگاو بکات، ئەگەر لەو کات هیچ کارێکی نەبوو.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٣.   نوێژی پێویستی ( صلاة الحاجة)و نوێژی ئەزبەر کردنی قورئان:

سەنەدی هەردوو فەرموودەکە ڕاستو دروست نیە، ناکرێت بسلەمێنرێت مەگەر بە بەڵگەی شەرعی نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

## ئەوەی پەیوەستە بە نوێژی کۆمەڵ (جماعه)

٧٤.   ئایا بانگو قامەت شەرعیە بۆ ئافرەتان؟

قامەت کردن دەرهەق بە ئافرەتان سوننەت نیە، جا چ نوێژەکە خۆیان بە تەنها بیکەن یان یەکێکیان بە کۆمەڵ بۆیان بکات،

هەروەها بانگدانیش بۆیان شەرعی نیە، چونکە بانگو قامەت تایبەتمەندیەکە تەنها بۆ پیاوانە، هەروەك چۆن فەرموودەکان ئاماژە بەوە دەکەن.

«اللجنة الدائمة»

٧٥. بۆ ئافرەت هەیە پێش نوێژی بۆ ژنان بکات، نوێژی فەرزو تەراویح، وە نابێت وە پێش ڕیزی یەکەم بکەوێت، وەکو پێش نوێژی پیاوان ، بەڵکو لە ناوەڕاستی ریزی یەکەم ڕادەوەستێت.

«اللجنة الدائمة»

٧٦. دروست نیە بۆ ئافرەت بە تەنیا لە ڕیز بێت، ئافرەتیتریش هەبێت لە مزگەوت، وەئەگەر بە تەنیاش بێت هیچی تێدا نیە.

«الشیخ السعدي»

٧٧. سوننەتو ڕێو شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە دەسەلمێنێت نوێژی ئافرەت لەماڵەکەی چاکترەو پاداشتی زیاترە لە نوێژکردنی لە مزگەوتی حەڕام (کەعبە)، چونکە ئەو فەرموودەی (( وبیوتهن خیر لهن)) کاتێك ئەو لە مەدینە بووە. چونکە ئافرەت لە ماڵەکەی پارێزراوترو دوورترە لە ئاشوبو فیتنە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٧٨. ئەگەر شوێنی نوێژی ئافرەتان دوور بێت لە پیاوانو جیا کرابێتەوە بە بەربەستێك لە دیوار یان شتیتر، ئەوەی دیار بێت

چاکترین ریزەکانیان، ریزی سەرەتاییەکانە، ئەویش لەبەر نەمانی مەترسیەکە ، کە ترسی فیتنەیە.

«الشيخ إبن جبرين والشيخ إبن فوزان»

٧٩. نوێژی هەینی بۆ ئافرەت: ئەگەر ئافرەت نوێژی هەینی لە گەڵ ئیمام کرد، ئەوە نوێژەکەی دروستە، وە ئەگەر لە ماڵەوە کردی چوار رەکعەت نوێژی نیوەڕۆ دەکات.

«اللجنة الدائمة»

٨٠. شوێنکەوتنو بەدوا چوونی ئیمامێك لە رێگای تەلەفزیۆن یان ڕادیۆ؟

دروست نیە، جا نوێژەکە فەرز بێت یان سوننەت جیاوازی نیە، ئەگەر چی گوێ بیستی خوێندنی ئیمامو تەکبیراتەکانیشی بێت.

«اللجنة الدائمة»

٨١. نوێژ کردنی ئافرەت بە پەنچەوانە ئاسایە، چونکە فرمانی پێکراوە خۆی داپۆشێت لە ناو نوێژ.

❖ لە چەند شتێك ئافرەت جیاوازی لە گەڵ پیاو هەیە، لە نوێژی بە کۆمەڵدا.

٨٢. گرنگی نوێژی بە کۆمەڵ زۆر دووپات نەکراوەتەوە دەرهەق بە ئافرەتان وەکو ئەوەی دەرهەق بە پیاوان دووپات کراوەتەوە.

٨٣. ئیمامی ئافرەتان لە ناوەڕاستیان ڕادەوەستێت(پێش ڕیزی یەکەم ناکەوێت).

٨٤. یەکێکیان لە دوای پیاو ڕادەوەستێت نەك تەنیشتی بە پێچەوانەی پیاوان.

٨٥. ئەگەر بەریز لە گەڵ پیاوەکەی بکەن کۆتایی ریزەکانیان چاکترە لە سەرەتایەکان.

٨٦. نوێژ کردنی ئافرەتان لەو مزگەوتانەی کە نە ئیمام، نە شوێنکەوتووەکانی ئیمام (مەئموم) دەبینرێن. بەڵکو تەنها گوێ بیستی دەنگ دەبن، ئەو نوێژە بە کۆمەڵەیان لە گەڵ ئیمام دروستەو تەواوە، چونکە شوێنەکە یەك شوێنە، دەکرێ شوێن ئیمام بکەوەن.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٧. نوێژ کردن لە دوای ئافرەتان.

ئەصل وایە ئەوانەی دوای ئیمام پیاو بن، ئافرەتانیش لە کۆتایی مزگەوت بن. بەڵام ئەگەر وا ڕێککەوت پیاوان ڕێگایەکیان نەبوو بۆ ریزبوونیان دوای پیاوان ، ریز دەبن دوای ئافرەتان بۆ حاڵەتی پێویست، نوێژەکەشیان دروستو تەواوە.

«اللجنة الدائمة»

٨٨. ئەگەر پیاو نوێژی بۆ ئافرەتەکەی خۆی کرد.

ئافرەتەکــە دوای پیاوەکــە ڕادەوەســتێت، چــونکە شــوێنی ڕاوەستانی ئـافرەت لـە گـەڵ پیـاوان لـە دواوەیـە، جـا چ ئەگـەر مەحرەمی بێت یان مەحرەمی نەبێت. جیاوازی نیە.

«اللجنة الدائمة»

٨٩. دروستە بۆ ژنان نوێژی بە کۆمەڵ بکـەن، بـەڵام ئایـا ئـەوە سوننەتێکە بۆیان یان ڕێپێدراوو دروستە؟ ڕای نـزیکتر لـە شـەرع تـەنها دروسـتەو ڕێپێـدراوە، چـونکە سـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ) لەسەر ئەو شتە زۆر ڕاشکاو نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩٠. پێش نوێژ کردنی ئافرەت بۆ کوڕان.

ڕای دروستر ئەوەیە نابێت ئافرەت پێش نوێژ بۆ پیاوان بکات، جـا چ گچکە بێت یان گەورە جیاوازی نیە. «الشيخ إبن عثيمين»

٩١. ئـەو ڕەشماڵـەی هەڵـدەدرێت بـۆ نوێـژی ئافرەتـان نزیـک مزگەوت.

دروسـتە ڕەشماڵیـان بـۆ هەڵبـدرێت دوای پیاوەکـان، بـۆ ئـەوەی نوێـژی تێـدا بکـەنو پێـشی دەگوترێـت مزگـەوت، ئەگـەر لـە نـاو مزگەوت بێت. «اللجنة الدائمة»

٩٢. مەرجەکانی چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ مزگەوت.

- دەبێـت داپۆشـراو بێـت بـە جـلو بـەرگ، باڵاپۆشـێنێکی تـەواو بپۆشێت.

- کە چووە دەرەوە نابێت خۆی بۆن خۆش بکات.

- نابێت مافێك یان واجبێك لە مافەكانی پیاوەكەو منداڵەكانی بفەوتێنێت.
- نابێت چوونە دەرەوەكەی فیتنەو ئاشوبی لێبكەوێتەوە.
- نابێت خۆی برازێنێتەوە بە جلو بەرگو زێڕو خشل.

«الشیخ إبن فوزان»

٩٢. ئایا پاداشتی ئەو ئافرەتەی كە نوێژی بە كۆمەڵ دەكات وەكو پاداشتی ئەو پیاوەیە كە نوێژی بە كۆمەڵ دەكات؟

ئەو چەند جار بوونەوەیە لە پاداشت كە لە نوێژ بە كۆمەڵ بە دەست دێت، تایبەتە بە پیاوان، چونكە ئەوان بانگراون بۆ نوێژەكە، وەكو واجبێك بیكەن، بۆیەش دەقی فەرموودەكە دەفەرمێت (( صلاه الرجل في جماعة تضعف على صلاته في بيته خمساً وعشرين ضعفا )) واتە نوێژی پیاو بە كۆمەڵ پاداشتی زیاترەو چەند جارترە لە نوێژەكەی لەماڵەوە بە بیستو پێنج جار. بە پێی ئەو فەرموودەیە ئافرەت ئەو پاداشتەی پێ نادرێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

❖ بەڵام هەندێك پاداشتی تری بۆ هەیە، وەكو ڕۆیشتنی بۆ مزگەوتو دوعا كردنی فریشتەكان بۆی كاتێك ئەو لە مزگەوتە.

## ﴿ئافرەتو جەنازە﴾

❖ ١٥ وەڵامی تێدایە.

١. دروستە بۆ ئافرەت بەشداری پیاوان بكات، لە نوێژی سەر جەنازە، چونكە ئەصل لە هەموو پەرستنەكان ئەوەیە گشتگیرە بۆ پیاوانو ئافرەتان.

«اللجنة الدائمة»

٢. شوێنی وەستانی ئیمام لە لای سەری پیاوەو لە ناوەڕاستی ئافرەتە، جا چ گەورە بن یان بچووك جیاوازیی نیە.

٣. بەدوا كەوتنی ئافرەت بۆ جەنازە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((نهينا عن اتباع الجنائز ولم يعزم علينا)) متفق عليه واتە بە دوا كەوتنی جەنازەمان لێ قەدەغە كراو بوو، بەڵام لەسەرمان سوور نەبوو.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤. لە خۆدانو شیوەن گێران ( النياحة) لەسەر خاوەن مردوو قەدەغە كراوە، ئەو شیوەنە: دەنگ بەرز كردنەوەیە بەسەر دولكە وتن، كە ناڕەزاییو ئارام نەگرتن دەگەینێت بەرامبەر قەزاو قەدەرو بڕیاری خوا.

«الشيخ إبن فوزان»

٥. گریان لەسەر مردوو دروستە، ئەگەر شیوەنی لە گەڵ نەبێت، کاری قەدەغەکراوو تورە بوون دەربڕینی تێدا نەبێت بەرامبەر قەزاو قەدەری خوا.

«الشيخ إبن فوزان»

٦. شوشتنی پیاو بۆ خێزانەکەی‌و بە پێچەوانەش دروستە، چونکە علي بن أبي طالب خێزانەکەی فاطمەی کچی پێغەمبەری شوشتوەو ئەسمای کچی عمیس پیاوەکەی خۆی( ئەبو بکر الصديق)ی شوشتووە.

«اللجنة الدائمة»

٧. دروستە بۆ ئافرەت کاتێک حەیزدار دەبێت، ئافرەتان بشوات‌و کفنیان بکات.

«اللجنة الدائمة»

٨. دروستە پیاوێك ئافرەتێك بخاتە قەبرەکەی ئەگەرچی لە مەحرەمەکانی نەبێت‌و مەحرەمەکانی ئافرەتەکەش لەوێ هەبن.

«الشيخ إبن باز»

٩. زیارەت کردنی ئافرەتان بۆ قەبرستان دروست نیە لەبەر ئەو فەرموودەیە ( لعن الله زائرات القبور) واتە نەفرەتی خوای لەو ئافرەتانەی کە زیارەتی قەبرستان دەکەن.

«اللجنة الدائمة»

١٠. ئەگەر ئافرەتێك تێپەڕی بە قەبرستانێك بەبێ ئەوەی مەبەستی هەبووبێت كە زیارەتی بكات، لەوێ وەستاو سەلامی شەرعی كرد، ئەوە هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١١. ژیریو دانایی لە قەدەغە كردنی ئافرەتان لە قەبرستان.

– چونكە ئافرەت هزرو عەقلی بێ هێزەو سۆزو هەستی زوو دەورژێت.

– لەبەر ئەوەی ئەگەر ئافرەت سەردانی قەبرستان بكاتو سەردانەكە چەند جار دووبار بۆە، ئەوە قەبرستانەكان پڕ دەبێت لە ئافرەتان، جا دەبێتە شوێنكێك بۆ ئەهلی فەسادو بەد ڕەوشتەكان.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢. سوننەتە كفنی ئافرەت بكرێتە پێنج بەرگی سپی.

بەرگێك بالای پێ بپۆشێت، پەچەیەك سەری پێ بپۆشرێت، كراسێك لە بەری بكات، دوو بەرگەكەیتریش لەوانە لوول دەدرێن.

١٣. چ لە قژی ئافرەتی مردوو بكرێت؟

دەكرێتە سێ كەزیو لە پشتیدا دادەنرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

١٤. ڕەحمەتی یان خوا لێخۆشبوو.

شەرعیە بە مردوو بگوترێت خوالێیخۆشبێت نەك خوالێخۆشبوو، چونکە چارەنووسی ڕاستەقینەی نازانرێت.

«اللجنة الدائمة»

١٥. حوکمی لە ڕومەت دان و جل وبەرگ دڕاندن لە کاتی بەلاو ناخۆشی.

دروست نیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( ليس منا من ضرب الخدود أو شق الجيوب أو دعا بدعوى الجاهلية)) متفق عليه. واتە ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە لە ڕوومەتی خۆی دەدات و جل وبەرگی دەدڕێنێت، یان بانگەشەی نەفامی دەکات.

❖ پێویستە لە کاتی بەلاو موسیبەت خۆڕاگرو ئارامگر بیت و داوای پاداشت لە خوا بکەی، ئاگەدار بیت لە شتە قەدەغەکراوەکان و بۆ خوا بگەڕێیەوە لە گوناهەکانی ڕابوردوو.

# ﴿ ئافرەت و ڕۆژو گرتن ﴾

❖ (٦٣) وەڵامی تێدایە.

١. ڕۆژوو واجب دەبێت لەسەر ئافرەت ئەگەر بالغ بوو.

بە یەکێك لەم چوار شتانە ئافرەت بالغ دەبێت.

- پانزە ساڵ تەواو بکات.
- لێهاتنی موو لە دەورو بەری دامێنی.
- بە هاتنە خوارەوەی مەنی.
- یان بە تووشبوونی حەیزی یان سك پڕ بوونی.

چ کاتێك یەکێك لەم شتانەی ایێی ڕوو بدات، ئەوە بە ڕۆژوو بوونی لەسەر واجب دەبێت ئەگەر چی دە ساڵانیش بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢. ئەگەر ئافرەت پاکژ بۆوە دوای خۆر هەڵاتن، ئەوە زانایانەکان بۆ ڕۆژو گرتنی دوو قسەیان هەیە.

❖ ڕای ڕاسترو دروستر ئەوەیە لەسەری واجب نیە ئەو ڕۆژە بە تەواوی بگرێت، لەبەر ئەوەی بە ڕۆژوو بوونەکەی لەم ڕۆژە دروست نیە، چونکە ئەو لەسەرەتای ڕۆژەکەی حەیزدار بووە بۆیە لە ئەهلی ڕۆژوو نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣.	سورى مانگانەى حەيز بۆى هات پێش خۆر ئاوابوون بە کەمێك. ڕۆژوەکەى بە تاڵ دەبێ، وە ئەگەر دواى خۆر ئاوا بوون بێت ڕۆژوەکەى تەواوەو گێڕانەوەى لەسەر نیە.

«اللجنة الدائمة»

٤.	گواستنەوەى حەيز: ئەگەر ئافرەتێك هەستى بە جوڵەو گواستنەوەى حەيز کرد، کاتێك ئەو بە ڕۆژو بوو، بەڵام نەهاتە دەرەوە تاکو خۆر ئاوا بوون، يان هەستى بە ژانى حەيز کرد بەڵام نەهاتە دەرەوە، هەتاکو دواى خۆر ئاوا بوون، ئەوە ڕۆژووەکەى تەواوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥.	ئەگەر ئافرەت دووگيان بوو، خوێنيشى لێ هاتە خوارەوە جا چ يەك پەڵە يان دوو پەڵە خوێن بێت، يان خوێنێکى زۆر بێت، ئەوە ئەو خوێنە هيچ نيە، لەسەرى پێويستە ڕۆژووەکەى تەواو بکات چونکە ئەو خوێنە حەيز نيە.

«الشيخ إبن باز»

٦.	وا چاکترە بۆ حەيزدارو نيفاسدار لە ڕۆژەکانى ڕەمەزان بە نێهێنى بخۆن و بخۆنەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. به ڕۆژو بوونی حەیزدار یان نیفاسدار دروستەو تەواوە، ئەگەر پاکبوبێتەوە پێش بەرەبەیان، خۆیان نەشۆرد بێت، مەگەر دوای هاتنی بەرەبەیان... ئەوە وەکو کەسێکە کە جەنابەتی لەسەر بێت کاتێك خۆر هەڵدێت ئەو هەر جەنابەتەکەی لەسەرە، ئەوە ڕۆژووەکەی تەواوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨. ئەگەر بەرەبەیان داهاتو ئەویش حەیزدار بوو، نابێت ئەو ڕۆژە بە ڕۆژو بێت ئەگەر چی بەکەمێك دوای بەرەبەیان پاکبوبێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩. ئافرەتی دووگیان یان شیردەر، ئەگەر فتاریان کردەوە لە ڕەمەزان جا چ لە خۆی ترسا یان لە کۆرپەلەکەی ترسا جیاوازی نیە، ئەوە تەنها گێڕانەوەی ڕۆژووەکەیان لەسەر پێویستە.

«اللجنة الدائمة»

١٠. بە زۆری وا لە ئافرەتەکە بکات جووت بێت لە گەڵی کاتێك هەر دووکیان بە ڕۆژو بوون.

بە ڕۆژو بوونەکەی ئافرەتەکە دروستەو تەواوەو هیچ کەفارەتی لەسەر نیە، بەڵام پیاوەکە کەفارەتی جووت بوونەکەی دەکەوێتە سەر، کە ئازاد کردنی بەندەیەکە، ئەگەر نەیبوو بە ڕۆژو بوونی

دوو مانگە لەسەر یەکتر، ئەگەر نەیتوانی خواردنی شەست هەژاری دەکەوێتە ئەستۆ، وەهەروەها گێڕانەوەی ڕۆژووەکانیشی لەسەرە.

«الشیخ إبن عثیمین»

١١. بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە گوێرایەڵی پیاوەکەی بوو بۆ جووت بوونەکە، ئەوە هەمان کەفارەتی دەکەوێتە سەر، دەبێت ڕۆژووەکانیش بگێڕێتەوە.

«الشیخ إبن عثیمین»

١٢. لە گەڵ ئافرەتەکەی جووت دەبێت سێ ڕۆژ لەسەر یەکتر. کەفارەتی دەکەوێتە سەر بەقەد ئەو ڕۆژانەی کە جووت بووە تێیاندا، هەر ڕۆژێك تێدا جووت بووبێت کەفارەتێکی سەربەخۆی لە سەرە.

«الشیخ إبن فوزان»

١٣. لە گەڵ ئافرەتەکە کۆ دەبێتەوە بەبێ هاتنی ئاو کاتێك ئەو بە ڕۆژووە، جیاوازی نیە ئاو بێتە خوارەوەوە یان نەیەتە خوارەوە، تەنها بە ئەنجام دانی جووت بوونەکە ڕۆژووەکەی بە تاڵ دەبێتو کەفارەتو بە ڕۆژوو بوونی ڕۆژێکیتر لە جیاتی ئەم ڕۆژەی دەکەوێتە سەر.

«الشیخ إبن عثیمین»

١٤.	ئەگەر ئاو هاتە دەرەوە بەبێ جووت بوون ئەوە کەفارەتی لەسەر نیە، بەڵکو ئەم شتانەی تێدایە

١-	گوناهە

٢-	بە ڕۆژو بوونی تەواوی ڕۆژەکە.

٣-	گێڕانەوەی ڕۆژووەکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٥.	بە ڕۆژووان ئافرەتی خۆی ماچ بکاتو دەست گەمەی لە گەڵ بکات.

بۆی دروستە، بەڵام ئەگەر لەم کاتە مەنی هاتە خوارەوە، ئەوە ڕۆژویەکەیان بە تاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر مەذی هاتە خوارەوە کە ئاوێکی لینجی روونە، ئەوە ڕۆژووەکەیان بە تاڵ نابێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٦.	بەکارهێنانی گیراوە سەردەمیەکان لە کاتی بە ڕۆژوو بوون.

ئافرەت هیچی لەسەر نیە، ئەگەر ڕووخساری چەور کرد بۆ خۆ جوان کردنی یان بۆ خۆ جوان نەکردنی، چەوریەکانیش بە هەموو جۆرەکانی جا چ لە ڕوخساری یان لە پشتی یان لە هەر شوێنێك بەکاری بێنێت، کاریگەری لەسەر ڕۆژووگر نیەو ڕۆژووەکەی ناشکێنێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٧.   دانانی خەنە لە کاتی بە ڕۆژو بوون.

ڕۆژو ناشکێنێتو کاریگەری لەسەر ڕۆژو نیە جا چ لە دەستی بەکاربێنێت یان لە پێی یان لە قژی جیاوازی نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٨.   چەوری تەڕ

زیانی بۆڕۆژوو نیە، چونکە تەنها ڕووی دەرەوەی پێست تەڕ دەکات ناچێتە ناو لەشی مرۆڤ، ئەگەر گزیمان بچێتە ناو کونەکانی پێست ئەوە هەر ڕۆژوو ناشکێنێت.

«الشيخ إبن جبرين»

❖ ئافرەتەکە مردبێت، ڕۆژووی لەسەر بوو: ئەوەی بمرێتو ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر بێتو نەیگرتبێت بەهۆی نەخۆشی ئەوە لە دوو حاڵەت بەدەر نیە

١٩.   حاڵەتی یەکەم : ئەگەر نەخۆشیەکە لە گەڵی بەردەوام بوویێتو نەیتوانی بێت بەڕۆژوو بێت هەتاکو مردنی، ئەوە هیچی لەسەر نیەو ڕۆژووەکەی بۆ ناگێردرێتەوەو فیدیەی بۆ نادرێت، چونکە عوزری هەبووە.

٢٠.   حاڵەتی دووەم: ئەگەر چاکبوویێتەوە لەو نەخۆشیەی کە بە هۆیەوە فتاری کردبۆوە، دوای هاتنی ڕەمەزانێکی تریش، ئەو هەر ئەو ڕۆژووانەی نەگرتووە، ئەوە واجبە لە جیاتی هەر ڕۆژێك

خواردنی هەژارێکی بۆ بدرێت، چونکە کەم تەرخەم بووە لە گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی.

«اللجنة الدائمة»

٢١. بە ڕۆژو بوونی نەزر: ئەگەر خۆی نەیگرتبێت هەتاکو مردنی، بۆی دەگێردرێتەوە.

«اللجنة الدائمة»

٢٢. ئەوەی گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی دواخست بێت، هەتاکو هاتنی ڕەمەزانێکی نوێ:

ئەگەر عوزرێکی نەبووبێت لە دواخستنەکەی، ئەوە لە گەڵ گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی دەبێت خواردنی هەژارێك بدات بۆ هەر ڕۆژێك، بەڵام ئەگەر لە دواخستنەکە عوزری هەبووبێت، ئەوە تەنها گێڕانەوەی لەسەرە.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٣. دروست نیە ئافرەت ڕۆژووی سوننەت بگرێت بە ئامادە بوونی پیاوەکەی، مەگەر بەڕێپێدانی ئەو نەبێت، بەڵام ئەگەر پیاوەکە لای ژنەکە ئامادە نەبوو، یان ئافرەتەکە پیاوی نەبوو، یان پیاوەکەی ڕێی پێبدات، ئەوە سوننەتە بە ڕۆژو بێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٤. بەکارهێنانی سووراوی لێو لە کاتی بە ڕۆژو بوونی.

نابێت بە شێوەیەك بە کاری بێنێت تامەکەی بچێتە ناوەوەی دەمی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٥. ئەگەر ئافرەت پەنچەکانی خۆی خستە کۆ ئەندامی زاوزێی بۆ تارەت، یان بۆ مەرهەم لێدان، یان بۆ پشکنینی نەخۆشیەکانی ئافرەت، یان ئامێری پشکنین ، ئەو ڕۆژووەی بە تاڵ ناکات.

«اللجنة الدائمة»

٢٦. تامکردنی خواردن دروستە لە ڕۆژەکانی ڕەمەزان، کاتێك ئافرەتەکە بە ڕۆژووە خواردن تام بکات، بەڵام دەبێت ئەوەی تامی کردوە فڕێی بداتە دەرەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

❖ ئافرەت خوێنچڕکەی (نزيف) هەبێت چی بکات لە ڕەمەزان.

٢٧. ئەو ئافرەتە واز لە نوێژو ڕۆژو دێنێت لە ماوەی سوڕی مانگانەی پێشووی، پێش ئەو ڕووداوەی کە تووشی بووە، ئەگەر عادەتی وا بێت تووشی حەیز بێت سەرەتای هەموو مانگێك بۆ ماوەی شەش ڕۆژ ، ئەوە بۆ ماوەی شەش رۆژ دادەنیشێت، نوێژو ڕۆژو ناکات، کە ماوەکە تەواو بوو، خۆی دەشواتو نوێژو ڕۆژوی خۆی دەکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٨. دروسته بۆ ئەو ئافرەتەی کە خوێنچڕکەی هەیە دوو نوێژ کۆ بکاتەوە، نوێژی نیوەڕۆو عەسر بە دواخستن یان بە پێشخستن، وە هەروەها نوێژی مەغریبو عیشا بە پێش خستن یا دوا خستن. چونکە حوکمی ئیستیحازەی هەیە.

٢٩. لەو کاتەی دەیەوێت دەستنوێژ هەڵبگرێت کۆ ئەندامی زاوزێی خۆی دەشواتو بە پارچە پەڕۆکێك دەیبەستێتەوە، یان بە شتێکی تری هاوشێوەی پەڕۆك، هەتاکو ئەو خوێنەی دێتە دەرەوە کەم دەبێت، پاشان دەستنوێژ دەشواتو نوێژ دەکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٠. ئافرەتێك نەزری کردووە ساڵێك بە ڕۆژوو بێت پاشان دەڵێ لە توانامدا نیە، لەسەری واجبە کەفارەتی سوێندەکە بدات و خواردن بداتە دە هەژار، هەر هەژارێك نیو صاع لە گەنم یان شتیتر لەو خواردنەی کە باوە لەو شارە، ئەگەر نەیتوانێت سێ ڕۆژ لەسەر یەکتر بەڕۆژوو بێت.

«اللجنة الدائمة»

٣١. دەرزی خۆراك پەخش

ڕۆژوو دەشکێنێت ئەگەر بە ئەنقەست بەکاری بێنێت بەڵام دەرزی ئاسایی ،ئاسایە، وەکو دەرزی سڕکردن(بەنج)و دەرزی بنسلینو ماسولکەو سمتو دەمار، ئەوانە ڕۆژو ناشکێنێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٢. بەكار هێنانی كەل‌و پەل‌و پێداویستیەكانی جوانكاری لە ڕۆژەكانی ڕەمەزان.

ڕۆژوو ناشكێنێت، هەروەها خەنەو مكیاج‌و چەوریەكانی جوانكاریش ڕۆژوو ناشكێنێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٣. مەعجونی ددان لە كاتی ڕۆژو:

بەكار هێنانی هیچی تێدا نیە، لە گەڵ ئاگەدار بوون لەوەی هیچ شتێك قووت نەداتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٣٤. هەروەك بەكاهێنانی سیواك شەرعیە بۆ ڕۆژووان، ئەگەر شتێك چووە خوارەوەرە بەبێ مەبەست، ئەوە گێڕانەوەی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن باز»

٣٥. پاككردنەوەی ددان، یان پڕ كردنەوەی، یان دەرهێنانی.

ئاسایەو هیچی تێدا نیە، لە كاتی بە ڕۆژوو بوون (ئەم شتانە بكات) بەڵام دەبێ وریا بێت لە چوونە خوارەوەی دەرمان یان خوێنەكە، ئەگەر كەمیش بێت، بەڵام باشترە لە كاتی بە ڕۆژوو بوون ئەم شتانە نەكرێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٦. به كار هێنانی قەترەی گوێچکەو چاو.

ڕۆژو ناشکێنێت، ئەگەر هەستی بە تامی قەترەکەی کرد لە قورگی ( گێڕانەوەی ڕۆژووەکەی چاکترە بەڵام واجب نیە).

«الشيخ إبن باز»

٣٧. بەکار هێنانی بەخاخ.

بۆ لووتی ، بەکار هێنانی هیچی تێدا نیە بۆ کاتی پێویست ، ئەگەر کرا دوا بخرێت بۆ شەوو ئەوە چاکترو دڵنیاترە، وە بەکارهێنانی بۆ دەمیش ئاساییە.

«الشيخ إبن باز»

٣٨. بە كار هێنانی بۆن.

دروستە بۆ ڕۆژووان، بەڵام نا بێت بۆنی بوخور هەڵمژێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٩. هاتنە دەوەوەی خوێن لە ڕۆژووان.

وەکو ئەوەی لە لووتی بێت، یان بە هۆی ئیستحازە خوێنەکە بێت ، یان بۆ پشکنینی خوێنەکەی بێت لە کاتی پێویست، هەروەها ئەگەر خوێنەکە بێتە دەرەوە لە برینێك، ئەوە هیچیان ڕۆژوو نا شکێنێت.

٤٠. بەڵام خوێن بەخشین: وا چاکترە دوا بخرێت بۆ دوای بەربانگ، چونکە زۆر جار وا دەبێت ئەو خوێنەی کە دێتە دەرەوە زۆرە، بە کەڵەشاخ (حجامة) دەچێت.

«الشيخ إبن باز»

٤١. قەترەی لووت.

بەکارهێنانی قەترەی لووت دروست نیە لە کاتی بەڕۆژوو بوون، چونکە لووتیش ڕێگایە، پێویستە لەسەر ئەو کەسەی وای کردووە ڕۆژووەکە بگێڕێتەوە، ئەگەر تامەکەی هەست پێ کردبێت لە قوڕگی.

«الشيخ إبن باز»

٤٢. ئەو وەرەقە ئیمساکانەی بڵاو دەکرێتەوە لە ڕەمەزان.

نەمزانیوە لە شەرع بنچینەیەکی هەبێت، بەڵکو ئەوەی کیتابو سوننە پێی رایگەیاندووین، واز هێنان لە خواردنو خواردنەوە (الإمساك) لە گەڵ هەڵاتنی خۆر دەبێت، نەوەك پێش خۆر هەڵاتن بە دە خولەك.

«الشيخ إبن باز»

٤٣. ئافرەتێك گومانی هەیە لە پاکبوونەوەی لە حەیز لە گەڵ ئەوەش بە ڕۆژوو بوو.

ڕۆژووەکەی بۆ نەگیراوە، پێویستە ئەم ڕۆژووە بگێڕێتەوە، چونکە ئەصل وایە حەیزەکەی ماوە، چوونە ناو ڕۆژووێك لە گەڵ دڵنیا نە

بوون له پاكبوونەوەكەی، چوونە ناو پەرستشێكە (عبادة) لە گەڵ گومان هەبوون لە مەرجی دروستیەكەی ،ئەوەش رێگرە لەوەی پەرستشەكە دروست بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٤. بەكار هێنانی حەب هەڵگرتن بۆ ڕۆژووان

هیچی تێدا نیە، ئەو حەبانەیە كە لە پێشەوەو پشتەوە دادەنرێت، ئەگەر كەسەكە نەخۆش بوو، چونكە ئەوە خواردنو خواردنەوە نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٥. مەرهەم بە كار هێنانی ڕۆژووان بۆ لابردنی ووشكانی لەسەر لێوەكانی.

هیچی تێدا نیە، بەڵام دەبێت وریا بێت هیچ شتێك نەچێتە ناوەوەی دەمی. وەئەگەر شتێكیش گەیشتە ناوەوەی دەمی بەبێ مەبەست، هیچی لەسەر نیەو ئاسایە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٦. سیواك كردن لە ڕەمەزان.

بە كار هێنانی دروستە بۆ ڕۆژووان، چونكە سیواك سوونەتە، ئەگەر هاتوو سیواكەكە تامو شوێنەواری لەسەر تفەكەی هەبوو،

ئەوە ئەو تفەی کە تامەکەی لێدێت قووت مەدە. هەروەها ئەگەر لە کاتی سیواك کردنەکە خوێن لە لچی هات قووتی نەدەیەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٧. ئاوی قووت داوە لە کاتی ئاو لە دەم وەرکردن (تمضمض) ڕۆژووەکەی تەواوەو قەزای لەسەر نیە چونکە بە ئەنقەست واینەکردووە.

«الشيخ إبن جبرين»

٤٨. حوکمی قووت دانەوەی لیکاوی دەم بۆ ڕۆژووان چیە؟

لیکاوی دەم هیچ زیانێکی نیە بۆ ڕۆژووان، چونکە ئەویش بە تف دادەنرێت ئەگەر قووتی دا، قەیناکە، وەئەگەر فڕێی دا، قەیناکە.

٤٩. بەڵام بەڵغەم: ئەویش ئەو شتەیە لە سنگ یان لە لووت دەردێت، وەپێی دەگوترێت (النخامة)، ئەو بەڵغەمە گەورەیە هەندێك جار لە سینگ پەیدا دەبێت، هەندێك جاریتریش لەسەری، ئەوە پێویستە لەسەر پیاوو ئافرەت فڕێی بداتو دەریبخاتو قووتی نەداتەوە. «الشيخ إبن باز»

٥٠.	خواردنەوە لە کاتی بانگدانی بەیانی.

پێویستە ئیماندار کاتێکی یەدەك دابنێت بۆ ڕۆژووەکەی، واز لەو شتانە بێنێت کە ڕۆژوو دەشکێنێت کاتێك گوێی بیستی بانگ دەبێت، مەگەر هاتوو زانی ئەم بانگە پێش بەیانی بوو.

«اللجنة الدائمة»

٥١.	ئایا دروستە بۆ ئافرەتی ڕۆژووان لە ڕۆژووەکەی دوو نیەت کۆ بکاتەوە، بە ڕۆژوو بوونی عاشوراو گێڕانەوەی ڕۆژووێك لە ڕۆژووە واجبەکان؟

واجبە لەسەر ئەو کەسەی فەرزی لەسەرە پەلە بکات لە گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی، لەترسی ئەوەی مردن بگاتە سەریو بەرپرسیار بێتو لۆمە بکرێت لەسەر کەمتەرخەمیەکەی، بەڵام ئەگەر وا گونجا ڕۆژووێکی مانگی ڕەمەزانی دواخست بۆ عاشورا یان عەرەفە، ئەو کات ئەو ڕۆژووەی گرتەوە بەنیەتی ئەو ڕۆژووانەی لەسەری پێویستە لە ڕەمەزان ، ئەوە دوو پاداشتی دەبێت، واتا قەرزی ڕۆژووەکەی لەسەر لادەچێتو خێرو پاداشتی ئەو ڕۆژەشی دەگاتێ.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٢.   حوكمی بە كار هێنانی بەخاخی ڕەبۆ بۆ ڕۆژووان.

دروستە، چونكە ناگاتە گەدە، بەڵكو دەگاتە بۆرییەكانی هەناسەدانو دەیانكاتەوە، ئەوەش خواردنو خواردنەوە نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٣.   ئەگەر ڕۆژووان گومانی هەبوو ئایا ئەو حەیزە پێش خۆر ئاوا بوون بوو، یان دوای خۆر ئاوا بوون.

ڕۆژووەكەی با بگێڕێتەوە بۆ دڵنیا بوونی.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٤.   ڕۆژووی سوننەت

شەش ڕۆژووەكەی شەوال لەدوا یەك گرتنی مەرج نیە .

٥٥.   حوكمی گێڕانەوەی شەش ڕۆژووەكەی شەوال.

ئافرەتێك تووشی نیفاس بوو بەهۆی منداڵبوونی لەسەرەتای ڕەمەزان، وە پاك نەبۆوە هەتاكو ڕۆیشتنی ڕەمەزان، پاشان دوای پاك بوونەوەی دەستی بە گێڕانەوەی ڕۆژووەكانی ڕەمەزان كرد، ئایا دوای گێڕانەوەی ڕۆژووەكانی ڕەمەزان، بۆی هەیە ڕۆژووەكانی شەوالیش بگێڕێتەوە، ئەگەر چی لە مانگێكی تر بێت، جگە لە شەوال.

نەخێر ڕۆژوو گێڕانەوە دوای ڕۆیشتنو نەمانی شەوال دروست نیە، چونكە سوننەتێك بوو كاتەكەی ڕۆیشت، جا چ وازی لێ هێنا بێت بە عوزر یان بێ عوزر جیاوازی نیە.

«الشيخ إبن باز»

٥٦. ئایا نەزیف بوونی ئافرەتی دووگیان ڕۆژوو دەشکێنێت؟

ڕۆژووەکەی دروستە وەکو ئیستیحازە.

«اللجنة الدائمة»

٥٧. ئایا هاتنە خوارەوەی ئاوی ئافرەتی دوو گیان ڕۆژو دەشکێنێت.

ڕۆژووەکەی تەواوەو ناگێڕێتەوە.

«اللجنة الدائمة»

٥٨. ئەوەی نە توانێت ڕۆژوو بگرێت لەبەر بەساڵا چوونی، یان لەبەر نەخۆشیەك کە ئومێدی چاکبوونەوەی نەبێت ، ئەوە بە ڕۆژوو نابێتو لە جیاتی هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات.

«اللجنة الدائمة»

٥٩. ئەگەر ڕۆژووان خەوت پاش جەنابەت بوونی.

ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێنێت بە کۆ ڕای زانایەکان، بەڵکو تەواو دەکات.

٦٠. ئەگەر لە یادی چوو خواردنی خوارد یان خواردیەوە.

ئەوە ڕۆژووەکەی تەواو دەکات، چونکە خوا خواردنو خواردنەوەی پێ داوە، وەئەگەر یەکێك ڕۆژووانێکی بینی دەیخوات لەیادی چووبوو بە ڕۆژووە ، ئەوە با بەیادی بێنێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦١.    قووت دانەوەی تف لە کاتی بەڕۆژوو بوون.

ئەگەر قووتی بداتەوە پێش ئەوەی لە دەمی دەربچێت، ئەوە ڕۆژووەکەی نا شکێت بەم شتە .

«اللجنة الدائمة»

٦٢. حیکمەت لەوەی کە ئافرەتی حەیزدار ڕۆژوو دەگرێتەوە بەڵام نوێژ ناگێرێتەوە ؟

چونکە نوێژەکان زۆرن، هەموو شەوو ڕۆژێك، پێنج جار دووبارە دەبێتەوە، گێرانەوەیان ئەزیەتی هەیە بۆ حەیزدار، بەپێچەوانەی ڕۆژوو، ڕۆژوو یەك جارە لە ساڵێك.

«اللجنة الدائمة»

٦٣. ئایا دروستە بەڕۆژوو بوونی شەش ڕۆژەکەی شەوال پێش گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی ڕەمەزان بخەی؟

بەپێی شەرع دەبێ گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی ڕەمەزان پێش شەش ڕۆژووەکەو ڕۆژووەکانیتری سوونەت بخەی، وە ئەوەی شەش ڕۆژووەکەی پێش خستبێت لەسەر قەرزەکەی ڕەمەزان ئەوە ناکات شەش ڕۆژووی دوای ڕەمەزانێکی تەواوی گرتووە، بەڵکو شەش ڕۆژووی دوای هەندێك لە ڕەمەزانی گرتووە (بۆیە بەبەر فەرموودەکە ناکەوێت) چونکە گێرانەوەکە فەرزەو شەش

ڕۆژووەکە سوونەتە، وە فەرز لە پێشترە بایەخ و کرنگی پێ بدرێت.

«الشيخ إبن باز»

٦٤. ئەو هۆکارانەی کە یارمەتی ئافرەت دەدات لەسەر خواپەرستی لە مانگی رەمەزان

١. لە خوا ترسانی (سبحانه وتعالی)، وەبڕوای وا بێت کە ئەو هەردەم سەیری هەڵس و کەوت و ڕەفتارو گوفتارەکانی بەندەکەی دەکات.

٢. زۆر یادکردنی خواو قورئان خوێندن و بەجێ گەیاندنی نوێژەکان لەکاتی خۆی و زۆر کردنی سوونەتەکان.

٣. مانەوەی ئافرەت لە ماڵ و نەچوونی بۆ دەرەوە مەگەر بۆ پێویست نەبێت، لە گەڵ بە پەلە گەڕانەوە بۆ ماڵ کاتێك پێویستیەکانی تەواو بوو، لە گەڵ خۆ داپۆشین و شەرم کردن و تێکەڵ نەبوونی پیاوان.

٤. وازهێنان لە شتە دوورکەرەوەکان ئەوەی دڵ ڕەق دەکەن و دوورت دەکەنەوە لەخوا، ئەویش هەموو گوناهەکانە.

٥. پاراستنی زمان لە غەیبەت و دووڕوویی و جنێودان و قسەی حەرام و سەرقاڵ کردنی بە یادی خوا.

«الشيخ إبن فوزان»

## ﴿ئافرەتو زەكات﴾

❖ (١٨) وەڵامی تێدایە.

١. زەكاتی زێڕو خشڵی خۆ ڕازاندنەوە بۆ ساڵانی ڕابوردوو.

لەسەر ئافرەت پێویستە بیدات كاتێك زانی واجبە. بەڵام پێش ئەوەی زانستی هەبێت بەواجبوونی، زەكاتی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن باز»

٢.ئەڵماسو بەردەكانی دی: زەكاتی لەسەر نیە، ئەگەر هاتوو تەنها بۆ لەبەركردنی خۆی بێت، بەڵام ئەگەر هاتوو بۆ بازرگانی بوو، ئەوە زەكاتی لەسەر پێویستە، بەپێی بەراورد كردنی نرخەكەی لە گەڵ زێڕو زیو، كاتێك گەیشتە ئەندازەی زەكات دان (نصاب) ، چونكە وەكو كەلو پەلی بازرگانی دادەنرێت.

«الشيخ إبن باز»

٣. زەكاتی زێڕو خشلی خۆڕازاندنەوە:

زەكاتەكەی بدرێت چاكترە بۆ دڵنیا بوون، چونكە لەو مەسەلەیە دووبەرەكی هەیە لە نێوان زانایان

«الشيخ إبن فوزان»

٤. چۆنیەتی زەكات دەرهێنانی ئەو خشڵەی كە نەخشێنراوە بەشتێكیتری جگە لە زێر.

نیشانی خەلکی پسپۆڕو شارەزا دەدرێت، جا ئەو بڕەی کە لە گومانی زاڵ دەبێت کە زێڕە، ئەوە زێڕە، چونکە زاڵبوونی گومانی خەڵکی شارەزا بەسەو کافیە بۆ حوکمی شەرعی ئەو جۆرە کاڵایە.

«الشیخ إبن باز»

٥.ئەگەر خشڵو زێڕەکە بۆ بازرگانی بوو، ئەوە هەمووی زەکاتی لێ دەدرێت، بە مرواریو ئەڵماسەوەش بەپێی نرخەکەی، وەکو کەلو پەلەکانی بازرگانی.

«الشیخ إبن باز»

٦.زەکاتی خشڵو زێڕی خۆ ڕازاندنەوە : زەکاتی لێ نادرێت بەپێی نرخی کڕینەکەی، بەڵکو زەکاتی لێ دەدرێت بەپێی نرخی کێشەکەی، لەو کاتەی کە ساڵ بەسەریدا دەسوڕێتەوە، زەکات دانی لەسەر واجب دەبێت.

«اللجنة الدائمة»

٧. زەکات دان بە هاوسەرەکەی:

هیچی تێدا نیە، ئەگەر ئافرەت زەکاتی خشڵو زێڕی خۆڕازاندەوەو جگە لە زێری خۆڕازاندنەوەی بداتە پیاوەکەی، ئەگەر هاتوو دەستکورتو هەژار بوو یان قەرزدار بوو، نەتوانێت بیانداتەوە.

«الشیخ إبن باز»

٨. دروسته بۆ پیاوی ئافرەتەکەو باوکی‌و برای جگە لەوانەش زەکاتی ئافرەتەکە دەربێنن‌و بیدەن، ئەگەر هاتوو بەرێپێدانی ئافرەتەکە بوو.

«الشيخ إبن باز»

٩. زەکات دان: بۆ کوڕی خوشك دروستە وەکو یارمەتی دانێك بۆ ژن هێنانی، ئەگەر هاتوو خەرجی نەبوو.

«الشيخ إبن باز»

١٠. زەکات بۆ دایك‌و باوك: دروست نیە زەکات بدرێتە دایك‌و باوك، بەڵکو پێویستە لەسەری بە پارەی خۆی بەخێویان بکات‌و خەرجیان بۆ بدات، ئەگەر پێویستیان پێ هەبوو.

«الشيخ إبن باز»

١١. زەکات بۆ منداڵەکان: دروست نیە زەکات بدرێتە منداڵەکان لە کاتێك ئەو توانای بەخێوکردن‌و خەرجی ئەوانی هەیە

«الشيخ إبن باز»

١٢. دروستە بۆ مرۆڤ زەکاتی پارەکانی بداتە خوشکێکی کە مێردی کردووە، ئەگەر هاتوو پیاوەکەی دەستکورت‌و هەژار بوو.

«اللجنة الدائمة»

١٣. دروستە بۆ ئافرەت لەماڵە تایبەتیەکەی خۆی بڕێك پارە دەربێنێت وەکو خێر (صدقة) بۆ کەس‌و کارە مردووەکانی ((بەبێ

زانینی مێردی)) ، چونکە لە ماڵی خۆی، خۆی هەلس و کەوت دەکات و ئازادە لەسنووری شەرعی خوا.

«اللجنة الدائمة»

١٤. دروستە بۆ ئافرەت خێر بکات بە پارەو پوولی مێردی ئەگەر زانی پیاوەکەی ڕێگری ئەم کارە نیە. بەڵام ئەگەر پیاوەکەی ڕێگر بوو، ئەوە دروست نیە.

«اللجنة الدائمة»

١٥. ئەو قەرزەی کە لەلای فەقیرە.

زەکاتی لەسەر نیە چونکە فەقیر دەبێت مەولەتی پێ بدرێت، دروست نیە داوای لێبکەی و ( ئەگەر توانای دانەوەی نەبوو) یان بە گرتنی بدەی، بەڵام کە وەریگرتەوە، هەر ئەو ساڵ زەکاتەکەی دەدات.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٦. زەکات لە جیاتی خزمەتکار:

ئەصل وایە زەکاتەکە لەسەر خۆیەتی ،بەڵام ئەگەر کەس و کاری ماڵەکە لە جیاتی زەکاتیاندا، ئەوە هیچی تێدانیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٧. ئایا زەکاتەکەی بداتە خزمەتکارێك کە موسڵمان نەبێت.

دروست نیە ئەگەر هاتوو دەستکورت و هەژاریش بێت

«الإمام إبن قدامة»

١٨. زەكاتی راتبی مانگانە:

ئەگەر هاتوو مرۆڤ هیچی نەبوو تەنها راتبی مانگانە نەبێت هەندێك خەرج بكاتو هەندێك هەڵبگرێت، چۆن زەكاتی لێبدات؟

پێی دەڵێن: دەبێت ئەو پارەی كە هەڵیدەگرێت بە نووسین رێكی بخات، پاشان بەشە راتبی هەر مانگێكو هەر بەشێك، ئەگەر ساڵی لەسەر سووڕاوە زەكاتی لێ دەدات. وە ئەگەر زەكاتەكەی لە هەموو پارەكە دەرهێنا ( لەو پارەی كە یەكەم جار دایینابوو) كاتێك ساڵی لەسەر سووڕاوە ئەوە بەسیەتیو كافیە.

**«اللجنة الدائمة»**

❖ یاسا هەر كەسێك خەرجی لەسەرت واجب بێت، نابێت زەكاتی بدەیتێ.

# ﴿ئافرەتو حەج﴾

## ❖ (٣٧) وولامی تێدایە.

١. حەج کردن بەپێی ڕێپێدانی مێردی:

حەجی فەرز واجبە ئەگەر مەرجەکانی توانا هەبوونی تێدا هاتەدی ، ڕێپێدانی مێرد لەو مەرجانە نیە، دروست نیە بۆ مێردەکەی قەدەغەی بکات.

«اللجنة الدائمة»

٢. ئەو ئافرەتەی کە مەحرەمی نیە، حەجی لەسەر واجب نیە، ئەگەر هاتوو مردیش، ئەو کەسانەی دوای خۆی حەجی بۆ ناکەن. چونکە ئافرەتەکە توانای نیە، خوای گەورەش حەجی لەسەر یەکێك فەرز کردووە کە توانای حەجی هەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣. ئەوەی حەج بکات بەبێ مەحرەم حەجەکەی تەواوە بەلاَم گوناهبارە، چونکە سەفەری کردووە بەبێ مەحرەم.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤. دروستە بۆ ئافرەت بە پارەی تایبەتی پیاوەکەی حەج بکات، ئەگەر هاتوو پیاوەکەی ڕێی پێدا بەو پارە حەج بکات.

«اللجنة الدائمة»

٥. به میقات تێبه‌ڕی کاتێك حه‌یزدار بوو.

ئه‌و ئافره‌ته‌ی كه ده‌یه‌وێت حه‌ج یان عومره بكات، دروست نیه بۆی به میقات تێپه‌ڕێت مه‌گه‌ر به ئیحرام به‌ستن نه‌بێت، ئه‌گه‌رچی حه‌یزداریش بێت، ئه‌و ئیحرامه‌ی كه به‌ستوویه‌تی دروسته‌و ته‌واوه، به‌ڵام ته‌وافی كه‌عبه ناكات هه‌تاكو پاك ده‌بێته‌وه‌و هه‌موو كرده‌وه‌كانی تری حه‌ج ده‌كات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦.بۆ سه‌عی كردن له‌نێوان سه‌فاو مه‌ڕوه، پاك بوون بۆ ئه‌و مه‌به‌سته مه‌رج نیه، چونكه شوێنی سه‌عی كردنه‌كه مزگه‌وت نیه.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧. ڕۆیشتنی به په‌له (هه‌ڕوه‌ڵه) ده‌رهه‌ق به ئافره‌تان سوننه‌ت نیه، به‌ڵكو تایبه‌ته به پیاوان.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨. ئافره‌تان سه‌عی ناكه‌ن له نێوان دوو ئاڵا سه‌وزه‌كه، هه‌روه‌ها ئه‌و كه‌سه‌ش كه هاوه‌ڵایه‌تی ئافره‌ت ده‌كات له‌به‌ر خاتری چاودێری كردنی ئافره‌ت‌و پارێزگاری كردن لێی، ئه‌ویش سه‌عی ناكات له نێوان دوو ئاڵا سه‌وزه‌كه.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩. ماچ کردنی پەردەکە: سوونەت نیە بۆ ئافرەت بەردەکە ماچ بکات، یان دەستی لێبدات، مەگەر لەکاتی شەو نەبێت کە شوێنەکەی تەواف کاران چۆڵ دەبێت. لەبەر ئەو زیانەی کە ئافرەت دەیگەیەنێت بە خۆیو جگە لە خۆی.

«الشيخ إبن فوزان»

١٠. دروستە بۆ ئافرەتان لە گەڵ پەککەوتەو بێ دەسەلاتەکان بچنە دەرەوە لە (مزدلفة) دوای خۆر ئاوا بوون، بەردەکانی (عەقەبە) بهاوێژن کاتێك گەیشتنە (منی) لەترسی قەڵەبالغیو جەنجالیو ئەزیەت.

«الشيخ إبن فوزان»

١١. ئافرەت کورت کردنەوەی قژی بەوە دەبێت، کە هەموو قژەکەی لەسەرەتای سەری کۆ بکاتەوە، پاشان بە ئەندازەی سەرەپەنجەی لە لێواری قژەکەی لێبکاتەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢. بە ئەندازەی سەرەپەنجە: سەرەپەنجەی جومگەی سەرەوە.

١٣. جلی ئیحرامی ئافرەت: جلێکی تایبەت نیە ئافرەت لە کاتی حەجو عومرە لەبەریان بکات، بەڵکو ئەو شتە لەبەر دەکات کە لە دابو نەریتدا هەیە کە هەموو لەشی داپۆشێت (( ڕازوە نەبێتو بەپیاوان نەچێت))

١٤. ئەو ئافرەتەی ئیحرامی بەستووە نابێت نیقابو دەستەوانە لەبەر بکات، بەڵام ئەگەر پیاوی لا هەبوو ئەوە شتێك شۆڕ دەکاتەوە سەر ڕوخساری، هەروەك چۆن لە فەرموودەی عائیشەو ئەسماء داهاتووە.

١٥. لە جیاتی هاوێشتنی بەردەکان.

ئەوەی نەتوانێت بەرد بهاوێژی، ئەوە یەکێك لە جیاتی خۆی دادەنێت ئەو کارەی بۆ بکات، ئەگەر لە ئافرەتەکە ترسا لە قەڵەباڵغیو جەنجاڵی.

«اللجنة الدائمة»

١٦. ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە دروست نیە بۆی لە گەڵ ئافرەتەکەی ڕابوێرێت بە دەست گەمەکردن یان جووت بوون یان قسەیەك واتای جووت بوون لە خۆی بگرێت.

١٧. دروستە بۆ پیاو لە گەڵ ئافرەتی خۆی رابوێرێت، ئەگەر سێ کردەوەی کرد لە ڕۆژی جەژن ئەگەر بەردی عەقەبەی هاوێشت، قژی تەراش کرد، یان کورتی کردەوە، وە تەواف (الأفاضة) کردبێت. الإفاضة: زیارەت کردنی کەعبەیە لەیەکەم رۆژی جەژنی قوربان. (بۆ مەبەستی تەواف کردن)

١٨.پێویست ناكات، واجب نیه، ئافرەت چیلكه دارێك یان چەند پەڕۆكێكی لوول دراو بەكار بێنێت بۆ سەری، بۆ جیاكردنەوەی پێچەكەی لە ڕوخسارو دەم‌و چاوی ( پێچەكەی لەسەر چیلكە دارەكە یان لەسەر پەڕۆكە لوول دراوەكە ببەستێت، بۆ ئەوەی پێچەكە بە ڕوخسارو دەم‌و چاوی نەكەوێت)

«الشيخ محمد بن إبراهيم»

١٩. ئەگەر تاڵە مووێك لە ئافرەتێك كە ئیحرامی بەستووە كەوتە خوارەوە، كاتێك كەسەری دەسڕێتەوە لە كاتی دەستنوێژ یان لە كاتی خۆشۆردنی، زیانی بۆی نیە ئەگەر بە ئەنقەست نەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٠. تەوافی ماڵئاوایی : لە سەر ئافرەتی حەیزدارو نیفاس دار لا دەچێت، بەڵام تەوافی (الأفاضة) هەر دەبێت بیكات

«الشيخ إبن عثيمين»

٢١. شتە قەدەغەكراوەكانی ئیحرام، ئەگەر هاتوو مرۆڤ بە نەزانی، یان لە یادی چووبێت، یان بە زۆری بیكات، ئەوە هیچی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٢. گۆڕینی جلوبەرگی ئیحرام.

دروستە بۆ ئافرەتی ئیحرام بەستوو، کە جلوبەرگی خۆی بگۆڕێت جا چ بۆ حاڵەتی پێویست بێت یان پێویست نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٣. دروستە بۆ ئافرەتی ئیحڕام بەستوو گۆرەوی لە بەربکات چونکە پێغەمبەر {ﷺ} ئافرەتی لەمە قەدەغە نەکردووە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٤. تارا بەسەر دانانی ئافرەت: پێغەمبەر {ﷺ} قەدەغەی ئافرەتی کردوە کە نیقاب بکات کاتێك ئیحرامی بەستووە، تارا دان بەسەریا ئەوە لە پێشترە کە دروست نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٥. هیچ شتێك لەسەر ئەو کەسە نیە کە بە نەزانی پێچە دادەنێتو نازانێت حەڕامە، هەنجەتی نەزانینەکەی وەرگیراوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٦. ئەگەر پیاو بە نزیك ئافرەتان تێبەڕی لە حاڵەتی ئیحرام بەستنی، ئەوە دەستی دەپۆشێت بە عەبایەکەیو جلەکەی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٧. ئەگەر ئافرەت تووشی حەیز بوو تەواف (الأفاضة) ی نەکرد.

ئەگەر گەڕانەوەی بۆ ئاسان بێت کە خاوێن بۆوە، دەگەڕێتەوە، وەئەگەر گەڕانەوەی بۆ زەحمەت بێت، ئەوە ئاگەداری خۆی دەبێتو تەوافو سەعی دەکات لە هەمان سەفەر.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٨. پەککەوتوو، نەخۆش:

ئەو کەسەی کە ناتوانێت تەوافی ماڵئاوایی بکات، بە هەڵگیراوی تەوافی پێ دەکرێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٩. ئەگەر هەستی بە هاتنە خوارەوەی خوێنی حەیز کرد لە کاتی تەواف کردن.

لە تەوافەکەی بەردەوام دەبێت، لەبەر ئەوەی بە تەواوی دڵنیا نیە کە خوێنی حەیز هاتووتە دەرەوە، ئەگەر دڵنیا بوو خوێنی حەیز هاتووتە دەرەوە، لەسەری واجبە تەوافەکە بەجێبێڵێتو چاوەڕوان بکات هەتاکو پاك دەبێتەوە، کە پاك بۆوە سەر لە نوێ دەست پێدەکاتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٠. ئەو ژنەی مێردەکەی مردووە بۆی دروست نیە لە ماڵ بێتە دەرەوە سەفەر بکات بۆ حەج هەتاکو (عیددە) کەی تەواو دەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣١. دروسته ئافرەت لە جیاتی پیاو حەج‌و عومرە بکات.

٣٢. دروسته بۆ ئافرەت حەبێك بخوات بۆ ئەوەی سووڕی مانگانەی بپچڕێت لە کاتی جێ بەجێکردنی مەناسکی حەج.

«اللجنة الدائمة»

٣٣.لە بەر کردنی زێر لە حاڵەتی ئیحرام.

هێچی تێدا نیە ئەگەر ئافرەت ئەوەندە زێرەی کە حەز دەکات لەبەری بکات، کاتێك ئەگەر نەکاتە سنووری دەستبلاوی، بەلام دەبێت دایپۆشێت لە پیاوی بێگانە لە ترسی ڕوودانی ئاشوب‌و گرفت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٤. چاکتر وایە بۆ ئافرەت تەواف دووبارە نەکاتەوە کاتێك قەڵەباڵغە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٥. دووبارە کردنەوەی حەج سەبارەت بە ئافرەتان.

وا دەبینین دووبارە نەکردنەوەیان بۆ حەج چاکترو سەلامەترە بۆ خۆیان‌و دینیان، ئەویش لەبەر ئەو تێکەڵیە زۆرەی کە لە گەڵ پیاوان ڕوودەدات لە کاتی تەواف کردن، وەزۆرێك لە ئافرەتان لە هۆیەکانی فیتنەو ئاشوب ئاگەدارو ووریای خۆیان نابن.

«الشيخ إبن باز»

٣٦. ئایا بە پێی شەرع خەرجی حەجی ئافرەت لەسەر پیاو واجبە؟

خەرجی حەجی ئافرەت لەسەر پیاو واجب نیە، ئەگەر هاتوو دۆڵەمەندیش بێت، بەڵکو کردنی ئەم شتە لە بابەتی چاکە کردنە، ئافرەتەکەش حەجی لەسەر واجب نابێت، ئەگەر خەرجی حەجی نەبێت.

«اللجنة الدائمة»

٣٧. ئایا دروستە بۆ ئافرەت بەریەرەکانیو پاڵەپەستوو بکات لە گەڵ پیاوان لە کاتی تەواف کردنی لە دەوری کەعبەدا؟

بەریەرەکانی لە گەڵ پیاوان لە هەموو شوێنێك حەرامە، دەبێت ئەو کاتانە هەڵبژێرێت کە ئەو بەریەرەکانیو پاڵەپەستۆیەی تێدا نەبێت، یان لایەکی تەواف بگرێت، ئەگەرچی دووریش بێت لە کەعبە، چونکە ئەوە پارێزگارترو دوورترە، بۆی لە فیتنەو ئاشوب.

«الشيخ إبن فوزان»

# ﴿ ئافرەتو قورئان ﴾

## ❖ ٧١ وەڵامی تێدایە

١.سەر دەرخستن لەکاتی خوێندنی قورئان.

هیچی تێدا نیە قەیناکە، بەڵام چاکتر وایە بۆ دڵنیا بوون لەکاتی سەجدەی خوێندی قورئان سەری خۆی داپۆشێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٢. خوێندی قورئان بە کۆمەڵ بە یەك دەنگ.

ئەگەر لەبەر خاتری فێربوون بێت ئومێدمان وایە کە هیچی تێدا نەبێتو ئاسایی بێت، بەڵام ئەگەر لەبەر فێربوون نەبێت شەرعی نیە.

«اللجنة الدائمة»

٣. وەلیمە کردنو ئاهەنگ گێران بە بۆنەی تەواو کردنی قورئان.

شتی وا نەزانراوە نە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، نە لە یەکێك لە جێنشینەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)(خلفاء الراشدين)، ئەگەر شتی وایان کردبایە، ئەوە بۆمان دەگوازراوە، بۆیە ئەوە داهێنانێکی نوێیە.(بدعة محدثة).

«اللجنة الدائمة»

٤. تایبەت کردنی ئەو سورەتانە بە رزگار کەرەکان ( الكهف، السجدة، يس، فصلت، الدخان، الواقعة، الحشر ، الملك) لە

پێغەمبەرەوە(ﷺ) جێگیر نەبووەو نەهاتووە، ئەم هەشت سورەتەی بە رزگار کەر ناو نابێت، یان وەصفی کرد بێت، وە ئەوەی بەم شێوە ڕێزی کردوەو جیای کردۆتەوە لە سورەتەکانی تری قورئان، ئەوە لەو بابەتە شتێکی خەراپی کردووە، چونکە ڕیزکردنەکەی دژی ڕیز کردنی موصحەف عثمانیە، وازی لە زۆربەی هەرە زۆری قورئان هێناوە، قورئانیش هەمور سورەتەکانی شیفاو هیدایەتو ڕەحمەتە.

«اللجنة الدائمة»

٥. دەنگ خۆشکردنی ئافرەتی خوێندکار لەلای پیاوان.

دروست نیەو حەرامە ، چونکە ئاشوبو فیتنەیەکی گەورەی تێدایە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦. گوێ گرتنی قورئان لە گەڵ سەرقاڵ بوون بەکارو باری ماڵ.

هیچی تێدا نیەو دروستە، پێچەوانە نیە لەگەڵ فەرموودەی خوای گەورە " فاستمعوا لة وأنصتوا " گوێ بیستی قورئان بن و بێ دەنگ بن. چونکە داوای بێ دەنگ بوونمان لێ کراوە بەپێی توانا ، ئەوەی سەرقاڵ بێت بە پێی توانای بێ دەنگ دەبێت بۆ بیستنی قورئان.

«الشيخ إبن فوزان»

٧. خوێندنی قورئان له كاتی ئیش‌وكارو دەوام.

ئەگەر لەم كاتەدا ئیشی نەبوو ، قەیناكە، هیچی تێدا نیە، تەسبیحات‌و تەهلیل‌و یادی خوا چاكترە له بێ دەنگ بوون، بەڵام ئەگەر خوێندنەكەی سەرقاڵی بكات له شتێك كە پەیوەستە بە كارەكەی، دروست نیە.

«الشيخ إبن باز»

٨. كامەیان چاكترە خوێندنەوەی قورئان یان گوێ گرتنی له ڕێگای كاسێت؟

چاكتر وایە كار بەو جۆرە بكەی ئەوەی بۆ دڵت دروسترو كاریگەرترە له خوێندنەوە، یان گوێ گرتن، چونكە مەبەست له خوێندنەوەی، لێ ووردبوونەوەو تێگەیشتنە.

«الشيخ إبن باز»

٩. نووسینەوەی ئایەتەكان لەسەر شێوەی ئاژەڵێك یان باڵندەیەك (( بە شێوەی نەخشەكاری))

دروست نیە، ئەو جۆرە نووسینە لەو شتە پڕو پووچانەیە كە دەبێت كتێبی خوا لێی بپارێزرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

١٠. هەڵواسینی ئایات‌و فەرموودەو ناوەكانی خوا.

لەسەر دەزگای نووسین‌و تابلۆو ئەمجۆرە شتانە بۆ جوانی، یان بۆ بەیاد هێنانەوە، یان بکرێتە هۆکارێك بۆ برەو سەندنی بازرگانی‌و بازاڕ گەرمی کەل‌و پەل‌و هەڵخەڵەتاندنی خەڵك پێی، بۆ ئەوەی روو لە کڕینی بکەن، ئەوەش لادانی قورئان‌و فەرموودەیە لەو مەبەست‌و ئامانجە پیرۆزانەی کە ئیسلام دەیەوێت بیپێکێت، قورئان کتێبێکی رێنموونی‌و یاسا دانان‌و پەندو ئامۆژگاری‌و رێسایە. نوسینی ئایەتێك لەسەر " کاتژمێر" ئەوە لادانی قورئانە بۆ ئەو مەبەستەی کە بۆی دابەزیوە. بۆیە پێویستە لەسەرمان رێز لە کتێبی خوا بگرین‌و بە گەورە دایبنێین، وە بۆ ئەو شتانە بەکاری بێنین کە بۆی دابەزیوە، بۆ ئەوە دانەبەزیوە هەڵبواسرێت لەسەر دیوا،ر یان نەخشەو نیگاری پێ بکرێت لە کاتی نووسینی.

«اللجنة الدائمة»

١١. نوسینەوەی ئایەتەکانی قورئان بۆ ئەوەی نەخۆش بیخواتەوە، ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە ڕاستەوخەو دوعای (رقیە) بۆ نەخۆش دەکردو فووی بە لاشەکەی دەکرد، وەئەگەر لەسەر ئاو خوێنراو خواردیەوە، ئەوە هیچی لەسەر نیە.

١٢. بەڵام نوسینی سوڕەتێك یان چەند ئایەتێك لە قورئان لە کاغەزێك‌و شوشتنی کاغەزەکە بەئاو، یان بە زەعفەران، یان بە شتی تر، وەخواردنەوەی ئەو جۆرە ئاوە بە ئومێدی بەرەکەت،

ئەوە هەندێك لە زانایەكان ڕێیان پێ داوە، وەكو ئیمام ئەحمەدو ئیبن تەیمیەو ئیبن قەییم.وەریان گرتووە لەوەی كە قورئان بە شێوەیەكی گشتی دەتوانرێ داوای شیفاو چاكبوونەوەی پێ بكرێت.

- وە نەمانزانیوە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو شتەی بۆ خۆی كردبێت، یان بۆ یەكێكی تر كرد بێت، بۆیە چاكترە وازی لێ بێنیت، وە ئەوەی لە شەریعەت جێگیر بووەو هاتووە بەبەس و كاف بزانی ، ئەویش خوێندنەی ڕاستەوخۆیە لەسەر نەخۆش، یان خوێندنەوەیە لە ناو ئاوو خواردنی ئاوەكەیە .

«اللجنة الدائمة»

١٢. قورئان دەخوێنی بەڵام حوكمەكانی نازانیو زۆر هەڵە دەكات.
واجبە لەسەر ئافرەت فێری خوێندنەوەی قورئان بێت بە دەربڕینی ووشەكانی هەتاكو بە بە ڕەوانی دەیڵێت ، وەلەسەری پێویستە ووشەیەك چەند جار دووبارە بكاتەوە، جار دوای جار هەتاكو بەڕاستی دەریدەبڕیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " الذي يقرأ القرآن ويتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران" رواه مسلم.
واتا ئەوەی قورئان دەخوێنیو تەع تەعەی تێدا دەكاتو لەسەر گرانە دوو پاداشتی هەیە"

«الشيخ إبن فوزان»

## ❖ حوکمەکانی سەجدەی قورئان

١٤. سەجدەی خوێندنی قورئان، دەستنوێژ هەڵگرتن و ڕووکردنی ڕووگەی بۆ مەرج نیە.

«الشيخ إبن باز»

١٥. هیچ تەکبیرەی تێدا نیەو سەلام دانەوەشی تێدا نیە، لە کاتی هەڵسانەوە لە سەجدە.

«الشيخ إبن باز»

١٦. شەرعی نیە گوێگر سەجدە ببات، هەتاکو خوێنەرەکە سەجدە دەبات.

«الشيخ إبن باز»

١٧. سەجدەی خوێندنی قورئان سوونەتەو واجب نیە.

«الشيخ إبن باز»

١٨. ئەو دوعاو تەسبیحاتەی کە لە سەجدەی ئاسایی دەکات شەرعیە بۆ سەجدەی خوێندنی قورئانیش هەمان شت بڵێت.

«الشيخ إبن باز»

١٩. بانگدەر بانگی داوو یەکێك قورئان دەخوێنی.

سوونەت وایە وەڵامی بانگ بداتەوە، چونکە ئەگەر بەردەوام بوو لە خوێندن، سوننەتی وەڵامدانەوەکەی دەفەوتێت، بەڵام قورئان خوێندنەکە کاتەکەی فراوانترە.

«الشيخ إبن باز»

٢٠. گواستنەوەی قورئان لە کاتی ماڵ پاککردنەوە

دروستە بۆ ئافرەت بیگوازێتـەوە ئەگەرچـی پـاکو خـاوێن نـەبێت، پاکو خاوێنی گچکە نەك گەورە.( واتە ئەگـەر دەسـتنوێژی نـەبوو نەك جەنابەتدار بێت یان خۆشۆردنێکی لەسەر بێت)

«الشيخ إبن منيع»

٢١. خوێندنەوەی فاتیحە بۆ مردووەکان.

داهێنانێکی نوێیە لەدین( بیدعەیە)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هـیچ بەڵگەیـەك نـەهاتووە کـە لـە سـەر مـردووی خوێنـد بێـت، ئـەوەی شـەرعی بێـت ئەوەیـە کـە مرۆڤـــ دەبێـت داوای لێخۆشـبوونو ڕەحمەت بۆ دایكو باوکی بکات.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٢. کامەیان چاکترە دەنگ بەرز کردن لە کاتی خوێنـدنی یـان بـە نهێنی خوێندن؟

ئەوە بەپێی حاڵەتی مرۆڤەکە دەگۆڕێت، ئەگەر هـاتوو بـە دەنـگ خوێندنەکەی گورجو گۆڵترو کاریگەرترو ترسەکەی زیاتر بوو، ئەوە با بە دەنگ بیخوێنێـت، بەڵام ئەزیەتـدانی کەسـێکی تێـدا نـەبێت، وەئەگەر هاتوو بە نهێنـی خوێندنەکـەی ترسـەکەی زیـاتر بێـت بـا بەنهێنی بخوێنێت؟ وەئەگەر وەکو یەك یەکسان بـوو، ئـەوە سـەر پشکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٣. قورئان خوێندن لەکاتێك کە تەسجیل ئیش دەکات.

دروستە هەتاکو ئەو کاتەی کە ئامێری تەسجیلەکەت سەرقاڵت نەکات لە خوێندنەکەو لە ووردبوونەوە لەوەی کە خوێندووتە.

«اللجنة الدائمة»

٢٤. لە گەڵ قورئانێکی هەڵە نوسراو یان دڕاو چی بکات؟

دەسوتێندرێتو لە ژێر چاڵ دەنرێت لە شوێنێکی پاکی دوور لە ڕۆیشتنی خەڵك، وە دوور بێت لەوەی پیسایی پێ ی بگات.

«اللجنة الدائمة»

٢٥. دەنگ بەرز کردنەوەی ئافرەت لەکاتی خوێندنیدا.

ئەگەر هاتوو بە تەنها لە ماڵی خۆی بێت، ئەوە بۆی هەیە بە دەنگ بخوێنێت.

«اللجنة الدائمة»

٢٦. خوێندنەوەی قورئان بکەیە دیاری بۆ کەسانی تر.

هیچ بەڵگەیەك لە کیتابو سوننەو هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نە هاتووە ببێتە بەڵگە لەسەر شەرعیەتی کردنە دیاری خوێندنەوەی قورئان بۆ دایكو باوكو کەسانی تریش.

- بەڵکو خوای گەورە خوێندنی قورئانی تەشریع کردوە بۆ سوود وەرگرتنو ووردبوونەوە لە ماناکانی.

وە هەندێك زانا بۆ دروست بوونی ئەم شتە چوونە، بەڵام ئەوەی ڕاستترو دروستتر بێت قسەی یەکەمە، ئەگەر کردنە دیاری خوێندنەوەی قورئان شەرعی بووایە، ئەوە پێشینە چاکەکانمان دەیان کرد.

«الشيخ إبن باز»

٢٧. دانانی قورئان لەناو ئوتومبێل بە مەبەستی بەرەکەت.

ئەگەر مەبەست لە دانانەکەی بۆ خۆ پاراستن بێت لە جنۆکەو شەیتانەکان، ئەوە شەرعی نیە، بەڵام ئەگەر هاتوو بۆ ئەوە لەناو ئوتومبێلی دانا بێت، بۆ ئەوەی جار بەجار بیخوێنێ، ئەوە هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن باز»

٢٨. ئەو کاسێتانەی کە ئایاتو فەرموودەی تێدایە.

گوناه نیە ئەگەر بباتە ئاوەدەست، چونکە ئایاتو فەرموودەکان دیار نین لەسەر کاسێتەکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٩. نووسینی ئایەتو هەڵگرتنی، بە مەبەستی پاراستنی لە گیرو گرفت.

دروست نیە، چونکە قورئان لەبەر ئەو شتە دانەبەزیوە، بەڵکو ئەوەی بۆمان هاتووە قورئان دەبێت لەسەر نەخۆش بخوێنرێت،

بۆیە ئەم شتە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو هۆکاریکە بۆ بێ رێزی قورئان.

«الشیخ إبن فوزان»

٣٠. بە خوێندنەوەی سورەتی (الأخلاص) سێ جار، خێرو پاداشتی تەواو کردنی هەموو قورئان بەدەست دێنێت.

بەڵام ئەوەی تەنها ئەو سورەتە دەیخوێنێتەوەو دووبارەی دەکاتەوە، لەو سورەتە تێناپەڕی، وەکو یەکێك نیە کە هەموو قورئان دەخوێنێت.

«اللجنة الدائمة»

٣١. کامەیان باشترە خوێندەوە لەسەر موصحەف یان خوێندنەوە بە ئەزبەر لە دڵەوە.

خوێندنەوە لە موصحەف چاکترەو نزیکترە بۆ ڕێكو پێکیو ووردبوونەوە لێی، بەڵام ئەگەر هاتوو بە ئەزبەر خوێندنەوەی لە دڵەوە بۆ دڵەکەی پارێزراوترو بە ترستر بوو، ئەوە با بە ئەزبەر بخوێنێت.

«الشیخ إبن فوزان»

٣٢. دووبارە کردنەوەی ئایاتی ڕەحمەتو ئازارو ئەشکەنجە.

هیچی تێدا نیە، ئەگەر هاتوو بە دووبارە کردنەوەکەی ترسو ووردبوونەوەی زیاتری بۆ پەیدا بوو.

«الشيخ إبن باز»

٣٢. دەگرییێت لە کاتی دوعا کردن بەڵام ناگرییێت لە کاتی بیستنی قورئان.

ترسان لە کاتی خوێندنی قورئان گرنگترو گەورەترە لەوەی کە لە دوعا کردن بترسێت.

❖ بەڵام هەندێك جار بە هەڵبژاردنی خۆی نیە، دەروونەکەی جولە دەکاتو دەلەرزێت لەکاتی دوعا کردن، بەڵام نا لەرزێتو ناجولێت لەکاتی بیستنی هەندێك لە ئایەتەکان.

«الشيخ إبن باز»

٣٤. تەواو کردنی (ختم) قورئان لە ڕەمەزان.

واجب نیە، بەڵکو سوونەتە ئەگەر بۆی بکرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٣٥. ڕوو کردنە ڕووگە لە کاتی خوێندنی قورئان.

لە هەر پەرستشێك سوونەتە ڕوو لە ڕووگە بکەی، بەڵام ئەگەر ڕوو لە ڕووگە نەکات، هیچ نیەو ئاسایییە.

«الشيخ إبن فوزان»

٣٦. چوونە ناو گەرماو بە قورئان.

دروست نیه، بەڵام ئەگەر ناچار کرا بیباتە گەرماو لە ترسی ئەوەی بدزرێت ئەگەر لە دەرەوە جێی بێڵێت، بۆی دروستە بیباتە گەرماو لەبەر حاڵەتی پێویستی.

«اللجنة الدائمة»

٣٧. لەیاد چوونی قورئان.

ڕای ڕاستو دروستر ئەوەیە کە گوناه بار نابێت بەو لەیاد چوونە، بەڵام بۆ موسڵمان پێویستە گرنگو بایەخی بە ئەزبەر کراوەکەی بدات لە قورئان، توند بیگرێت هەتاکو لەیادی نەکات.

❖ بەڵام ئەو فەرموودانەی کە گەفو هەڕەشەی تێدایە بۆ ئەو کەسەی کە قورئانی ئەزبەر کردووەو پاشان لە یادی چووە، فەرموودەی بێ هێزو لاوازن.

«اللجنة الدائمة»

٣٨. بەکارهێنانی ئایەتەکانی قورئان بۆ گاڵتەو گەپ، دروست نیە، وەکو بەکارهێنانی " خذوه فغلوه" یان " سیماهم في وجوههم"، بەڵام ئەگەر هاتوو چەند وشەیەك بێتو بێتە سەر زار، مەبەستی گێڕانەوەی ئایەتێکی قورئان نەبێت. ئەوە دەبێت دروستە.

«اللجنة الدائمة»

٣٩. گۆڕانو لابردنی قورئان لە ئێزگەی قورئان، بۆ گوێبستنی شتێکی تری وەکو هەواڵ.

هیچی تێدا نیە، چونکە هەموو شتێك کاتی خۆی هەیە، وە ئەنجام دانی ئەو کارەش ناچێتە قالبی پشت کردن لە قورئان .

«اللجنة الدائمة»

٤٠. خوێندنەوەی قورئان بە ئەزبەر، بەبێ دەستنوێژ.

هیچی تێدانیە، بەلاَم ئەگەر دەست لێدانی قورئانی تێدا بێت، دروست نیەو نابێت، مەگەر بە دەستنوێژ نەبێت.

٤١. کۆچ کردن لە قورئان چەند جۆرێکە:

- کۆچ کردن لە خوێندنەوەی.
- کۆچ کردن لە ووردبوونەوەو تێگەیشتنی ماناکانی.
- کۆچ کردن لە ئیش کردن پێ‌ی‌و بکرێتە حاکم.
- کۆچ کردن لەوەی کە داوای شیفای پێ بکەی.
- کۆچ کردن لە بیستنی.

قال تعالی " وقال الرسول یا رب إن قوم اتخذوا هذا القرآن مهجورا " واتە ئەی پەروەردگارم گەلەکەم لەم قورئانە کۆچیان کردوە.

«الشیخ إبن فوزان»

٤٢. ئەرکی شەرعی موسڵمان پارێزگاری کردنە لە قورئان‌و دوور کەوتنەوەیە لە هەموو جۆرەکانی کۆچکردن .

«اللجنة الدائمة»

٤٣. دەست لێدانی ئەو کاسێتەی کە قورئانی لەسەر تۆمار کراوە.

هیچ گوناهێك نیە لە هەڵگرتنی، بۆ کەسێك کە جەنابەت دار بێت.

«اللجنة الدائمة»

٤٤. خوێندنی قورئان بۆ حەیزدار.

هیچی تێدا نیە قورئان بخوێنێت بەبێ دەست لێدانی قورئان ، ئەوەش بە پێی ڕای ڕاستترو دروستتر لە دوو ڕای جیاوازی زانایەکان، وەبۆی هەیە بیگرێت بە بەکارهێنانی بەربەستێك، وەکو پارچە قوماشێکی خاوێن.

٤٥. بەڵام جەنابەتدار بە هیچ شێوەیەك بۆی نیە قورئان بخوێنێت.

«الشيخ إبن باز»

٤٦. سڵاو کردن لەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ.

دروستە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی جێگیر نەبووە بۆ قەدەغە بوونی، پاشان دەگەڕێتەوە سەر خوێندنی خۆی، بەو شێوە دوو خێرو چاکە بۆ خۆی کۆ دەکاتەوە.

«اللجنة الدائمة»

٤٧. کردنەوەی پێشبڕکێی ئەزبەر کردنی قورئان بۆ ئافرەتان، لێژنەی دادوەریکردنەکەو بڕیاردانەکە لە پیاوانە، هیچی تێدا نیە بە چەند مەرجێك :

- له كاتی خوێندنی قورئان به تەرتیل دەنگی خوی ناسك و بەناز نەكات.
- دەبێ به باڵاپۆشینێكی شەرعی باڵای خۆی پۆشی بێت.
- به تەنیا بوونی (خەڵوەتی) تێدا نەبێت لەگەڵ بێگانە.

«اللجنة الدائمة»

٤٨. وەرگرتنی پاداشت لەسەر فێركردنی قورئان.

دروسته پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " إن أحق ما أخذتم عليه أجرا كتاب الله" رواه البخاري واته له هەموو شتێك ڕەواتر بۆتان كه پاداشتی لەسەر وەربگرن كتێبی خوایە"

«اللجنة الدائمة»

٤٩. خوێندنەوەی قورئان به هەموو حاڵەتێك.

هیچی تێدا نیەو دروسته جا چ به ڕاكشان بێت لەسەر قەروێلە، یان لەسەر زەوی، یان به ڕاوەستان، یان به دانیشتن جیاوازی نیه.

«اللجنة الدائمة»

٥٠. وتنی " صدق الله العظيم" دوای تەواو كردنی خوێندنی قورئان: داهێنانێكی نوێیه چونكه نه پێغەمبەر (ﷺ)، نه جێنشینەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، نەهاوەڵەكانی تری نەیان كردووە، لەگەڵ زۆر قورئان خوێندنیان، پێغەمبەر(ﷺ)

فەرموویەتی " من عمل عملاً ليس علية أمرنا فهو رد " واتە ئەوەی ئیشێك بكات كە لە دینی ئێمەدا نەبێت، ئەوە ڕەت دەكرێتەوەو وەرناگیرێت.

«اللجنة الدائمة»

٥١. ماچ كردنی قورئان.

نەمانزانیوە كە بەڵگەیەكی شەرعی لەسەر ماچ كردنی قورئانی پیرۆز هەبێت.

«اللجنة الدائمة»

٥٢. دانانی قورئان لەسەر زەوی.

وا چاكترە لە شوێنێكی بەرز دابنرێت، بەڵام ئەگەر نەگونجا ئەوە دروستە لەسەر پارچە قوماشێكی خاوێن لەسەر زەوی دابنرێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٣. خوێندنی قورئان بە شیوەی " ترتيل"

واجب نیە، بەڵام لە ئادابەكانی خوێندنە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٤. خوێندنی بە پەلە.

دروستە بە مەرجی ئەوەی قرتانو لابردنی هیچ پیتێكی تێدا نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٥. خوێندنەوەی قورئان لە ماڵەوە دوای نوێژی بەیانی هەتاکو خۆر هەڵدێت.

ئافرەت ئەگەر دوای نوێژی بەیانی دابنیشێت لە شوێنی نوێژەکەی یادی خوا بکاتو قورئان بخوێنێت، هەتاکو خۆر بەرز دەبێتەوە، پاشان دوو رکعەت نوێژ بکات، ئەوە ئەو پاداشتەی پێ دەگات کەلە فەرموودەکاندا هاتووە، پاداشتی بکەری ئەم کارە حەجو عومرەیەکی تەواوە، فەرموودەکانیش هەندێکیان دەبنە پاڵپشت بۆ هەندێك، فەرموودەی باشن.

«الشيخ إبن باز»

٥٦. خوێندنەوەی ئەم سورەتانە ڕۆژانە ( یس – الدخان – الوقعة– الملك)

لە فەرموودە ڕاستو دروستەکانی پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر نەبووە، بەڵام ئەرکی شەرعی لەسەر موسڵمان ئەوەیە هەموو سورەتەکانی قورئان بە زۆری بخوێنێت.

«اللجنة الدائمة»

٥٧. خوێندنی سورەتەکانی بە پێی ریز بەندی موصحەف.

ئەوها چاکترە سەرەتا بە ( الفاتحة) پاشان بە ( البقرة) پاشان بە (آل عمران) هەتاکو بە سورەتی ( الناس) کۆتایی پێ دێنی، بەلام دەستپێکردنی خوێندنی بە سورەتی (الناس) پاشان (الفلق)

پاشان ( الإخلاص) ئیتر بۆ سەرەوە بۆ مەبەستی فێربوون هیچی تێدا نیە.

«اللجنة الدائمة»

٥٨. ئایا ئەو کەسە پاداشتی بۆ هەیە تەنها سەیری قورئان بکات، لێوەکانی نەجولێنێت؟

بە خوێنەر دانانرێت و پاداشتی خوێندنەکەی بەدەست ناگات، هەتاکو قورئانەکەی بە دەنگ دەرنەبڕێت، ئەگەرچی دەوروبەر یشی گوێیان لێ نەبێت.

«الشیخ إبن باز»

٥٩. بەکرێ گرتنی قورئان خوێنێك، بۆ ئەوەی لە ئاهەنگەکان بخوێنێت.

دروست نیە، ئەوەی پاداشت وەرگرێت لەسەر خوێندنی قورئان، ئەوە گوناهبارەو هیچ پاداشتی خێری بۆ نیە. چونکە خوێندنی قورئان پەرستشەو( عبادەیە) نابێت پەرستشیش بکرێتە هۆکارێك بۆ بە دەستهێنانی شتێك لە دونیا.

«اللجنة الدائمة»

٦٠. پاداشت وەرگرتن لەسەر خوێندنی دروست نیە، بەڵام لەسەر فێرکردنی دروستە

٦١. خوێندنی قورئان لە قەبران.

داهێنانێکی نوێیە(بیدعەیە) ، نە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نە لە هاوەڵەکان، شتی وا نەهاتووە.

٦٢. بەڵام دوعا کردن بۆ مردوو لە لای قەبرەکەی هیچی تێدا نیە، لەسەر قەبرەکەی ڕادەوستێت و ئەوەندە دوعایەی پێی دەکرێت بۆی دەکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٣. بۆ حەیزدارو نیفاسدار دروستە ئەو ئاوە بەکار بێنێت کە قورئانی لەسەر خوێندراوە کاتی سوڕی مانگانەی، چونکە لەوانەیە بە دواخستنی بەکار هێنانی ئەو ئاوە ، ئافرەتەکە زیانی پێ بگات.

«الشيخ إبن جبرين»

٦٤. دانانی قورئان لەلای سەری منداڵ.

بە مەبەستی پاراستنی لە جنۆکە دروست نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٥. ئایا دروستە ئافرەتی جادو لێ کراو ببرێت بۆ لای یەکێك لە شێخەکان بۆ قورئان لەسەر خوێندنی؟

دروستە بە چەند مەرجێك:

١. دەبێ ئەو شێخە ناسراو بێت لەناو خەڵك بە چاکی و دینداری و سەلامەتی بیروباوەڕەکەی.

٢. قورئان لەسەر خوێندنی ئافرەتەکە دەبێت بە خۆداپۆشینو بالاپۆشینێکی تەواو بێت.

٣. بە تەنیا بوون (خەڵوەت) لە نێوانیان ڕوونەدات.

٤. دەبێ شێخەکە ئاگەدار بێتو وریا بێت لە ئاشوبو فیتنە، بەشێوەیەك نابێت سەیری ئافرەتەکە بکاتو دەستی لێ بدات.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٦. ئایا حەیزدار سەجدەی خوێندنی قورئان ببات؟

ڕای ڕاستو دروستر ئەوەیە کە سەجدەی خوێندنی قورئانو سەجدەی شوکر، بۆ خوێنەرو گوێگر دەستنوێژ هەبوون مەرج نیە، چونکە سەجدە حوکمی نوێژی نیە.

«اللجنة الدائمة»

٦٧. خوێندن لەسەر موصحەف لە ناو نوێژدا.

دروستە لە ڕەمەزانو کاتەکانی تر، لە نوێژی فەرزو سوننەت، وەلەکاتی نوێژە بە دەنگەکان، ئەگەر پێویستی کرد.

«اللجنة الدائمة»

٦٨. خوێندنی قورئان بۆ حەیزدار.

ئەو فەرموودانەی باس لە قەدەغەکردنی حەیزدار دەکەن لە قورئان خوێندن، فەرموودەی ڕاستو دروست نین، وەئەگەر ڕاستو دروستیش نەبن نابنە بەڵگە، بەڵام وا چاکترە حەیزدار

قورئان نەخوێنێت مەگەر بۆ ئەو کەسەی پێویستی پێ هەبێت، وەکو ئەو کەسەی مامۆستایە یان قوتابی زانستە یان هاوشێوەی ئەوانە بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٩. خوێندنی قورئان بۆ حەیزدار بە تەماشا کردنی چاوەکانی، بەبێ دەربڕینی ووشەکانی بە زمان.

هیچی تێدا نیەو دروستە، پێشەوا نەوەوی دەفەرمێت: دروستە بەبێ هەبوونی جیاوازیو دووبەرەکی

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٠. ئایا جەنابەتدار قورئان بخوێنێت؟

- دروست نیە نە بە ئەزبەر نە لەسەر قورئان بخوێنێت هەتاکو خۆی دەشوات.

- وە بۆی هەیە کتێبی تەفسیرو فەرموودەو شتی دیکە بخوێنێتەوە بەبێ خوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی کە لە خۆیان گرتووە.

«الشيخ إبن باز»

٧١. ئایـا دوعـاو پاڕانــەوەو داوای لێخۆشـبوونی حـەیزدار گـیرا دەبێت؟

بەڵێ دروستە، بەڵکو سوننەتە بۆ حـەیزدار زۆر دوعـاو پارانـەوەو داوای لێخۆشبوون بکات بە تایبەتی لە کاتە پیرۆزەکـان، جـا هـەر کاتێـك هۆکارەکـانی گـیرا بـوونی دوعـا هـەبوو، خـوای گـەورە پاڕانەوەکە لە حەیزدارو کەسانیتریش گیرا دەکات.

«الشيخ إبن جبرين»

# ﴿ ئافرەتو خەون بینین﴾

❖ (٦) وەلامی تێدایە.

❖ دەروونی ئادەمیزاد بە پەرۆشە بۆ زانینی ئەو شتەی لە دوا ڕۆژ بەسەری دێت لە گۆڕانکاریەکانو حاڵەتەکان، ئەو شتەش کاروباری پەنهانو شاراوەیە (الغیب)، جگە لە خوا کەسیتر نازانێ، هەر وەك چۆن خوا دەفەرمێت ( ولله غیب السموات والأرض)

❖ هەندێك لە خەڵکی بۆ شارەزا بوونو زانینی زانستی غەیب کەوتونەتە شوێن ڕای چادووگەرەکان، ئەوەش حەرامە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " من أتی کاهناً، فصدقه بما یقول ، فقد کفر بما أنزل علی محمد (ﷺ)" رواه أبو داود. واتە ئەوەی بچێتە لای جادوگەرێكو باوەڕی پێ بکات، ئەوە کافر بووە بەو قورئانەی بۆ محمد (ﷺ) دابەزیوە.

❖ بەلام بۆ ئەهلی ئیمان خوای گەورە خەونی ڕاستی پێ بەخشیون، مزگێنی چاکەیان بەو خەونە پێ دەبەخشێ، ئاگەداریان دەکاتەوە لە خەراپە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ( لم یبق من النبوة الأ المبشرات، قالوا وما المبشرات قال الرؤیا الصالحة) رواه البخاري. واتە هیچ شتێك لە پێغەمبەرایەتی نەماوە

تەنها مزگێنی بەخشەکان نەبێت، ووتیان مزگێنی بەخشەکان چین ،ووتی خەونی چاکە.

١. ئەوەی خەوتوو دەیبینێ سێ جۆرە.

– خەون بینین (الرؤیا): ئەوە لە لای خوایەوەیە، بەلأم لە خەونە بینراوەکە لایەنی خێرو چاکە زاڵ بێت.

– الحلم: گاڵتە کردنی شەیتانە بە مرۆڤ، بە تایبەتی ئەگەر بەبێ دەستنوێژ نوستبێت، یان بەبێ یادی خوا نوستبێت.

– باس‌و خواسی دەروون: ئەو شتەی کە خەوتوو دەیبینی لەو وێنەو هەڵوێستانەی کە زاڵە لەسەر بیروهۆشی لە کاتی بە ئاگا بوونی، وەکو ئەو ئومێدانەی کە دەیخوازێ‌و، هەروەها ئەو شتانەی کە لە ئەنجامی زۆر خواردن‌و تەسك بوونەوەی بۆریەکانی هەناسە پەیدا دەبێ، شتیتریش.

ئاگەدارکردنەوە: زۆرینەی خەڵکی لە نێوان گەمەو کاڵتە کردنی شەیتان‌و خەونی چاك جیا ناکەنەوە، بە غەم‌و پەژارەوە لە خەو هەڵدەستنەوە، لە بەر چەند شتێك کە لە خەونەکەیان بینیویانە، ئەو شتانەش لە سروشتی شەیتانەوە بۆیان دێت.

٢. نیشانەکانی تێکەڵ‌و پێکەڵی خەون‌و و گەمەو گاڵتە کردنی شەیتان.

- کەسی خەوتوو لە خەونەکەی چەند دیمەنێکی تێکەڵو پێکەڵو پێچەوانەی یەك دەبینێت، سەرەتایەکەی لە کۆتایەکەی نازانێت.
- بەوەی کە هەندێك خەڵکی نەخۆش لە خەونەکەی شتێك دەبینی بە نەخۆشیەکەی دەچێت، وەکو ئەوەی یەکێك سەرمای بوبێت لە خەونەکەی رووبارو بەفر ببینێت...یان تاو لەرزی هەبێت لە خەونەکەی خۆرو ئاگر ببینێت.
- یان شتێك دەبینیّ لە کاتی بە ئاگا بوونی خۆی پێوە خەریك کردووە.

٢. ئادابی شەرعی لە کاتی بینینی خەونی خەراپ (( ئەویش (٩) نۆ ئادابە))

- پشتی خۆی بە خوا ببەستێت لە خەراپەی ئەو خەونەی بینیبووی بووی، سێ جار.
- داوای پشتو پەنا لە خوا بکات لە خەراپەو شەڕی شەیتان سێ جار.
- بۆ هیچ کەسێك نەگێڕێتەوە.
- سێ تف لە لای چەپی بکات.
- داوای لێکدانەوەی نەکات.
- خۆی وەربگێڕێت لەو تەنیشتەی کە لە سەر بووە.

- داوا لە خوا بکات لە خێرو چاکەکەی.
- باوەڕی وابێت کە زیانی پێ ناگەیەنێت.
- دوای خەونەکە نوێژ بکات.

٤. ئادابی شەرعی لە کاتی بینینی خەونی چاك (( چوار ئادابە))

- بڕوای وابێت ئەم خەونە لە خواوەیە.
- سوپاسی خوا بکات لەسەر خەونەکە.
- داوای لێکدانەوەی بکات
- تەنها بۆ کەسێك باسی بکات کە خۆشی دەوێت.

٥. نیشانەکانی خەونی ڕاست :

- نەبوونی ئەو نیشانانەی کە رابورد لە خەونی خەراپ.
- دەبێ ئەو کەسەی خەونەکەی بینیوە ڕاستگۆ بێت لە قسەکانی
- دەبێ سەرەتاییەکەی لە کۆتایەکەی بزانێت، نابێت پچڕ پچڕ بێتو پەیوەندی بەیەکەوە نەبێت.
- دەبێ مزگێنی بەخش بێت بە پاداشت لە سەر چاکە، یان ئاگەدارکەرەوە بێت لە خەراپەو سەرپێچی

٦. مەسەلەی حەڕام بوونی درۆ لە کاتی گێرانەوەی خەون.

گوناهێکی زۆری تێدایە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( من أفرى الفرية أن ترى عينه مالم تر ))رواه البخاري. واتە لە درۆیە هەرە گەورەکان ئەوەیە بڵێی، ئەو خەونەم بینیوە، نەشیبینیبێت.

٧. داوا لە چ کەسێك بکات بۆ لێکدانەوەی خەونەکەی؟

ئەو کەسەی متمانەت بە زانستو دینو چاکیەکەی هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) ( إذا رأى أحدكم رؤيا فلا يحدث بها إلا ناصحاً أو عالماً ) رواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي. واتە: ئەوەی خەونێکی بینی با بۆ هیچ کەسێك نەیگێڕێتەوە مەگەر بۆ ئامۆژگارکارێك یان زانایێك.

٨. تێبینی: پێویستە لەسەر موسڵمان وریای خۆی بێت لەم بابەتە، زۆر گرنگو بایەخ بە خەونی تێکەڵو پێکەڵ نەداتو زۆر پرسیار دەربارەی نەکات. وەداوای لێکدانەوەی خەونێك نەکات، مەگەر خەونێك بێت کە شایەنی لێکدانەوە بێت،وە ئەگەر وازی لە لێکدانەوەی هەموو خەونێك هێنا، ئەوە ئاسایەو هیچ گوناهی لەسەر نیە.

٩. (ئاگەداری) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ شتێك جێگیر نەبووەو نەهاتووە، بەخوێندنەوەی چەند سورەتێکی دیاری کراو، یان چەند ویردێك، خەون ببینیو خەونت بۆ بێنێت، ئەو جۆرە شتانە هەمووی داهێنانی تازەیە (بیدعەیە) لە دین.

## ﴾ ئافرەتو وەسوەسە ﴿

### ❖ ٢٣ وەلامی تێدایە.

١. خولانەوەی شتێکە لە دەروون کە نامێڵێت ئارام بێتو ئوقرە بگرێت.

٢. هۆیەکانی وەسوەسە.

– کەمی زانست: زانست لابەری هەموو شتێکە کە مرۆڤ بە خەیاڵی دادێت، نەزانینیش ئەو شتە بۆ مرۆڤ دێنێت کە زیانی پێ دەگەیەنێت.

– لاوازی ئیمانو کەمی یادکرنی ڕەحمان.

ئەوەش لە ئەنجامی گەلێك شت پەیدا دەبێت، لە کەمی کردەوەی باشو زۆر ئەنجام دانی تاوان، بە پێچەوانەی ئیمانداری بەهێز، شەیتان لێی ڕا دەکاتو بە هیچ ڕێگایەك ناتوانێت بۆی بچێت.

– ڕوو چوون لە دالغە لێدانو خەیاڵ.

ئەو دالغە لێدانو خەیاڵو بیرکردنەوەی کە هیچ داواکاریەکت لە گەڵی جێبەجێ نابێت، دەبێتە هۆی وەسوەسە بۆ مرۆڤ ، ڕێگای شەیتان ئاسان دەکات بۆی.

٣. هەڵبڕینی دەنگ بۆ دوور کەوتنەوە لە وەسوەسە لە نوێژە نهێنیو بێ دەنگەکان.

هیچی تێدا نیە قەیناکە، شەرعیە بۆ نوێژکەر فوو لە چەپی بکات کاتێك لەناو نوێژە، داوای پشتو پەنا لە خوا بکات لە شەیتان (۳) سێ جار (دەنگ بەرزکردنەوەکە بەقەد ئەوەی خۆی گوێ لێ بێت.)

«الشیخ إبن باز»

٤. ئاگەداری: ئەگەر لە ناو نوێژەکە کەوتیە گومان ئایا سێ ڕەکعەتت کردووە یان چوار، بیکە سێ ڕەکعەتو نوێژەکە تەواو بکە، پاشان دوو سەجدەی سەهو ببە پیش سەلام دانەوە

«الشیخ إبن باز»

٥. نابێت لەبەر وەسوەسە زۆر نوێژەکە دووبارە بکاتەوە.

بەڵکو پێویستە سەجدەی سەهو ببات، ئەگەر شتێکی وای کردبێت پێویست بکات.

«الشیخ إبن باز»

٦. گومانی هەبوون لە هاتنە دەرەوەی با :

ئەگەر گومانی وابوو شتێك لە پێشەوەی یان لە پشتەوەی هاتە دەرەوە، ئەوە دەستنوێژەکەی بەتاڵ نابێتو گرنگی پێ نادات، چونکە ئەوە لە وەسوەسەی شەیتانە.

«الشیخ إبن باز»

### ❖ جۆری وەسوەسەکان.

٧. وەسوەسە لە بیرو باوەڕ( عقیدە): هەروەکو لە فەرموودەکە هاتووە شەیتان پرسیار لە مرۆڤەکان دەکات " کێ ئەوەی دروست کردوە..... هەتاکو دەڵێ کێ خوای دروست کردوە" چارەسەرەکەی.

- بڵێت: (آمنت بالله ورسوله) واتا ئیمانم بەخواو پێغەمبەرکەی هێنا.
- (قل هو الله أحد) بخوێنێت.
- تف لە لای چەپی بکات.
- داوای پشتو پەنا لە خوا بکات لە شەیتان.
- واز هێنان لە بەدوا چوونی وەسوەسەکە.

٨. وەسوەسە لە کاتی جێبەجێ کردنی پێویستیەکەی (تارەت) هەندێك ئافرەت کاتێکی زۆر لە گەرماو دەمینێتەوە.

٩. وەسوەسە لە شکانی دەستنوێژ.

هەندێك لە ئافرەتان ئەو گرفتەی هەیە، ئایا شتێك دەرچووە( لە پێشەوەو پاشەوە) یان دەرنەچووە، چارەسەرمکەشی.

گرنگی پێ نادات، یان ئەو شتانە پشت گوێ دەخات، هەتاکو دەنگ یان بۆنی نێت.

١٠. وەسوەسە لە پاکژبوونی ئاو.

زۆر خەڵك هەیە ئەگەر شتێك پێی بكەوێ، ڕاستەوخۆ جلوبەرگی دەگۆڕێت یان دەیشوات، ئەگەر نەشزانێت ئایا ئەم شتە پاكژە یان پیسە

- ئەوەی ڕاست و دروست بێت : شوشتنی شتەكە واجب نیە، چونكە لە بنەڕەتدا (الأصل) هەموو شتێك پاكژە.

١١. وەسوەسە لە دەستنوێژدا: شەیتان وەسوەسە دەخاتە ناو دڵی، بۆ نموونە لەو كاتەی كە سەری دەسڕێتەوە پێی دەڵێ : ئاوت لە لووتت وەرنەكردووە، واتە (مضمضمة)ت نەكردوە، یان نیەتت نەهێناوە.

چارەسەرەكەی:پێی دەڵێین دەستنوێژەكەت تەواو بكە، داوای پشت و پەنا لەو خوا بكە، گوێ بەو سوەسانە مەدە.

١٢. وەسوەسە لە پاكژ بوونی زەوی.

زۆر كەس هەیە قاچی دووبارە دەشواتەوە دوای دەستنوێژ شوشتن، كاتێك لەسەر زەوی یان لەسەر ڕایەخ بە پێی پەتی دەڕوات، وە نوێژ ناكات مەگەر لەسەر بەڕماڵێكی تایبەت نەبێت.

ئەوەی ڕاستی بێت زەوی هەموو پاك و خاوێنە.

١٣. وەسوەسە لە ناو نوێژ.

هەندێك ئافرەت هەیە كاتێك دەستی بە خوێندنی سورەتێك كرد دوای فاتیحە، شەیتان بۆی دێت و پێی دەڵێ: تۆ فاتیحەت

نەخوێندوە، گومانی بۆ دروست دەکات لە ژمارەی رەکعەتەکان، لە نیەت هێنان، یان لە چەند بارە کردنەوەی تەکبیرەی ئیحرام، یان لە تەحیات خوێندن.

چارەسەرەکەی: پشتی خۆی بەخوا ببەستێت لە شەیتان، ئەو وەسوەسەش پشت گوێ بخاتو کۆتایی پێی بێنێت.

١٤. ئاگەداری: بزانە ئەی ئەو کەسەی بەو وەسوەسانە تاقی کراوەتەوە:

نیەت: مەبەست هەبوونو سووربوونە لە کردنی شتێك، شوێنەکەشی دڵە، هیچ پەیوەندیەکی نیە بە زمان.

ئەوەی دانیشت بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن، ئەوە نیەتی دەستنوێژی هێناوە، وە ئەوەی هەڵساوە بۆ نوێژکردن، ئەوە نیەتی نوێژی هەیە، پێویست ناکات خۆی ماندوو بکاتو زۆر لە خۆی بکات.

١٥. چارەسەرکردنی وەسوەسە:

- داو کردنی زانستی شەرعی: چونکە خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە کردنی ئەو شتانەی کە هیچ بنچینەیەکی نیە لە شەرع، وەشەیتانیش لێی دوورتر دەبێت.

ئەو کەسەی کە تووشی وەسوەسە بووە: هەموو لە ئەنجامی نەزانینی شەرعە. ئەگەر زانستی هەبوایە ئەو شتانەی کە دەیکرد وازی لێ دەهێناو نەیدەکرد.

- بەهێز کردنی ئیمانو بەردەوام یادکردنی ڕەحمان.
یادی خوا قەڵایەکی پۆڵایینە، بەربەستێکی جیاکەرەوەیە، چەکێکی زۆر بەهێزە دژی شەیتان، بە تایبەتی لەناو کۆمەڵی ویردەکان، ویردی بەیانیو ئێواران، ویردی پێش نوستنو چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەو ویردی دیکەش.
- بە دوا نەچوونو قوڵ نەبوونەوە لە گەڵ دالغەو خەیاڵ، وەهەوڵو کوشش کردن بۆ نەهێشتنی.
نەیکاتە پیشەو کاری خۆی، چونکە چەند لێی قوڵ بێتەوە، ئەوەندە زیاتر لەسەری زاڵ دەبێت، بەلام ئەگەر بەرگریو کۆششی بۆ نەهێشتنی کرد، ئەوە بە ئیزنی خوا لادەچێت.
- داوای پشت بەستن لە خوای گەورە ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بکاتو دوعاو نزا بکات.
خوا دەفەرمێت (( وإما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله ))
ئەگەر وەسوەسەیێکت لە لایەن شەیتانەوە بۆ هات، ویستی لە خشتەت بەرێتو تووشی هەڵەت بکات، ئەوە تۆ پەنا بگرە بەخواو پشت بەو ببەستە. کە پشتت پێی بەست، بزر دەبێتو وەکو مێش بچووک دەبێتەوە.
❖ دوعاو پاڕانەوە لە هۆکارە هەرە بەهێزەکانە بۆ لابردنی وەسوەسە

## ❖ حاڵەتەکانی گومان:

١٦- حاڵەتی یەکەم: تەنها گومانێك بێتو بەسەر دڵیدا بێت، بۆی یەکلا نەبووبێتەوە، ئایا دەستەکانی شۆردووە یان نەشۆردووە، ئەوە بایەخی پێ نادات، پشت گوێی دەخات.

١٧- حاڵـەتی دووەم: هـەر جارێـك کـە ئافرەتەکـە دەسـتنوێژ هەڵدەگرێت زۆر گوماناوی بێت، لەو کاتەی کە پێیەکانی دەشوات گومانی هەبێت، ئایا سەری سڕیوە یان نا؟ ئەمجۆرەش پشت گوێ دەخرێتو بایەخی پێ نادرێت.

١٨- حاڵەتی سێیەم: گومانەکە ڕوو بدات دوای تـەواو بـوونی لـە پەرستشەکە جا نوێژ بێت یان دەستنوێژ، کاتێك کە تـەواو دەبێـت گومانی بۆ پەیدا بێت، ئایا دەستی شۆریوە یـان نـا، ئایـا سـەری سڕیوە یان نا، ئەوەش هەر پـشت گـوێ دەخرێـت، مەگـەر کاتێـك دڵنیا بوو کە ئەندامە گومـان لێکـراوەی نەشـۆردوە، ئـەوە لەسـەر دڵنیا بوونەکەی دەڕوات.

ئەم سێ حاڵەتە گومانە پشت دەخرێت.

١٩. دەبێت گومانەکەی گومانێکی ڕاستەقینەو هەقیقی بێتو نـەك زۆر گوماناوی بێت، وەئەم حاڵەتە ڕووی دابێت پێش تەواو بـوونی لـە پەرسـتنەکە، لـەم حاڵەتـە لەسـەر دڵنیـا بوونەکـە دەڕواتو ئیشەکەی بنیات دەنێت ، وا دادەنێـت کـە ئیـشەکەی نـەکردووە،

یانی ئەم ئەندامەی نەشوشتووە کە گومانی لێ هەبووە، بۆی دەگەڕێتەوەو دووبارە دەیشواتەوە، ئەندامەکانی دوای ئەویش دەشواتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٠. ئافرەتێك تووشی وەسوەسەی پاكو خاوێنیو ترسان لە پیسی بووە.

- دەبێت وورییای خۆی بێت لەو وەسوەسە، ئیشی پێ نەکات.

- پشتی خۆی بە خوا ببەستێت لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا.

- داوای چاکبوونو سەلامەتی لە خوا بکەی لەو نەخۆشیەی کە تووشی بووە.

«الشيخ إبن باز»

٢١. ئاگەداری: شەیتان سوورە لەسەر تێکدانی پەرستنەکانی موسڵمان لە نوێژو ڕۆژوو شتی تریش، بۆیە واجبە جەنگی لە گەڵ بکرێتو مل کەچی وەسوەسەکانی نەبێت، لە گەڵ پشت بەستن بەخوا لە وەسوەسەکانیو پلانو فڕوفێڵەکانی.

«الشيخ إبن باز»

٢٢. هەندێك جار داڵغەو خەیاڵو بیرو بۆچوونی وا دێتە پێشم، دەترسم بمباتە دەرەوە لە دینەکەم، جا چی بکەم بەرامبەری؟

ئەم دالّغەو خەیالّو بیرو بۆچوونانە هەمووی لەو شەیتانەیە کە وەسوەسە لە دەروونی خەڵکی دەکات، بۆ گومڕا کردنو سەرگەردانکردنی موسڵمان، ئەگەر هەستت بە شتێك لەمانە کرد، پشتی خۆت بەخوا ببەستەو واز لە بیر کردنەوە بێنە لە کارو باری پەنهانو نهێنی.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٣. نوێژێکی دڵنیا کەر (احتیاط) بکەی دوای نوێژی فەڕز، بۆ شوێنگرتنەوەی ئەو کەمو کوڕیەی لە نوێژە فەڕزەکانی ڕوویداوە. شەرعی نیە. بەڵکو لەسەری پێویستە هەوڵو تێکۆشان بکات، بۆ ئامادەبوونی ترسو لەرزی دڵی لەناو نوێژەکەیدا..... وە ئەگەر هەندێك دالّغەو خەیالّ ڕوویدات، دووبارە بگەرێتەوە بۆ نوێژەکەی ئەوە زیانی نیە، إن شاء الله .

«الشيخ إبن فوزان»

## ﴿ ئافرەتو دڵداری (عەشقایەتی) ﴾

❖ (٧) وەڵامی تێدایە.

١. چەند ووشەیەك لە هەقیقەتی دڵداریو زیانەکانی.

– هەندێك لە زاناو دانایەکان گوتوویانە (( شێتی چەندەها هونەری هەیە، دڵداریش یەکێك لە هونەرەکانی)

– وە گوتویانە ( چەندەها دڵدار هەیە لە پێناو خۆشەویستەکەی هەموو ماڵو ئابڕوو ناموسی خۆی دادەنێت. وە هەموو کەسو کارو بەرژەوەندییەکانی لەم ڕێگایە زایەع دەکات).

– هەندێك لە زانایەکان پرسیاری لێ دەکرێت، دەربارەی دڵداری کردنی وێنە لە وەڵامدا ووتی ( ئەو دڵانەی بێ ئاگا بووینە لە یادی خوا، خوای گەورە بە پەرستنی جگە لە خۆی تاقییان دەکاتەوە) چونکە دڵی بێ ئاگا شوێنی شەیتانەکانە.

– دڵدار لە هەموو خەڵك بەدبەخترو ریسواترو سەرقاڵترو دوورترە لە پەروەردیگاری خۆی.

ئبنولقەیم فەرموویەتی: دەربارەی دڵداریو ئەوینی. سەرجەم پزیشکەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی ( کە نەخۆشیەکی وەسواسیە....) هەتاکو فەرمووی هۆیەکەی بە چاك دانانو بیروبۆچوونێکی دەروونیە.

٢. نیشانەکانی دڵداری کوفریو شیرکی.

ڕەزامەنـدی خۆشەویـستەکەی پـێش ڕەزامەنـدی خـوا بخـات، وەکاتێك مـاق خۆشەویستیەکەی پێچەوانەی مـافی پـەروەردگارو گوێڕایەڵیەکەی بێت، ئەوە مافی خۆشەویستەکەی پێش دەخات.

«الإمام إبن القيم»

٣. هۆیەکانی دڵداری:

– بۆشـایی ڕوحـی: بـەتاڵ بـوونی دەروونـی لـە یـادی خـواو خۆشویستنی، چونکە هەر کاتێك دڵەکان پڕ بێت لە خۆشویستنو ترسو یادی خوا ، دڵەکەی جێگای خۆشەویستی کەسیتری تێدا نابێتـەوە. ئـەوەش لەبـەر ئەوەیـە، خـوا شـوێنی هـەموو شـتێك دەگرێتەوە.

ئیبنولقەیم دەفەرمێت ( دڵدار بوونی وێنە تەنها دڵە بەتاڵـەکان لـە خۆشەویستی خوا پێی تاقی دەکرێتەوەو تووشی دەبێت)

– دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن: ئـەم دەزگایانـە فلیمـی وا پـیسو بـێ ئـابڕوو ڕوهـەڵماڵراو نیـشان دەدەن، چـیرۆکی خۆشەویـستی وا سـەرنج ڕاکێـشەر نیـشان دەدەن، کـە کاریگـەری خـەراپی زۆری هەیـە، سـەرەنجام سەردەکێـشێت بـۆ لادانو تێکـدانو نـەمانی ڕەوشتی چاكو بڵاو کردنەوەی بەد ڕەوشتیو سەرشۆڕی.

– لادان لە دەستەواژەی خۆشەویستیو ئەوینی.

بەشێوەیەك گومان دەبەن هیچ دڵدارێكو خۆشەویستییەك نیە، مەگەر ئەو خۆشەویستیەی كە خاوەنەكەی كوێر دەكات، وای لێ دەكات خەریكە لە سەرخۆشیەكەی بە ئاگا نەیێتەوە.

❖ بەڕاستی ئەم جۆرە كەسانە گەورەترینو پیرۆزترینو بەسوودترین خۆشەویست لایان بزرە ، ئەویش بریتیەیە لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو (ﷺ) دایكو باوكو هەژارەكانو خۆشویستنی پاكو خاوێنیو خێزانو ڕەوشت بەرزی.

- وەلامدانەوەو بەرپەرچ دانەوەی تەلەفۆنی.

ئەوە لە هۆكارە هەرە گەورەكانە كە بۆ دڵداری ڕاتدەكێشێت.

- چاو نەپاراستن: سەرەتای هەموو دڵداریەك زۆر جار لە سەیر كردنی شوێنی جوانی ئافرەت دەستپێدەكات.

- چاو لێكردنەوەی گوێرەوەرانە: هەندێك خەڵك هەیە چیرۆكی دڵدارەكان دەخوێنێتەوە، گوێبیستی ئەو گۆرانیانە دەبێت كە باسی دڵداریو ئەوینی دەكات، ماوەیەكی زۆر پێ ناچێت خۆی گیرۆدەی ئەو شتە دەكاتو دەكەوێتە داوی دڵداری.

٤. چارەسەر:

- پاڕانەوە لە خوای گەورە، بە ڕاستگۆیی پەنای بۆ بەریو بە دڵسۆزی لێی بپاڕێیەوە.... خوای گەورەش لەم نەخۆشیە ڕزگاری دەكاتو قوتارت دەكات.

- دوور کەوتنەوە لە خۆشەویست.

با لە خۆشەویستەکەی دوور بکەوێتەوە نە بیبینێت نە گوێبیستی قسەکانی بێت، وە ئەو شتەش نەبینێت کە ئەوی بە یاد دێنێتەوە.

- هاوسەرگیری

هاوسەرگیری بکات ئەگەرچی بە یەکێکی تری جگە لە خۆشەویستەکەی چونکە لە هاوسەرگیری کیفایەتو بەرەکەتو دڵنەوایی هەیە.

- پارێزگاری کردنی لە کردەوەی چاکو زۆر یاد کردنی خوا. خوا دەفەرمێت ( إن الصلاه تنهی عن الفحشاو والمنکر) واتە نوێژ قەدەغەت دەکات لە کاری خەراپو خەراپەکاریو کاری نابەجێ.

- بیر کردنەوەو پارانەوە

بیر بکەوە،لە مردنو ناخۆشیەکانی، قەبرو تاریکیەکانی، ڕاوەستان لەبەر دەستی خوای گەورەی بەیاد خوت بێننەوە.

- خۆ سەرقاڵ کردن بەو شتەی کە سوود بەخشە .

چونکە دەست بەتاڵی لە هۆیەکانی دڵدارییە، وە گوتراوە ( دڵداری کاری یەکێکی بێ کارو دەست بەتاڵە) بۆیە ئەگەر دڵدار دڵی خۆی سەرقاڵ کرد بە شتێکیتر جگە لە خۆشەویستەکەی، خۆشویستنی بۆ خۆشەویستەکەی ووردە ووردە کەم دەبێتەوەو لە یادی دەچێت.

## ﴿ ئافرەتو بەربەرچ دانەوە ﴾

### ❖ ووشەی مەبەست پێکەر.

- ئـافرەت وەكـو مـرواری نـاو سـەدەفە: ئەگـەر ئـەوەی نـاو سەدەفەكە بردرا، ئەوەكەیتر هیچ بایەخو نرخـی نامینێت، فـڕێ دەدرێتە سەر شـەقامەكان، ئـافرەتیش ئەگـەر شـەرمو پاكیەكـەی ڕۆیشت هیچ گرنگی نامێنێت.

- ئەی كۆمەڵی گەنجان هەمووتان بزانن: كاتێـك لـە بـازاڕ یـان لـە شوێنێكیتر ئافرەتێكی خۆداپۆشەر دەبینن ڕێـزی دەگـرن، وەكـو ئەوەی (شـاژنێك یـان خانمێـك) بێـت. بـە پێـچەوانەی ئـافرەتێكی سفور بە چاوێكی كەم سەیری دەكەنو مەبەستیان تەنها ( خوشی وەرگرتنــە لـەو ئافرەتـە چـەند خولـەكێكی دیـاری كـراو) پاشـان دەڕوونو بێ ئابڕوییو گوناهەكە لەسەر ئافرەتەكە دەمینێتەوە.

- ئەگـەر دەزانـی خـوای گـەورە چـی بـۆ زینـا كـەرەكان ئامـادە كـردووە، بـە ڕاسـتی شـتێكی زۆر گەورەیـە: تەنـدورێك بنەكـەی فراوانەو سەرەكەی تەسـكە، لـە ژێـرەوەی ئاگرێك دێتـە دەرەوە، زیناكـەرەكانیش پیـاوو ژنـی ڕووتـن، ئـەو ئـاگرە دەیانـسوتێنێت، هاواریان لێ هەڵدەستێت لەبەر توندی ئاگرو دوكەڵەكەی.

- ئایا ئەو کەسەی کە تۆ هەموو ئابڕوو ناموسی خۆتو کەسو کارەکەت، هەموو جوانیەکەی خۆت پێ سپاردوە شایەنی ئەو هەموو شتەیە؟ ئەمن بڕوام وایە ئەو شایەنی پێڵاوەکانیشت نیە.....، چونکە ئەگەر پیاو بوایە ئەو کارەی نەدەکرد.

- ئایا ئەو ئافرەتە ژیرە بیری لەوە نەکردۆتەوە لەو کاتەی کە لە گەڵیەتی لە ناو ئوتومبێلەکە گیانی دەربچێت ، ئایا بیر ناکاتەوە چارەنووسی بەرەو کوێیە؟ حاڵی لەناو قەبری تاریک چۆن دەبێت، ئایا قۆرتێکە لە قۆرتەکانی ئاگری دۆزەخ، یان مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت؟

١. هۆیەکانی بەربەرچ دانەوەو چارەسەرکردنەکەی.

❖ کزیو لاوازی ئیمانی بە خوا، هەست نەکردن بە چاودێری ڕەحمانو ( لە یاد کردنی قیامەتو مردنو ئاگر)

چارەسەر:

هەست کردن بە چاودێری کردنی خوا ، بەوەی کە هەموو کاتو ساتێك سەیری بەندەکەی دەکات، لەوانەیە مردن پێی بگات لە هەر کاتژمێرێك ( لەو کاتەش پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام پەشیمان بوونەوە سودی بۆی نیە)

❖ پەروەردە کردنی خەراپ لەماڵەوە:

بەڵام لە گەڵ ئەوەش کچەکە نابێتە خاوەن عوزر ( هەنجەت) بەو شتە، چونکە عەقڵو بیرکردنەوەو دینو ویژدانی خۆی هەیە.

چارەسەر:

-ئامادە کردنی کەشێکی لەبارو چاك، بەدوورکەوتنەوەی لە فلیمەکانو خوێندنەوەی گۆڤاری پڕوپووچو گوێگرتنی گۆرانی.

- چوونە دەرەوەی ئافرەت بە زۆری بەبێ پێویستیەکی گرنگ، کە دەبێتە هۆی تێکەڵ بوونو تەماشا کردنی حەڕام.

- چارەسەر:

لە ماڵ ئوقرە بوون: وەکاتێك دەچێتە دەرەوە خۆی لە خۆ ڕازاندنەوە بپارێزێت بەخۆ داپۆشینەوە بەڕێزو شکۆوە بچێتە دەرەوە.

- هاوەڵایەتی کردنی ئافرەتی خەراپ..... چەندەها ئافرەت هەبوو، هاوەڵە خەراپەکانی ڕایانکێشاوە بۆ خەراپە، وە گوتراوە ( الطيور على أشكالها تقع) واتە باڵندەکان بۆ باڵندەی جۆری خۆیان هەڵدەنیشن. وەهەروەها گوتراوە ( الصاحب ساحب) واتە هاورێ ڕاکێشەرە.

چارەسەر: هاوەڵایەتی کردنی ئافرەتی چاك. لە یادت بێت.

❖ دونیا شوێنی مانەوەو ئۆقرە بوون نیە، بەڵکوماڵێکی کاتیەو پردێکە.

❖ مردنو ناخۆشیەکانی، قەبرو تاریکیەکانی، ڕۆژی قیامەتو ئاگرو سزاکەی.

❖ شەرمەزار بوونو ریسوا بوون بەرامبەر خەڵکی پێشینو دواییەکان، لێپێچینەوەی پەروەردگاری جیهانیان.

– چیرۆکی (ئافرەتێکی خۆش باوەڕ (ساویلکە))

کوڕەکە ژمارەی تەلەفۆنەکەی بۆ هەڵداوە، کچەکە پەیوەندی پێوەکردو... وتی چۆن منت ناسی؟ کوڕەکە وەڵامی دایەوەو وتی خۆشەویستی لە یەکەم سەیرکردنە....ئەو ئافرەتە گەمژە بڕوای پێ کردو هەڵیخەڵەتاند، توانی بیڕفێنێتو بیبات تووشی ریسواییو شەرمەزاریو تیا چوونی بکات... خۆی کوشت بە خەنجەرێکی ژەهراوی کە ناوی تەلەفۆنە. ئەو ئافرەتە لە دۆزەخێك دەژیا کە خۆی بۆ خۆی دروستی کردبوو.

❖ ئەی مرواری پارێزراو:

وا نەزانی ئەو کەسەی قسەت لە گەڵ دەکات کەمژەیە...!!

نەخێر بەڵکو فێڵبازێکی بلیمەتە، بەرامبەرت دەگرییو دەڵێ کە ئەو خۆشتی دەوێتو شەو ناخەوێت..... لە هەمان کات درۆزنە،

چونکە دەیەها کچ دەناسێت، ئەو قسانەی بۆ تۆ دەکات هەمان قسە بۆ ئەوانیش دەکات.

٢. شێوازەکانی بەرپەرچ دانەوە( سەرپێچی، یاخی بوون)

❖ پەیوەندی کردن بە تەلەفۆن بە هەڕەمەکی.

❖ وردە وردە هەڵیبخەڵتێنی بە قسەو گوفتار.

❖ داوا کردنی لە ئافرەتێکی رەوشت نزم بۆ هەڵخەڵەتاندیان.

❖ بەکار هێنانی جەختی مادی.

ئاگەدارییەکان:

سەرپێچیکەر پەتایەکەی دەگوازرێتەوە بۆ ئەوانەی لە گەڵی دانیشتوون، هەروەك چۆن مرۆڤی ساغ لە یەکێکی تووشبوو بە گەری (خورولك) دەگرێتەوە.

سەرپێچیکەر: چەندەها ماڵی تووشی فەساد کردووە، چەندەها جار بووەتە هۆی ئەوەی هاوەڵەکانی تووشی ئەم تاوانە بکات‌و بۆیان برازێنێتەوە، بۆیە ئەو خەراپ‌و خەراپەکەریشە.

چاك لەو حکمەتە بکۆڵەوەو لێ وورد بۆوە.

لەوانەیە ( لەززەتی کاتژمێرێك) تووشی غەم پەژارەیەکی دوورو درێژت بکات.

### ❖ (٢٠) وەڵامی تێدایە.

دروست نیە ئاهەنگی بووك زاوا لە ناو ئافرەتان بکرێت، چونکە ئەو تێکەڵ بوونە بەڵکەی نەمانی شەرمە، چاولێکردنەوەی خەڵکی خەراپ‌و خەراپەکارەکانی تێدایە.

«الشيخ إبن جبرين»

١. مەرجەکانی لێدانی دەف لە زەماوەندی هاوسەرگیری.

– دەبێ ئەو لێدانە لەسەر دەف بێت کە پێی دەگوترێت (الطار) کە لە یەك لای گیراوە، نەك دەهۆڵ (تەبڵ) بێت کە هەر دوو لای گیراوە، چونکە لە ئامێرەکانی مۆسیقا ژەنین دەژمێردرێت کە هەمووی حەڕامە.

– نابێت شتێکی حەڕامی لە گەڵ لێ بدرێ، وەکو گۆرانییێکی بێ نرخ‌و سوك‌و لەززەت بزوێنەر.

– نابێت کێشەو فیتنەی لە گەڵ بێت وەکو دبارکەوتنی دەنگی جوانی ئافرەت بۆ پیاوان.

– نابێت ئەزیەت دانی کەسی تێدا بێت، ئەگەر ئەزیەت دانی کەسانێکی تێدا بێت ئەوە قەدەغەیە. وەکو ئەوەی دەنگەکە بدرێتە مایکرۆفۆن‌و دەنگ بەرزکەرەوەکان.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢. بە کرێ گرتنی ئافرەتی دەف لێدەرو (مەولود خوێن) زیانەکانی.

– ئەوەی لە هەقیقەتی ئەوانە بکۆڵێتەوە دەبینێ ئەوانە گۆرانی بێژن، ئاوازی گۆرانی بێژەکان‌و لە خوا یاخی بووەکان بەکار دێنن، بۆیە خەراپە لەسەر کارەکەیان زاڵترە.

– دانانی دەنگ بەرزکەرەوەی گەورەو عودو مۆسیقای ڕۆژهەلاتی.

– هێنانی ئەوانەو پارە پێدانیان، یارمەتی دانی خەڵکی خەراپ‌و خەراپ ویستەکانی تێدایە، ڕێز گرتنی کەسێکی تێدایە کەسەر شۆری‌و ریسوایی بۆ نوسراوە.

«الشیخ إبن باز»

٣. ئاگەداری: بەلام وتنی گۆرانیەکی ئاسایی‌و سادەو ساکار، لە کاتێکی شەو بۆ خۆشی دەربڕین‌و زەماوەند گێران ، ئەوە هیچی تێدا نیە، بە مەرجی نەبوونی پیاوان لە شوێنەکە،وە گوێ لە دەنگ نەبوونیان.

٤. شانازی کردن بە گۆرانی بێژان‌و بەو پارە زۆرەی کەپێیان دەدرێت، شەونخونی‌و مانەوەیان هەتاکو نوێژەکەی بەیانیان دەفەوتێت، دروست نیە.

«الشیخ إبن باز»

٥. مەرجەكانی كراسی بووكینی.

دروستە بۆ ئافرەت ئەو كراسە لەبەر بكات كە تايبەتە بە ئافرەتان، يان كراسیتر لە شەوی بووكینی بە مەرجی ئەوەی

- دەبێ داپۆشەر بێت.
- نابێت بە جلوبەرگی پياوان بچێت.
- نا بێت بە هی ئافرەتی بێ باوەڕان بچێت.

«اللجنة الدائمة»

٦. حوكمی كراسی بوكينی درێژ.

- سوننەتە بۆ ئافرەت يەك بست كراسی درێژ بێتو زياتر نەبێت لە باڵێك ئەوەش لەبەر خاتری داپۆشينو دەرنەكەوتنی پێيەكانی.

«الشيخ إبن بان»

٧. دروست نيە بۆ بووك يەك باڵ زياتر كراسی درێژ بێت.

چونكە زايەع كردنی پارەی تێدايە.

«الشيخ إبن بان»

٨. بە كرێ گرتنی كراس بۆ بووك: هيچی تێدا نيە

٩. ئاهەنگ گێران لە هوتێلو زيانەكانی.

أ. زۆربەی جار دەستبلاویو زێدەڕەويەكی وای تێدايە كە پێويست نيە.

ب. سەردەكێشێت بۆ تێكەڵبوونی پياوانو ئافرەتان.

«الشيخ إبن بان»

١٠. تـەختو كورسـی بـووكو زاوا: دەركـەوتنی زاوا لـە تەنیـشت هاوسـەرەكەی، دروسـت نیـە، بەرامبـەر ئـەو ئافرەتـە بێگانانـەی هاتوونەتە ئاهەنگەكە بـەو پـەڕی خۆڕازاندنـەوەو جوانی، ئـەوەی ڕاستی بێت دەبێت چوونە ژوورەوەی زاوا بـۆ لای بووكەكـەی لـە ژوورێكـی تایبـەت بێـت، چـوونە ژوورەكـەش بـە شـەرمو شـكۆو خۆداپۆشینەوە بێت.

١١. ڕەسم گرتن بە كامێرا یان ڤیدیو: دروست نیە، هیچ كەسێكی ژیری ئیماندار ڕازی نابێت ڕەسمی مەحرەمەكانی ( دایك، خوشـك، كچ ....) جگە لەوانیش بگیرێت، بۆ ئەوەی ببێتە كالاّیەك نیـشانی هـەموو كەسـێك بـدرێتو ببێتـە یارییـەك هـەموو خەراپـەكارێكو فاسقێك چێژو خۆشی لە بینینان وەربگرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢. دروست نیە زاوا بچێتە شوێنێك ئـافرەتی لێ بێـت، وێنـەگریش لە دوای بێت.

«الشيخ إبن باز»

١٣. ئامادە بوون لەو ئاهەنگانەی كە بێ شـەرعیو خەراپـەی تێـدا ئەنجام دەدرێت، دروست نیە ئەگەر نەیتوانی بیانگۆڕیت.

«اللجنة الدائمة»

١٤. سەما کردنی ئافرەتان لەو ئاهەنگانە.

هیچی تێدا نیە، بەلاَم بە چەند مەرجێك:

- دەبێت تەنها لەناو ئافرەتان بێت.

- دەبێت بە دەنگێکی ئاسایی بێت‌و، نابێ بەرز بێتەوە بۆ شوێنێکی‌تر تێپەڕێت.

- بە تەواوی خۆی داپۆشێت، بەشێوەیەك هیچ شتێك لە عەورەتی ئافرەتەکە دیار نەبێت، هەتا لە حاڵەتی سەما کردنیشدا، وەکو قاچەکانی‌و ڕانەکانی، بەڵکو ئەوەندەی خۆی با دەربخات کە عادەتە ئافرەتی موسڵمان دەریبخات بەرامبەر ئافرەتان.

«الشيخ إبن فوزان»

١٥. هەلهەلە لێدان لە ئاهەنگی خۆشی:

دروست نیە ئافرەتان دەنگی خۆیان بەرز بکەنەوە لەکاتی ئامادە بوونی پیاوان، چونکە لە دەنگەکەیان کێشەو گرفت هەیە، جا دەنگەکە هەلهەلە بێت یان شتی تر بێت جیاوازی نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

١٦. وەلاَمدانەوەی وەلیمە:

وەلاَمدانەوەی ئافرەتی موسڵمان بۆ خۆشکەکەی ئەگەر دەعوەتی کرد بۆ خواردنی زەماوەند ( وەلیمە) واجبە، بە پشتگوێ خستنی ئەو دەعوەتە گوناهبار دەبێت، بە چەند مەرجێك:

أ. ئەگەر پیاوەکەی ڕێی پێدا.

ب. ئەگەر وەلیمەکە خەراپەی تێدا نە دەکرا.

ج. یان خەراپەی تێدا دەکرا بەڵام دەیتوانی بیگۆڕێت.

ئەگەر ئەو مەرجانە جێ بەجێ نەدەبوو گوناهبار نابێت لە وەڵام نەدانەوەی.

«اللجنة الدائمة»

١٧. گوێ بیستنی کاسێتی گۆرانی لە گەڵ مۆسیقاو دەهۆڵو شتی دیکە لە ئامێرەکانی ڕابواردن، پاشان ئافرەتان سەما بکەن لە لای، ئەو شتانە هەمووی حەڕامەو دروست نیە جا چ لە کاتی هاوسەرگیری بێت یان کاتێکی تر بێت جیاوازی نیە.

«اللجنة الدائمة»

١٨. حوکمی گۆڕینی جلو بەرگ، لە ئاهەنگی هاوسەر گیری لە ژووری تایبەت لە ناو کۆشکی زەماوەند گێران.

پێویستە لەسەر ئافرەت زۆر ووریاو ئاگەدار بێت لەو لایەنە، لە پاراستنی عەورەتو شاردنەوەی جوانیەکەی، بە تایبەتی دوای پەیدا بوونی شێوازی نوێی وێنەگرتنی شاراوە.

«الشيخ إبن منيع»

### ١٩. حوكمی گەلابڕژە (النثار)

زانایەكان بە پەسندی دا نانێن لەبەر ئەوەی كەمیو بێ ڕێزیو حورمەتی خواردنی تێدایە، ئەگەر كەمیو بێ ڕێزی خواردنو هیچ خراپەیەكیتری تێدا نەبێت، ئەنجامدانی هیچی تێدا نیە، چونكە لە دابو نەریتە باوەكانە.

گەلابڕژە (النثار): بڕێك پارەو شیرنەمەنیە بەسەر بووكو زاوادا پەرشو بلاو دەكەن لە كاتی ژن هێناندا.

# ﴿ئافرەت‌و خۆڕازندنەوەو جوانی﴾

## ❖ (٩٠) وەڵامی تێدایە.

زەبت‌و ڕەبتی شەرعی بۆ جوانکاری ئافرەت.

١. جوانکاریەکە دەبێ ڕێپێدراو بێت، نابێت قەدەغەی لێ کرابێت لە شەرع ( برۆ کردن، لێنانەوەی قـژ ( الوشـم)، باریـك کردنـەوەی ددانەکان (تفليج الأسنان))

٢. خۆ چوواندنی تێدا نەبێت بە کافرەکان.

٣. بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان خـۆ چـواندنی بـە پیـاوان تێـدا نەبێت.

٤. نابێت بەردەوام لە گەڵی بمێنێتەوە لە ژیانی لا نەچێت.

٥. نابێت گۆڕینی دروستکردنی خوای گەورەی تێـدا بێـت، وەکـو (ڕوو کردن(النمص)، لێنانەوەی قژ (الوشم))

٦. نابێت بەربەست بێت لە بەردەم گەیشتنی ئاو بۆ پێستی، یان قژی، بە تایبەتی بۆ یەکێك حەیزدار نەبێت ((وەکو یەکێك نینـۆکی بۆیە بکات))

٧. نابێت دەستبڵاوی‌و زایەع کردنی پارەی تێدا بێت.

٨. نابێت زایـەع کردنـی کـاتێکی زۆری تێـدا بێـت، بـە شـێوەیەك ببێتە غەمێکی سەرقاڵ کەر بۆ ئافرەت.

٩. بە کارهێنانی ئەم شتانە نابێت ببێتە هۆی لەخۆبایی بوون و فیزو خۆبە گەورە زانین.

١٠. دەبێت بۆ پیاوەکەی بێت بە پلەی یەك.

١١. نابێت پێچەوانەی سروشت (فطرة) بێت، وەکو درێژ کردنی نینۆك.

١٢. نابێت دەرخستنی عەورەتی تێدا بێت، لە کاتی بەکار هێنانیشی.

١٣. نابێت دەرخستن و بەرچاوکردنی ئافرەتی تێدا بێت لە لای پیاوی بێگانە، بەشێوەیێك کە زۆر دیار بێت و بناسرێتەوە، سەرنج ڕاکێشتر بێت لە نێوان ئافرەتان.

## ❖ خۆڕازاندنەوە بە بۆن و بوخور.

١٤. چوونە دەرەوەی ئافرەتی بۆن خۆش بۆ بازاڕو مزگەوت حەرامە، لەبەر ئەو گرفت و کێشانەی لێی دەکەوێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٥. بۆن لە خۆ دان لە کاتی چوونەدەرەوە لە ماڵ:

ئەگەر ئافرەت سواری ئۆتۆمبێل بێت و کەسێك بۆنی نەکات، مەگەر ئەو کەسەی بۆی حەڵاڵە، ڕاستەوخۆ لە ئۆتۆمبێلکە دابەزێت بەبێ ئەوەی پیاوانێك لە ڕێگای هەبێت بۆنی بکات، ئەوە هیچی تێدا نیە. «الشيخ إبن عثيمين»

١٦. ئاگەداری: هەندێك ئافرەت لە ڕۆژەكانی ڕەمەزان بۆن‌و گولاو لە گەڵ خۆیان دبەنە مزگەوت‌و دەیدەنە ئافرەتان، ئافرەتەكانیش بە بۆن‌و بوخور لە مزگەوت دێنە دەرەوە. ئەوە دروست نیە، چونكە ئەگەری ئەوە هەیە یەكێك لە ڕێگا بۆنیان بكات.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٧. پێشكەش كردنی بوخورو بۆنی خۆش لە سەردانی ئافرەتان.
پێشكەش كردنی بوخورو بۆنی خۆش لە سەردانی ئافرەتان، دروست نیە ئەگەر هاتوو ئافرەتەكە دوای دەرچوونی، بەڕێگای پیاوان تێپەڕ بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٨. بۆنی خۆش بە دیاری بدەیتە ئافرەت.
هیچی تێدا نیە، چونكە دیاری سۆزو خۆشەویستی دێنێت، وە بۆ دیاری بەخش پاداشت هەیە، بەڵام ئەگەر دیاری بەخش دەیزانی كە دیاری پێدراو، ئەو بۆنە بەكاردێنێت لە كاتی دەرچوونی بۆ بازاڕ ئەوە دروست نیە، چونكە دەچێتە قالبی یارمەتی دان لەسەر گوناهو تاوان.

«الشيخ إبن باز»

## ﴿خۆ ڕازاندنەوە بە هۆکارەکانی نوێی جوانکاری﴾

١٩. زەبتو ڕەبتی شەرعی لە بەکارهێنانی کەلو پەلی جوانکاری.

– نابێت مەبەستی خۆ چواندنی هەبێت بەکافرەکان.

– نابێت هیچ زیانێك بگەیەنێتە لاشەی ئافرەتەکە.

– زیادەڕەوی تێدا نەکرێت، چونکە زۆر بەکار هێنانی، زیان بە پێست دەگەیەنێت.

– نابێت بەربەست بێت لە گەیشتنی ئاو بۆ پێست، لە کاتی دەستنوێژو خۆ شۆردن.

❖ دانانی گێراوەکانی جوانکاری لەسەر ڕوخسار: درێژەی تێدا هەیە.

٢٠. ئەگەر بە هۆیانەوە جوانی پێ بەدەست هێناو زیانی بۆ ڕوخساری نەبێت، وە نەبێتە هۆکاری پەیدا کردنی شتێك لێی ئەوە قەیناکە، هیچی تێدا نیە بەکارهێنانی.

٢١. بەڵام ئەگەر بووە هۆکاری پەیدا کردنی شتێك ، وەکو پەڵەی ڕەش یان زیانیتری پێ بگەیەنێت، ئەوە لەبەر خاتری زیانەکە قەدەغە دەکرێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٢. ڕاپۆرته پزیشکیەکان لەسەر هەندێك گیراوەی جوانکاری

– هەندێك لە گیراوە جوانکاریەکانی ڕوخسار، دەبێتە هۆی هەو کردنی پێست

– بەکارهێنانی هەندێك کرێمی خۆراك بەخش، دەبێتە هۆکاری زیاد بوونی زیبکە (حب الشباب) ، چونکە دەبێتە خۆراك بەخشی ئەم زیبکانە.

– هەندیك لە کرێمەکانی ڕوخسار لە ماددەی سیسرکە دروست کراوە.

– سپیاوی پێست کاریگەری زیانبەخشی هەیە، چونکە لە ئاوێتەی کانزایی قورس پێك هاتووە، وەکو قورقوشم و جیوە کە دەتوێنرێتەوە لەناو ئاوێتەی چەوری وەکو زەیتی کاکاو.

– ئامۆژگاریتان دەکەین بە شوشتنی ئەم گیراوانە پێش نووستن بە ئاوی گوڵی سارد یان بە ئاوی ئاسایی.

## ❖ خۆڕازاندنەوە بە برژانگی دەست کردو ڕەنگاو ڕەنگ لە دەورو بەری چاوەکان.

٢٣. بەکار هێنانی نینۆکی دەستکر، دروست نیە.

٢٤. بە کار هێنانی برژانگی دەستکرد، دروست نیە.

٢٥. به كار هێنانی عەدەسەی ڕەنگاو ڕەنگ، دروست نیە.لەبەر ئەوەی زیان لە شوێنی بەكار هاتوو دەدات لە لاشەت ، وە لەبەر ئەوەی فرِوفێڵو هەڵخەڵەتاندنو گۆڕینی دروستكراوی خوای تێدایە.

«اللجنة الدائمة»

### ❖ ڕاپۆرتێكی پزیشكی دەربارەی ڕەنگەكانی دەوربەری چاوەكان.

٢٦. لەو مادە ئاوێتانە مادــەی وای تێدایە دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی درێژ خایەن، وەكو ( هیكزات كلۆرفین)و ( فینلین ثنائي لامین) ، بۆیە لە ئەنجامدا بریندار بوونی قەرەنیەی لێ پەیدا دەبێتو گەنی بوونی چاویشی لێ دەكەوێتەوە، بە هۆی ئەو گەردیلە پاك نەكراوانەی كە میكرۆبەكە لە خۆی دەگرێت، پاشان برژانكەكە دەكەوێت.

❖ خۆ ڕازاندنەوە بە ددان شاش كردن (تفليج) .

٢٧. حەڕامە لەسەر ئافرەتی موسڵمان ددانەكانی شاش بكات لە بۆ جوانی، بەوەی كە بیڕنێ بە بڕبەنگ (مبرد) هەتاكو لەنێوانیان كەلێن هەبێت بە ئومێدی ئەوەی جوان بێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٨. بەڵام ئەگەر ددانەکانی شپرزە بوو پێویستی بە کرداری ڕێکخستن هەبێت بۆ لابردنی ئەو شپرزەییەیە، یان ژانی تێدا بێتو پێویستی دەکرد چاکی بکاتەوە، لەبەر خاتری لابردنی ئەو ژانە ئەوە هیچی تێدا نیە چونکە ئەوە دەچێتە قالبی چارەسەرکردنو لابردنی شپرزەیی.

«الشيخ إبن فوزان»

## ❖ خۆڕازاندنەوە بە ڕووکردنو تەنك کردنی برۆ.

٢٩. حەڕامە برۆی سروشتی خۆت لابەریو برۆی دەستکردی ڕەنگاو ڕەنگ دابنێی، لەبەر ئەوەی گۆڕینی دروستکراوی خوای تێدایە.

٣٠. دروست نیە برۆ بکرێت، ئەگەر کەمیش بێت، نە بەبڕینی، نە بە دەرهێنانی، نە بە تەنك کردنی، چونکە ئەوە هەموو دەچێتە ناو قالبی ڕوو کردن (النمص) ، کە پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە بکەرەکەی کردوەو لە گوناهە گەورەکانیشە.

٣١. النمص: برۆکردنی نێوچەوانە، دروست نیەو حەڕامە.

٣٢. دروستە بۆ ئافرەت ئەو مووە لابەرێت کە هەندێك جار ریش یان سمێلی بۆ دروست دەکات، یان ئەو مووەی کە لە قاچی یان دەستەکانی دێت.

٣٣. راپـۆرتی پزیـشکی ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە لابردنـی مـووی برۆیـەکانی بـە جۆرەهـا شـێوازو پاشـان بـەکارهێنانی پێنوسـی ئەرچـەوان‌و شـتی دیکـە لـە جوانکاریـەکانی پێـست، کاریگـەری زیانبەخشی هەیە، چونکە دروست کـراوە لـە کـانزا ئاوێتـە گـران‌و قورسەکان.

٣٤. سـور کردنـی برۆیـەکان: زانایـان دوو رای جیاوازیـان هەیـە لەسەری، (شیخ إبن جبرین) قەدەغەی کـردوە، (شـیخ إبـن منیـع) دروستی کردوە.

«الشیخ إبن منیع»

٣٥. مووی نێری سەر برۆ

بە شێوەیەك کە شۆربووبێتەوە ناو چاو، کاریگـەری لەسـەر بیـنین بکات، هیچی تێدا نیە ئەوەندە لاببات کە ئەزیەتی دەدات.

«الشیخ إبن عثیمین»

٣٦. دروستە ئافرەت برۆی خۆی تەنك بکات، ئەگـەر ئەسـتور بـوو لەبەر خۆرازاندنەوەی بۆ پیاوەکەی؟

دروسـت نیـە بـە هـەر حالێـك بێـت، چـونکە ئـەو کـارە برۆکردنـە (التنمص)، بەڕاستی پێغەمبەری خـواش نـەفرەتی لـە بـرۆ هـەلگر کردووە.

«الشیخ إبن جبرین»

## ❖ موو بۆ سێ بەش دابەش دەکرێت.

٣٧. یەکەم: لێکردنەوەی حەڕامە بە دەقی شەرعی وەکو ( ڕیش بۆ پیاوان و برۆ بۆ ژنان)

٣٨. دووەم : لێکردنەوەی داوا کراوە بە پێی دەقی شەرعی وەکو ( بن هەنلگڵ و سمت و ...)

٣٩. سێیەم: ئەو موانەی شەرع لە سەری بێ دەنگ بووە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ حەزو هەڵبژاردنی مرۆڤ، ئەگەر حەز بکات لایدەبات، ئەگەر حەزی لێبێت لێی دەگەڕێت، نموونەکە ( هەر دوو دەستەکان و قاچەکان و....)

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ لابردنی ئەو مووەی کە لە ڕوخساری ئافرەت دێت: ئەوە درێژەو ووردەکاری تێدایە

٤٠. ئەگەر مووەکە ئاسایی بوو نابێت هەڵیبگرێت.

٤١. بەڵام ئەگەر شتێکی زیاد بوو، بوویێتە هۆی شێواندن و تێکدانی شێوەی دروستی ئافرەت، وەکو ڕیش و سمێڵ، هەڵگرتنی هیچی تێدا نیەو قەیناکە، چونکە شێواندنی دروستکراوی خوای تێدایەو زیانی بۆ هەیە.

«الشيخ إبن باز»

## ❖ خۆڕازاندنەوەی بە خاڵ کوتان (الوشم).

٤٢. پێناسەکەی ئەوەیە کە ئەندامێکی لەشی کون بکات، هەتاکو خوێنی لێ دێت، پاشان شوێنی کونەکە کل یان چویت (بۆیەکی شینە،کلی سەوز یان شین) یان شتی دیکە تیَ ی بکات، جا شوێنە کوتراوەکە سەوز یان شین دەبێت، مەبەست لێی جوانکارییە، یان خۆپاراستنە لە چاوەزار.

٤٣. حوکمەکەی: حەرامە، پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە بکەرەکەی کردوە،وە گوناهێکە لە گوناهە گەورەکانە.

٤٤. ژیری و دانایی لە قەدەغەکردنی: لەبەر ئەوەی گۆڕینی دروستکراوی خوای تێدایە.

٤٥. ئەگەر کچێك بە بچووکی کوترا بوو، نەیدەتوانی خۆی بپارێزێت و بەرگری لە خۆی بکات لەو کوتانە، ئەوە گوناهی لەسەر نیە. بەڵکو گوناه لەسەر بکەری ئیشەکەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ ئایا پێویست دەکات کوتان لابەری بە چارەسەرکردن

٤٦. ئەگەر لەوە بترسێت ئەندامێکی بفەوتێت یا شتێکی خەراپ ڕوو بدات، ئەوە لابردنی پێویست نیە، پەشیمان و تەوبە بەسە لەم حاڵەتە.

٤٧. بەڵام ئەگەر لەم شتانە نەدەترسا واجبە لایبدات‌و گوناهبار دەبێت بە دوا خستنی( لادانەکە).

«الشیخ إبن باز»

٤٨. ئایا بەکار هێنانی خەنە لە گەڵ زەردێنەی هێلکە دروستە بۆ خاوکردن‌و لووس کردنی قژ؟

– بە کار هێنانی خەنە لە گەڵ زەردێنەی هێلکە، یان لە گەڵ شتێکی‌تری رێپێدراو، گوناه نیە، ئەگەر لە بەکار هێنانی سوودی بۆ قژ هەبێت بە درێژ کردنی، یان لووس کردنی، یان سوودی دیکەی هەبێت، یان توندی بکات‌و بهێڵێتەوە هەتاکو نەکەوێت.

٤٩. ئەگەر بە شێوەیەك قژەکەی ببڕێت، لەسەری پیاو بچێت ئەوە حەڕامە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٥٠. وە ئەگەر بە شێوەیەك بیبڕێت، بە قژی ئافرەتی خەراپ‌و زیناکەرو کافرەکان بچێت ئەوە حەڕامە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٥١. وە ئەگەر بیبڕێت لەسەر شێوازێکی دیکە جگە لەو شێوازە نا شەرعیانە، ئەوە ڕای جیا جیاو دووبەرەکی لەسەرە، زانا هەیە دروستی کردوە، هەیە پێیان باش نیە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٥٢. حەڕامە ئافرەت قژی خۆی بگەیەنێت بە قژێکیتر، یان بە هەر شتێکیتر کە بە قژەکەی هەڵبکێشرێت.

٥٣. بڕینی قژ بۆ پێویستی: دروستە لەبەر لابردنی زیان لێی.

«اللجنة الدائمة»

٥٤. لەبەر کردنی (باروکە): ئەویش قژی دەستکردە.

جیاوازی نیە لە نێوان ئەوەی ئەگەر قژەکە دەستکرد بێت، یان قژی ئافرەتێکیتر بێت، چونکە ئەو جیاوازیانە کاریگەری نیە لەسەر گۆڕانی حوکمەکەی، لەبەر هەبوون و مانەوەی هۆیەکەی، کە گۆڕینی دروستکراوی خواو ساختە کردن و شاردنەوەی ڕاستیەکانە.

٥٥. باروکە: حەڕامە، ئەویش دەچێتە قالبی گەیاندنی قژ (الوصل) کە لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە (( لعن الله الواصلة والمستوصلة)) واتە نەفرەتی خوا لەو ئافرەتەی کە قژی دەگەیەنێت بە قژێکیتر ،وە لەو ئافرەتەی کە ئەو کارەی بۆ دەکات.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٦. چ کاتێك لەبەر کردنی قژی دەستکرد دروستە؟
ئەگەر لە بنچینەوە ئافرەتەکە قژی بەسەرەوە نەبێت، یان کەچەڵ بێت، هیچ گوناهێك نیە لە بەکار هێنانی قژی دەستکرد بۆ داپۆشینی ئەم کەمو کوڕیە، چونکە لابردنی کەمو کوڕی دروستە.
«الشيخ إبن عثيمين»
٥٧. بە کارهێنانی قژی دەستکرد دروست نیە، ئەگەر چی بە ڕێپێدانو ڕەزامەندی پیاوەکەشی بێت هەر حەرامە.
«الشيخ إبن عثيمين»
٥٨. بەکارهێنانی (الكعكة): ئەگەر لە تۆقی سەرەوە بەکار بێت دروست نیە، بەڵام ئەگەر بۆ سەر مل بەکاربێت ئاساییەو دروستە، مەگەر کاتێك ئافرەتەکە بۆ بازاڕ دەردەچوو، لەم حاڵەتە دروست نیە، چونکە بە دەرخستنی جوانی دادەنرێت، چونکە وەکو نیشانەیەك لە دوای عەبایەکە دیار دەکەوێت.
کعکە: حەشوەیەکە ئافرەت لە ژێر قژی بەکاری دێنێت.
«الشيخ إبن عثيمين»
٥٩. بەڵام کۆ کردنەوەی قژو کردنی بە یەك گروپ یان زیاتر، لە شێوەی کەزی، یان شتی دیکە، شۆڕ کردنەوەی لەسەر پشتی قەیناکەو هیچی تێدا نیە، لەبەر ئەوەی داپۆشراوە لەو کەسەی کە بۆی حەلاڵ نیە.

«اللجنة الدائمة»

٦٠. لوول لوول كردنی قژ (نیگرۆ): ئەوەیە قژی خۆی بكاتە خانە خانەو لوولی بدات، خوارو خێچی بكاتەوە، لە جیاتی لووس بوون‌و خاو كردنی.

٦١. دروستە بۆ ئافرەت قژی خۆی لوول بدات بە شێوەیەك

- خۆ چوواندنی تێدا نەبێت بە كافرەكان.
- بەدەرینەخات بۆ پیاوانی نا مەحرەم
- ئافرەت بە كارەكە هەڵسا بێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٢. ئەو قژ لوول دان‌و نیگرۆیە دروستە، جا چ بۆ كاتێكی كەم بێت یان زۆر.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٣. قژ مێش كردن بە هەر ڕەنگێك دروستە (سوور ، زەرد، زێڕی..)، بەڵام ڕەنگ كردنی بە رەش دروست نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٤. دروستە بۆ ئافرەت قژی خۆی ڕێك بخات بە ڕێگای سەردەمی، وەمەبەستی خۆچوواندن نەبێت بە كافران، وەبەرامبەر دەست هەقی كارەكەی كرێیەكەی هەرزان بێت‌و زایەع بوونی پارەی تێدا نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٥. کۆ کردنەوەی قژو لوول دانی لە دەوری سەری هـەتاکو وەکـو جەمەدانی (عمامة) لێ دێت، دروست نیە، لەبەر ئەوەی لێك چوونی تێدایە لە گەڵ پیاوان.

«اللجنة الدائمة»

٦٦. دانانی قەیتانو قایشی وا لە قژی، کە وێنەی ئـاژەڵو ئـامێرە موسیقیەکانی تێدا بێت؟

دروست نیە، چونکە وێنە نابێت بەکار بێـت لـە جلوبـەرگو شـتی دیکەشدا، وەئامێرە مۆسیقییەکان دەبێت بشکرێنرێن.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٧. ئـەو قـەیتانو قایـشانەی کـە قـەبارەی سـەر گـەورە ناکـات، سوودی لێ دەبینرێت بۆ چاکسازی قژ هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٨. چاندنەوەی قژ ( بۆ ئەو کەسەی تووشی کەچەڵی بووە )

دروستە ،چونکە ئەوە دەچێتە قالبی لابردنی عەیبو کەمو کوڕی، ناچێتە قالبی جوانکاریو زیاد کردنی شـتێك لـە دروسـتکراوەکانی خوا، بۆیە ناچێتە ناو قالبی گۆڕانی دروستکراوی خوا.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٩. دروست نیه بۆ ئافرەت قژی خۆی بتراشێت مەگەر لە حاڵەتی پێویستی وەکو نەخۆشیەك یان سەر شكانێك پێویستی دەكرد بتراشێت لەبەر دروینەوەكەی.

٧٠. دروست نیەو نابێت خەرجی لووسكردن و خاوكردنەوەی قژ زۆر گران بێت.

«الشیخ إبن فوزان»

٧١. لابردنی مووی نێوان هەر دوو برۆ:

دروستە چونكە ئەو مووانە لە بنەڕتدا بە مووی برۆیەكان دانانرێت.

«اللجنة الدائمة»

٧٢. خۆڕازاندەوە بە لەبەركردنی پێڵاوی پاژنە بڵند( كعب العالي) دروست نیە لەبەر چەند هۆییێك

– چونكە ئافرەتەكە لە شێوەیەك دەردەخات جیا لە شێوەی سروشتی خۆی.

– ئافرەت تووشی بەربوونەوە دەكات، مرۆڤیش بە پێ ی شەرع فرمانی پێ كراوە مەترسی لە خۆی دوور بخاتەوە.

– لاشەو بالاّو سمتی ئافرەتەكە زیاتر دەردەخات لەوەی كە هەیە.

- بە پێی باسلێوەکردنی پزیشکەکان، پێڵاوی پاژنە بڵند زیانی لەسەر ڕەحم هەیە، بە هۆی ڕاست نەبوونی لاشە لە کاتی ڕۆیشتن‌و ڕەقبوون‌و ووشکبوونی ماسولکەکانی قاچی لێ دەکەوێتەوە بەدرێژایی کات.

«اللجنة الدائمة»

٧٣. خۆڕازاندنەوە بە زێڕو خشڵ:

دروستە بۆ ئافرەت ئەوەندە زێڕو زیوو گەوهەرو شتی دیکە لەبەر بکات کە حەز دەکات، بە مەرجی ئەوەی نەگاتە سنووری زیادەڕەوی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٤. لەبەر کردنی بازن‌و ئەنگوستیلەی زێڕ.

لەبەر کردنی زێڕ حەلالە بۆ ئافرەتان، جا چ بە شێوەی بازنەو ئەنگوستیلە بێت، یان بە شێوەیتر بێت لەبەر فەرموودەی خوا ( أو من ينشأ في الحلية وهو في الخصام غير مبين) واتە کەسێك بە منداڵی خوا ڕەوا دەبینن (کەلە باوی ئەواندا) هەردەم پەروەردە ئەکرێن لەناو خشڵ‌و ئارایش کردنی خۆیداو لەشەڕو شۆڕو جەنگیشدا دەرناکەوێت؟. وەفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ( إن هذين حرام على ذكور أمتي حلال لأناثها) واتە ئەو دوو شتە

حەڕامن لەسەر نێرینەی ئوممەتم، حەلاڵە بۆ مێیەکان) واتــە زێـڕو ئاوریشم.

«الشيخ إبن باز»

٧٥. لەبەر کردنی ئەنگوستیلە بۆ ئافرەت لە کام پەنجە دەبێت.

بـە پـێی دابو نـەریتی بـاوی ئافرەتـان بـا لەبـەریبکات، لەبـەر کردنەکـەی دیـاری نـەکراوە لـەکام پەنـچە لەبـەر دەکرێت، بـەڵکو مەسەلەکە فراوانە.

«اللجنة الدائمة»

٧٦. دروست نیە بۆ ئافرەتان زێرو خشڵەکەی دەربخات، بـۆ جگـە لە مەحرەمەکانی، بەڵکو دەبێت دایپۆشـێت بـە تایبـەتی لـە کـاتی چوونە دەرەوەی لە ماڵو تووشبوونی بە سەیر کردنی پیاوان.

«الشيخ إبن فوزان»

٧٧. لەبەر کردنی ئەموستیلە (ئەڵقە)

ئەوە لە دابو نەریتی موسڵمانان نیە، ئەموستیلە ئەو ئەلقەیە کـە لەبەر دەکرێت بـە بۆنـەی ئاهـەنگی هاوسـەرگیری، کاتێك ئەگـەر بڕوایـان وابێـت کـە هۆکـاری خۆشەویـستیە نێـوان ژنو مێـرد، داکەنانـدنو دانـانی کاریگـەری لەسـەر پەیوەنـدی هاوسـەرگیری هەیە، ئەوە بە هاوبەش دانان بۆ خوا دادەنرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٧٨.لەبەر كردنی خەزێم لە لووت.

- دروستە بۆ ئافرەت خۆی برازێنێتەوە بەو شتانەی کە لە داب و نەریت باوە، لەبەریان بکات، ئەگەر چی سەری کێشا بۆ کون کردنی بەشێك لە لاشەی وەکو گوێچکە، خەزێمیش لە لووت ئەویش دروستە. (بۆ کەسێك پێچە لەبەر بکات چونکە (شێخ إبن جبرین) پێچەی پێ واجبە، سەیری فەتوای بکە لە ئافرەت و جل و بەرگ و پۆشاك)

«الشيخ إبن جبرين»

٧٩. لەبەر كردنی خڕخاڵ.

دروستە، هیچ گوناهی تێدا نییە لەلای پیاوی خۆی و ئافرەتان و مەحرەمەکانی خۆی لەبەری بکات، چونکە لە جۆری ئەو زێڕ و خشڵەیە کە ئافرەت لە پێی دەکات.

«الشيخ إبن باز»

٨٠. درێژ كردنی نینۆکەکان

دروست نیە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی کردوە بیکەین، کاتی بۆ موسڵمانان دیاری کردووە کە زیاتر لە چل شەو و ڕۆژ واز لە نینۆك کردن و سمێڵ کورکردنەوەو بن هەنگڵ کردن و سمت تراشین نەهێنن.چونکە درێژ کردنی خۆ چوواندنی تێدایە بە ئاژەڵەکان و هەندێك لە کافرەکان.

«اللجنة الدائمة»

٨١. کردنی نینۆك لە گەرماو:

چاکتر وایە نەکرێت، وەکو رێزدانانێك بۆی، بەلاّم ئەگەر کردیشی هیچ گوناهی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٢. شاردنەوەی نینۆك‌و ئەو مووانەی مرۆڤ لێی دەکاتەوە لە ژێر گل:

بۆ ئەو شتەی باسی لێوە دەکەی نەمزانیوە بەڵگەیەکی شەرعی هەبێت، کەواتە ئەو شتە فراوانی تێدایە، ئەگەر حەز دەکات با لە ژێر گڵ بیشارێتەوە، وەئەگەر نا با فڕێی بدات.

«اللجنة الدائمة»

٨٣. بن هەنگڵ تراشین بە گوێزانی تایبەت دەبێت‌و دروستە، بەلاّم دەرهێنانی بە ڕاکێشان چاکترە، ئەگەر بۆی ئاسان بوو.

«اللجنة الدائمة»

٨٤. چوونە دەرەوەی ئافرەت بە کلەوە: دروست نیە بۆ ئافرەت هیچ شتێك لە جوانیەکانی دەربخات، جا چ کل بێت، یان شتی دیکە بێت، بۆ جگە لە پیاوەکەی‌و مەحرەمەکانی.

«اللجنة الدائمة»

٨٥. بەکارهێنانی (هێلکەو هەنگوین‌و ماست) بۆ چارەسەرکردنی پەڵەی پێست‌و سووربوونەوەو دێز بوونی، لە ڕوخساردا بەدەر دەکەوێت.

ئەگەر بەکار هێنانی بۆ مرۆڤ پێویست بوو، بۆ چارەسەرکردن، ئەوە هیچی تێدا نیە لەبەر فەرموودەی خوا ( وهو الذي خلق لكم ما في الأرض جميعاً ) واتە خوایەکەتان ئەو خوایەیە، ئەوەی لە سەر زەوی هەیە هەمووی بۆ ئێوە دروست کردوە. بەڵام بەکارهێنانیان بۆ جوانکاری، ئەوە مادەو شتی دیکە هەیە جگە لەمانە جوانکارییان پێ دەکرێت، بەکارهێنانیان چاکترە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٦. نەخش‌و نیگار کردنی دەستەکانی بە خەنە:

دروستە بیکات بەپێی ئەو دابو نەریتەی کە هەیە، چونکە بۆ ئافرەت سوننەتە خۆی جوان بکات بۆ پیاوەکەی ئەوەندەی لە توانایدا هەیە (هەر شتێك کندڕی پەیوەندی نێوان ژن‌و مێرد پتەوتر بکات، ئەوە پێویستەو داوا کراوە لێمان)

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ کرداری جوانکردن دوو بەشە:

٨٧. جوانکاری بۆ لابردنی عەیب‌و کەم‌و کوڕی، کە لە ئەنجامی ڕووداوێك یان شتیتر ڕوویداوە...ئەو جۆرە هیچی تێدا نیە.

٨٨. جوانکاری زیاد: ئەو جۆرە لەبەر لابردنی عەیب ناکرێت، بەڵکو بۆ زیاد بوونی جوانی دەکرێت ئەوە حەرامە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٩. زێدەڕەوی لە جوانکاریو خۆڕازاندنەوە سەرەنجامی زۆر خەراپی دەبێ لەوانە:

١. ڕوودانی کێشەو گرفت: لە نێوان ئافرەتان خۆیانەوە، بەوەی کە دووچاری لە خۆ ڕازیبوونو لە خۆبایی بوون یان لە ڕێ لادانی سێکسی دەبن.

٢. تووشبوونی چاووزار: ئەگەر چی هەموو شتێك بە فرمانو قەزای خوایە، بەڵام مرۆڤ داوای لێکراوە بەجێبەجێ کردنی هۆکارەکانی خۆ پاراستن، لە گەڵ ڕاستگۆیی پشت بەستنی بەخوا.

٣. زیانەکانی دەروونی: هەر ئافرەتێك هەوڵ دەدات لە ئافرەتیتر جوانتر بێت، ئەگەر هاتوو یەکێکی تر پێش ئەو کەوت لە جوانی، ئەوە دەروونی پڕ ڕقو قینە دەبێتو تووشی غەمو پەژارەیەکی زۆر دەبێت جگە لە خوا کەس نازانێت چەندە.

# ﴿ئافرەت و هاوسەرگیری﴾

### ❖ (١٤٠) وەلامی تێدایە.

### ❖ (چەند مەسەلەیەك لە خوازبێنی)

١. ئەگەر ئافرەتێك تووشی نەخۆشییەك بوو بێت، ئایا بە خوازبێنی کار بلێت؟

پێویستە لەسەر سەرپەرشتکاری ئافرەتەکە هەموو کەم و کوڕی و نەخۆشی بۆ خوازبێنی کار دیار بکات، ئەگەر بە خۆی نەیدەزانی، هەتاکو بەرچاو روون بێت، چونکە هەواڵ پێ نەدانی بەو شتە فێڵە بۆی.

«اللجنة الدائمة»

٢. ئەگەر ئافرەتەکە حەزی لە هاوسەرگیری هەبوو، ئایا بە سەرپەرشتکاری خۆی بلێت؟

هیچی تێدا نیە قەیناکە پێی بلێت، وە بۆ سەرپەرشتکاری کچەکەش هیچی تێدا نیە، ئەگەر کچەکەی پێشکەش بەو کەسە بکات کە گومانی چاکی پێ هەیە، ئەی ڕادەبینێت ئەو ئەمانەتە بپارێزێت.

«اللجنة الدائمة»

٣. ئایا ئافرەت خۆی پێشکەش بکات بۆ هاوسەرگیری؟

هیچ گوناهی تێدا نیە وابکات ، خەدیجە (رضي الله عنها) وای کردوە، ئەو ئافرەتەش وای کردوە کە لە سورەتی ئەحزاب باسکراوە، وە عومەریش (رضي الله عنه) کچەکەی پێشکەش بە ئەبو بەکرو عوسمان کردبوو(رضي الله عنهم)

«اللجنة الدائمة»

٤. ئەگەر پیاو پێش هاوسەرگیری زانی کە ئومێدی منداڵبوونی نیە، پێویستە لەسەری ڕاستیەکان ڕابگەینێت پێش گرێبەستەکە، چونکە ئەو شتە کەم و کوڕیە.

«اللجنة الدائمة»

٥. ئەگەر کچەکە کێشەی هەبوو لە ڕەحمی ئایا بە خوازبێنی کار بڵێت؟ ئەگەر کێشەکە کاتی بوو لەو کێشانە بوو، کە ئافرەتانی دیکەش دووچاری دەبن و پاشان نامینێت. ئەوە پێویست ناکات پێی بگوترێت. وەئەگەر کێشەکەی لە نەخۆشیە کاتیەکان و سووکەکان نەبوو، وە دوای خوازبێنی کردنەکە کچەکە هەر نەخۆشیەکەی مابوو، چاك نەبوویێتەوە، ئەوە پێویست دەکات لەسەر پەرشتکاری ئافرەتەکە بە خوازبێنی کار بڵێت.

«اللجنة الدائمة»

٦. ئافرەتێك لە تەمەنی بچووکی بە هۆی تووشبوونی ڕووداوێك پەردەی کچێنی لە دەست دەدات، ئایا بە هاوسەرەکەی بڵێت؟

شاردنەوەی ئەم بابەتە لە ڕووی شەرعەوە قەدەغە نیەو ئاسایە، پاشان کاتێك پرسیاری لێ دەکات دوای جووت بوون ڕاستیەکانی پێ ڕادەگەینێت.

«اللجنة الدائمة»

٧. ئەوەی ڕێپێدراوەو دروستە بۆ خوازبێنی کار لە خوازبێنی کراو ببینێت.

هیچی تێدا نیە، خوازبێنی کار سەرو ڕوخسارو دەستو پێیەکانی ببینێت، وە هەندێك لە زانایەکان پێیان وایە تەنها دەستو ڕوخساری بەسە، بەڵام ڕای ڕاستو دروستر، ڕای یەکەمە، بەڵام بەبێ تەنیا بوون( خەڵوەت)

«الشيخ إبن باز»

٨. ڕای وەرگیراو، ڕای خوازبێنی کراوە.

ئەگەر هاتوو دایكو باوکی دووبەرەکیان هەبوو لە هەڵبژاردنی هاوسەر بۆ کچەکەیان، دایکی یەکی بۆ هەڵبژاردو باوکی یەکێکیتر بۆ هەڵبژارد، ئەوە دەگەڕێنەوە بۆ لای کچی خوازبێنی کراویان لەو کارە، چونکە ئەو لە گەڵی دەگوزەرێنێتو بەشداری ژیانی دەکات.

٩. بەلاّم ئەگەر گریمان کچەکە یەکێکی هەڵبژارد هاوشانی نەبوو لە دین و ڕەوشت و ئەخلاق، ئەوە ڕای کچەکە وەرناگیرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٠. تەمەنی گونجاو بۆ هاوسەرگیری پیاوو ژن.

پێویستە لەسەر ئافرەت سەیری پیاوەکە بکات، ئەگەر هاتوو چاك و گونجاو بوو، ئەوە پێویستە لەسەری ڕازی بێت، ئەگەرچی تەمەنی گەورەتر بێت، وەهەروەها بۆ پیاویش.. سەرەنجام تەمەن نابێت بکرێتە هەنجەتێك و عەیبێك ئەگەر هاتوو پیاوەکەو ئافرەتەکە باش بوون.

«الشيخ إبن باز»

١١. پشکنینی پزیشکی پێویست ناکات پێش هاوسەرگیری:

لەسەر هەر دووکیانە گومانی باشیان بە خوا هەبێت، چونکە لەوانەیە پشکنینەکە ئەنجامی هەڵەو دوور لە ڕاستیان بداتێ، خوای گەورە ئێمەو ئێوە لە هەموو شەڕێك سەلامەت بکات.

«الشيخ إبن باز»

١٢. هاوسەرگیری کردنی ئافرەتی موسڵمان لە گەڵ کافرێك.

دروست نیەو گرێبەستەکە بە تاڵە.

«الشيخ إبن باز»

١٢. هاوسەرگیری‌و خوێندن.

واجبە لەسەر ئافرەت ڕازی بێت شوو بکات، ئەگەر هاوشانێکی خۆی داوای کرد، با خوێندن نەبێتە بەربەست لەو کارە، بە تایبەتی لەم ڕۆژگارە هاوسەرگیری بەرژەوەندی زۆری تێدایە.

«الشیخ إبن باز»

١٤. ئایا دروستە شوو کردن ڕەتبکاتەوە ئەگەر هەنجەتێکی(عذر) شەرعی هەبێت.

شوو کردن بۆ ئافرەتان شەرع داینـاوە لەبەر ئەوەی پاراستنی داوێن‌و پاراستنی چاوی تێدایەو زۆر بوونی وەچەشی تێدایە. دانیشتن بەبێ شووکردن مەترسیەکی گەورەیەو، پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە(ﷺ)، بۆیە بۆ ئافرەت شیاو نیە خۆی دوا بخات لە شوو کردن ،ئەگەر کەسێکی گونجاو هاتە داخوازی. بەڵام ئەگەر هاتوو هەنجەتێکی شەرعی هەبێت حەز نەکات بۆ خەڵکی ئاشکرای بکات، چونکە خۆی شارەزاترە لە نەفسی خۆی، وەکو ئەوەی ئارەزوو شەهوەی نەبێت، یان کەم‌و کوڕیەکی هەبێت، قەدەغەی بکات لە هاوسەرگیری.. ئەوە هیچی تێدا نیە شوو نەکات، قەیناکە.

«الشیخ إبن باز»

١٥. ئايا واجبه ئافرەت شوو بكات؟

له چیرۆكی ئەوانەی هاتبوون پرسیار له پێغەمبەر (ﷺ) بكەن دەربارەی پەرستنی پێغەمبەر(ﷺ) یەكێكیان تێدا بوو ( یعتزل النساء فلا یتزوج أبدا) واته له ئافرەتان دوورەپەرێز دەبێت هەرگیز ژن ناهێنێت. پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی ئەو پیاوەی داوەو گوتی ( من رغب عن سنتي فليس مني) واته ئەوەی له سوننەتی من لابدات ئەوە له ئێمە نیه.

❖ جا ئەم چیرۆكه ئاماژەی تێدایه بۆ ووریا بوونو ئاگەدار بوون لەوەی جولەكەو گاورەكان دەیكەن، له ڕەبەنگەریو گۆشەگیریو خۆ جیاكردنەوە له خەڵكی له ژنو پیاوانیان، بۆیه ئافرەت دروست نیه بۆی بەبێ شوو كردن بمینێتەوە.

«اللجنة الدائمة»

١٦. له دەزگاكانی ڕاگەیاندنی كچ حەزو ئارەزووی خۆی دەر ببڕێت بۆ شوو كردن له ڕێگای ڕۆژنامەو گوڤارەكان، باسی خەسڵەتو سیفاتی خۆی بكات: پێچەوانەیه له گەڵ شەرمو خۆداپۆشینو خۆپاراستنی ئافرەت، ئەو شته له دابو نەریتی موسڵمانان نەبووە، بۆیه واجبه وازی لێ بهێنرێت.

«اللجنة الدائمة»

١٧. قسه کردنی خوازبێنی کار بۆ خوازبێنیکراو.

ئەگەر قسەکە بۆ بەرژەوەندی خوازبێنییەکە بێت، دروستە، لە گەڵ ئەوەی چاکترەو لە پێشترە قسە لە گەڵ سەرپەرشتکاری ئافرەتەکە بکات.

«الشيخ إبن فوزان»

١٨. پەیوەندییەکانی پێش هاوسەرگیری:

ئەگەر مەبەستی پێش جووت بوون و دوای گرێبەستی هاوسەرگیری بێت، ئەوە هیچی تێدا نیە، چونکە بەگرێبەستەکە دەبێتە خێزانی ئەگەرچی نەیگواستووتەوەو جووت نەبووە لە گەڵی.

١٩. بەڵام ئەگەر پێش گرێبەستەکە بێت، لە کاتی خوازبێنی، یان لە دوای خوازبێنی، ئەوە حەرامە ( دروست نیە بۆ مرۆڤ لە گەڵ ئافرەتێکی بێگانە ڕابوێرێت بە قسە کردن یان بە سەیر کردن یان بە تەنیا بوون لە گەڵی(خەڵوەت)).

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٠. تەنیا بوون (خەڵوەت) لە گەڵ دەستگیران (خوازبێنیکراو)

دروست نیە بۆ ئافرەت لە گەڵ دەستگیرانەکەی بچێتە دەرەوە پێش مارەکردنی بەبێ مەحرەم، چونکە هۆکارێکە بۆ کێشەو فیتنە.

«اللجنة الدائمة»

٢١. ئەگەر خوازبێنی کارێك هاتە پێش بۆ ئافرەتێك‌و خۆی‌و سەرپەرشتکارەی ڕازی بوون، بۆ هیچ کەسێك لە خزمە نزیکەکانی نیە دژی ئەو شوو کردنە بوەستن، چونکە ئەوان دەسەلآتیان نیە لەسەر کچەکە.

«اللجنة الدائمة»

٢٢. ئەوەی پرسیاری لێ کرا دەربارەی خوازبێنی کارێك ئایا ڕاستیەکانی پێ بلێت یان نا؟

واجبە لەسەر پرسیار لێکراو، ئەوەی دەزانێت لەسەری بەڕاست‌و دروستی هەمووی بدرکێنێت‌و باس بکات، وە دروست نیە بۆی درۆ بکات لەگەڵ پرسیار کەرەکە.

٢٣. بە بەخشینی خوێن بۆ ئافرەتێك، نابێتە مەحرەم بۆی. هەر یەکێکیان بۆی هەیە شوو بە ئەوەیتر بکات.

٢٤. ئەگەر ئافرەتێك خوازراو گوتی ئەگەر سەرپەرشتکارم ڕازی بێت منیش ڕازیم، ئەو مارە کردنە تەواوەو دروستە.

٢٥. دروست نیە زۆر لە کچ بکرێت بۆ بە شوودانی بە کەسێك کە پێی ڕازی نیە، ئەگەر چی دایك‌و باوکیان دینی پیاوەکەشیان بە دڵ بوو.

«الشيخ السعدي»

٢٦. مارە کردنی نهێنی( هاوسەرگرتن):

ژن هێنان لە ئیسلام لەسەر ئاشکرا کردن بنیاتنراوە، بۆیە دروست نیە بشاردرێتەوە، شەرعیەتی ئاشکرا کردنەکەی، حیکمەتی زۆر گەورەی تێدایە شاراوە نیە، لە گرنگترینیان جیاکردنەوەی نێوان ژن هێنان‌و زینایە، چونکە زینا بە نهێنی‌و بە شاراوە دەکرێت، شاهێدەکانیش بەسە بۆ ئاشکرا کردنی.

«اللجنة الدائمة»

٢٧. ئافرەتێك ئەگەر برایەکەی به شووی دا، بە بێ ئەوەی باوکی بیکاتە وەکیلی خۆی، ئەو جۆرە هاوسەرگرتنە بەتاڵەو تەواو نیە، ئەگەر ویستیان ڕاستی بکەنەوە، ئەوە باوکیان گرێبەستێکی نوێ دەکات، یان یەکێك دەکاتە وەکیلی خۆی لە گرێبەستەکە.

«الشيخ محمد بن إبراهيم»

٢٨. ئەگەر ئافرەتەکە مەرجی لەسەر خوازبێنی کارەکەی دانا (کە لە خوێندن قەدەغەی نەکات) و شووی پێ کرد، ئەوە مەرجێکی تەواوو دروستە، بۆی نیە لە خوێندن قەدەغەی بکات دوای هێنانی. ئەگەر قەدەغەی کرد لە خوێندن، ئافرەتەکە خۆی هەڵدەبژێرێت ئەگەر حەزی کرد لە گەڵی دەمێنێت، ئەگەر حەزی کرد داوای فەسخ ( هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری) لە دادوەری شەرعی دەکات.

«الشيخ إبن باز»

٢٩. ئايا دروستە بۆ ئافرەت خۆی قەدەغە بکات لە شوو کردنەوە، دوای مردنی پیاوەکەی؟

نەخێر دروست نیە، چونکە ئەوە تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە بۆ مێردەکەی نیە قەدەغەی بکات لە شووکردنەوە دوای خۆی، ئافرەتەکەش لەسەری واجب نیە گوێرایەڵی بێت.

«اللجنة الدائمة»

٣٠. هاوسەرگیری مسیار،هاوسەرگیری (العرفی):

هیچ گوناهێك لە هاوسەرگیری مسیاردا نیە بەپێی مەرجە شەرعیەکان، واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پیاوو ژن بە شێوەیەکی شەرعی هاوسەرگیری بکات ( کۆڵەکەکانی (روکنەکان) هاوسەرگیرو مەرجەکانی لە خۆ گرتبێت) ئەویش هەبوونی سەرپەرشتکارو مارەیی‌و دوو شاهێدو رەزامەندی هەر دوو هاوسەرەکەیە جا ئەگەر هاوسەرگیریەکە بۆی گوترا مسیار یان ناویتری لێنرا جیاوازی نیە.

هاوسەرگیری مسیار:ژنەکە خۆی خەرجی خۆی بکات، خەرجیەکەی لەئەستۆی پیاوەکە نەبێت.

«الشیخ إبن باز»

٣١. ئەگەر ژن و مێرد کۆك بوون، لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە ئافرەتەکە لە لای کەس‌وکاری بمینێتەوە یان کاتی دابەش کردنی بۆ ئافرەتەکە تەنها ڕۆژ بێت، شەو نەبێت، یان کاتی دابەش کردنەکە چەند ڕۆژێکی دیاری کراو بێت یان چەند شەوێکی دیاری کراو بێت، ئەو مەرجانە شەرعیەو هیچی تێدا نیە، بەو مەرجەی کە هاوسەرگیریەکەیان ئاشکرا کردبێت‌و نەیانشاردبێتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٣٢. دروست نیە بۆ داخوازیکراو خۆی بڕازێنێتەوە بەرامبەر داخوازیکار نە بە جل‌وبەرگ نە بەمکیاج‌و جوانکاری.. چونکە بێگانەیە بۆ داخوازیکراو. وەلەبەر ئەوەی ئەگەر داخوازیکەر بەو ڕازاوەییە ببینێت، پاشان بگۆڕێت پاش نەمانی جوانکاریەکە، ئەوە وێنەی لە لای ئەو دەگۆڕێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❁چەند مەسەلەیەك لەسەر مارەبی❁

٣٣. (مارەیی) مافی (ئافرەتە) چ کاتێك لەو مافەی خۆی دەستی هەڵگرت نەیویست، ئافرەتەکەش خاوەن بیروهۆشی خۆی بێت، ئەو دەست هەڵگرتنەی تەواوو دروستە، بەڵام ئەگەر پێشکەشی نەکات، دروست نیە هیچ شتێکی لێ ببەی، چونکە تایبەتە بە ئەو.

«الشيخ إبن باز»

٣٤. پاشینەی مارەیی: دروستە، ئافرەتێك ماوەیەكی دیاری كراو بۆ پیاوەكەی دیاری بكات، مارەییەكەی دەكەوێت بەو ماوە دیاری كراوە.

٣٥. ئەگەر ماوەی بۆ دیار نەكرد بوو، ئەوە دەیكەوێت( بە جیا بوونەوە لێی، یان بە تەڵاق دان، یان بە فەسخ، یان بە مردن)

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٦. زەكات واجبە لەسەر ئافرەت لە (پاشینەی مارەیی) ، ئەگەر پیاوەكەی دۆڵەمەند بێت، بەڵام ئەگەر فەقیر بێت زەكاتەكە واجب نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٧. دروستە بۆ ئافرەت لە مافی (پاشینەی مارەیی) دەستی هەڵبگرێت، ئەگەر هاتوو خاوەن بیروهۆشی خۆی بێت، بەڵام ئەگەر زۆری لێ كرد، یان هەڕەشەی تەڵاقی لێ كرد، ئەوە مافەكەی ناكەوێت، چونكە دروست نیە زۆری لێ بكەی دەستی هەڵبگرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٨. مارەیی :دروستە فێركردنی كەمێك لە قورئان بكرێتە مارەیی ئافرەت لە كاتی گرێبەستی هاوسەرگیری، كاتێك ئەگەر پارەی نەبوو.

«اللجنة الدائمة»

٣٩. دروسته قورئانی پیرۆز بکاته مارەیی، چونکه قورئان دروسته بکردرێتو بفرۆشرێت له ڕای دروستری دوو ڕای جیاوازی زانایان.

«اللجنة الدائمة»

٤٠. هیچی تێدا نیه بۆ ئافرەت، ئەگەر مەرجی ئەوە دابنێت که مارەییەکەی عومرە بێت.

«اللجنة الدائمة»

٤١. ئایا دروسته بۆ پیاوێك مارەیی کچەکەی ببات؟

دروسته بۆ باوك مارەیی کچەکەی ببات ئەوەندەی زیان به کچەکه ناگەینێتو پێویستی نیه.

«اللجنة الدائمة»

٤٢. ئافرەت دەست به خاوەنایەتی مارەیی خۆی دەکات له گەڵ گرێبەستەکه، وه به تەواوی دەبێته خاوەنی به جووت بوون، یان به تەنیا بوون( خەڵوەت)، یان به مردنی یەکێکیان.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٣. ئەگەر تەڵاقی بدات پێش جووت بوون، یان پێش به تەنیا بوون له گەڵی، له کاتێك که مارەییەکی بۆ دیاری کردووه، ئەوه نیوەی مارەییەکەی دەکەوێت، وه هەر یەکێکیان چاوپۆشی له ماوەڵەکەی بکات، چاوپۆشینەکەی تەواوەو دروسته.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٤. هەر شتێك وەرگیرا بێت بە هۆی گرێبەستی هاوسەگیری، وەکو جلو بەرگ کردن بۆ باوکی، یان بۆ براکانی ئەوە هەموو مارەیی.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٥. کاتێك گرێبەستی هاوسەرگیری بەسترابێتو هیچ مارەییێك بۆ ئافرەتەکە دانەنرابێت، گرێبەستەکە تەواو، پێی دەگوترێت ڕاسپاردن، ئەم جۆرە مارەیی هاوشانەکانی بۆ هەڵدەسەنگێنرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٦. کاتێك پیاوەکە لێی جیا دەبێتەوە پێش جووت بوون لە گەڵی بە تەڵاق دانی، ئەوە بڕێك سامانو پارەی بۆ پێویستە، بە ئەندازەی فەقیرو دۆڵەمەندی مێردەکە.

٤٧. وە کاتێك جیابوونەوە ڕووی دا لە لایەن ژنەوە پێش جووت بوون لە گەڵی ئەوە ژنەکە هیچی بۆ نیە.

٤٨. گەورەترین بەرەکەتی هاوسەرگیری لە کەمترینی خەرجی دایە.

بار قورس کردن لە مارەییو ئاهەنگەکان، ئەوە هەمووی پێچەوانەی شەرعە، چونکە گەورەترین بەرەکەتی هاوسەرگیری لە کەمترینی خەرجی دایە، هەرچەند خەرجیەکەی کەم بێت بەرەکەتەکەی زیاترە. ئەو کارەش لە زۆربەی کاتەکان بۆ

ئافرەتان دەگەڕێتەوە، چونکە هەر ئافرەت باری هاوسەرەکەیان قورس دەکەن لە مارەیی و ئاهەنگ گێران.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٩. گرێبەستی هاوسەرگیری لە کاتی حەیز.

گرێبەستەکە دروستەو تەواوە، بەڵام نابێت لە گەڵی جووت بێت، هەتاکو پاك دەبێتەوە، بە پێچەوانەی تەڵاق لە حاڵەتی حەیز دروست نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

## ﴿ چەند مەسەلەیەك لە مافەکانی ژن و مێرد ﴾

### ❖ مافەکانی پیاو

٥٠. گوێرایەڵی بکات لەو شتەی فرمانی پێ دەکات، ئەگەر هاتوو فرمانەکەی لە سنووری توانایەکەیدا بوو.

٥١. ئابڕو ناموس و ماڵ و منداڵی بپارێزێت . وەپارێزگاری لێ بکات لەناو کەس و کاری.

٥٢. نابێت لاری هەبێت کاتێك بانگی دەکات بۆ سەر جێگای خەوتن.

٥٣. نەچێتە دەر لەماڵەکەی، مەگەر بە رێپێدانی پیاوەکەی بێت.

٥٤. دەبێ بە ئەرکی خۆی هەڵبستێت لە کارو باری ناو ماڵ.

«اللجنة الدائمة»

- له كۆتاییدا لەسەری واجبە بە جوانترین شێوە ژیانی لە گەڵ بگوزەرێنێت، وەبەجوانترین شێوە هەڵسو کەوتی لە گەڵ بکات، بەرامبەر هەر خەراپەیەکی چاکەیەك بکات، هەتاکو خۆشەویستیو تەبایی زیاد بێت لە نێوانیاندا.

«اللجنة الدائمة»

٥٥. نابێت پیاو خێزانەکەی قەدەغە بکات لە سەردانی باوكو دایکی مەگەر مەترسی هەبوە [1] دایكو باوکی کە زیان بگەینن بە خێزلنەکەیو لێی تێك بدەن بە هۆی ئەو سەردانە. لەم حاڵەتە پیاو بۆی هەیە ئافرەتەکەی قەدەغە بکات لە سەردانەکە.

«الشيخ إبن فوزان»

٥٦. حوکمی ئەوەی یەکێك لە هاوسەرەکانی مافی شەرعی نەداتە ئەویتر، قەدەغەی بکات.

واجبە لەسەر ئافرەت زەمینە بۆ پیاوەکەی خۆشبکات، هەر کاتێك ویستی لە گەڵی جووت بێت ( ئەگەر زیانی پێ نەگەینێت یان سەرقاڵی نەکات لە فەرزێك یان واجبێك) ، هەروەها بۆ پیاو دروست نیە واز لە جووت بوونی خێزانەکەی بێنێت بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، بەشێوەیەك زیانی پێ بکات.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( إذا دعا الرجل امراته إلى فراشه فأبت فبات غضبان عليها ، لعنتها الملائكة حتى تصبح)) رواه البخاري ومسلم. واتە کاتێك پیاوێك بانگی ئافرەتەکەی دەکات بۆ سەر جێگا، ئافرەتەکە وەڵام نەداتەوەو نەچێتە لای، پیاوەکەی بە توڕە بوونەوە بخەوێت، فریشتەکانی خوا هەموو نەفرەتی لێ دەکەن هەتاکو بەیانی.

«الشيخ إبن جبرين»

## ❖ چوونە لای ئافرەت لە پشتەوە.

٥٧. حەرامە بەپێی شەرع دروست نیە، لەسەری واجبە تەوبە بکات، داوای لێبوردن لە خوا بکاتو سوور بێت کە نەگەڕێتەوە سەر گوناهەکە، پەشیمان ببێتەوە لەوەی کە کردویەتی.

٥٨. ژنەکە تەڵاق نادرێت لە پیاوەکەی بەو کارە.

٥٩. ئەوەی لە پشتەوە چووبێتە لای خێزانی کەفارەتی نیە لە ڕای دروستری دوو ڕای جیاوازی زانایان.

٦٠. نابێت ئافرەتەکە گوێڕایەڵی بکات لەو گوناهە گەورە.

٦١. لەسەری پێویستە داوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری بکات (فسخ النكاح)، ئەگەر تەوبە نەکات.

«الشيخ إبن باز»

٦٢. ئەوەنــدەی ڕێپێـدراوە بـۆ پیـاو سـەیری خێزانـی بکـات: بـۆ ئـافرەت دروسـتە تەماشـای هـەموو لەشـی پیاوەکـەی بکـات، بـۆ پیاویش دروستە سەیری هەموو لەشی ژنەکەی بکات، بەبێ درێژە پێدانی زیاتر.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٣. خزمەت کردنی پیاو واجبە.

- ئافرەتەکـە صـەحابیەکان خزمـەتی هاوسـەری خۆیـان دەکـرد، هەروەك ئەسمائی کـچی ئـەبو بـەکر (ﷺ) باسـی خزمـەت کردنـی خۆی دەکرد بۆ زوبـەیری کـوڕی عـەوام ، وەهـەروەها فـاطمـەی زەهـرا (ﷺ) خزمـەتی علـی بـن أبـی طـالبی دەکـرد، لـە خـواردن دروستکردنو جلوبەرگو قاپ شوشتنو خاوێنکرادنەوەی ماڵ.

«اللجنة الدائمة»

٦٤. ئەندازەی ئەو خەرجیـەی واجبـە لەسـەر پیـاو ، حـوکمی بـار قورسـکردنی ژن بـۆ هاوسـەرەکەی بـە داوا کردنـی شـتی زۆر ؟ دروست نیە بۆ ئافرەت داوای خەرجیەکی زیاتر بکات، لـەوەی کـە لە توانایدا هەیە. بە پـێی دابو نەریتی باوی ناو خـەڵکی دروسـتە بۆی خەرجی بۆ ئافرەتەکەی بکـات، ئەگـەر لـە تواناىـدا هـەبێت، لەبەر فەرموودەی خـوا گـەورە ( وعاشـروهن بـالمعروف) واتـە بـە چاکە لە گەڵیان بگوزەرێنن.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٥. دروست نيه، نابێت بۆ ئافرەت خۆی بگرێت له خزمەت کردنی مێردو ماڵەکەی، لەبەر خەراپی هەلس و کەوتی پیاوەکەی لە گەڵی. وەلەسەری پێویستە ئارامگربێت، ئەو مافانەی لە ئەستۆیەتی جێبەجێیان بکات.

٦٦. دروست نیە بۆ ئافرەت شتێك لە ماڵی پیاوەکەیدا ببات بەبێ ڕێپێدانی ئەو، چونکە خوای گەورە حەڕامی کردوە لەسەر بەندەکان ماڵی یەکتر بخۆن.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٧. حوکمی بردنی پارەی مێرد بەبێ زانینی ئەو.

دروستە بۆ ئافرەت پارەی پیاوەکەی بۆ خۆی و منداڵەکانی ببات بە چاکەو بەبێ زێدەڕەوی و دەستبڵاوی لە پێویستی خۆی، زیاتر نەبات و خەرج نەکات بۆ خۆی و منداڵەکانی، ئەگەر هاتوو ئەو خەرجی نەدەکرد.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٨. ئایا دروستە پیاو پارەی خێزانەکەی ببات و تێکەڵی بکات لە گەڵ پارەی خۆی، ئەگەر هاتوو ڕازی بوو. ئەگەر ڕێی پێ‌داو ڕازی بوو یان ئەگەر ڕێی پێدا کەمێك لە پارەکەی تێکەڵی پارەی مێردەکەی بێت، دروستە، حەڵاڵ دەبێت بۆی، بەڵام دروست نیەو

نابێت بۆ ئافرەتەکەی بە چاوی دابداتەوەو منەتی لەسەر بکات، هەروەها نابێت پیاوەکە بە خەراپی هەڵس و کەوت، لە گەڵ خێزانەکەی بکات ئەگەر هاتوو پارەکەی خۆی پێ نەدە.

«الشيخ إبن جبرين»

٦٩. ئایا پیاو مافی ئەوەی هەیە ڕەخنە لە خێزانەکەی بگرێت لە خەرجکردنی ماڵی خۆی ( هی ئافرەتەکە)؟

ئافرەت خاوەن ماڵی خۆیەتی، وەمافی خەرج کردنی ماڵی خۆی هەیە، لێی بکاتەدیاری، خێری لێ بکاتو قەرزی خۆی پێ بداتەوە، پیاوەکەی مافی بەرەنگار بوونەوەو ڕەخنە لێ گرتنی نیە، ئەگەر هاتوو ئافرەتەکە هۆشیارو ژیر بوو.

«الشيخ إبن جبرين»

٧٠. ئایا دروستە لە ماڵی مێردی پارە ببات، بۆ هەڵگرتنو داکردنی بەبێ زانینی پیاوەکەی؟

«الشيخ إبن جبرين»

دروستە نیە پارە لە گیرفانی ببات بەبێ زانینی ئەو، بۆ داکردنو هەڵگرتن، ئەگەر هاتوو ڕژدو ڕەزیلی نەکردبێت لە خەرجی هاوسەرەکەی.

❖ بۆیـه دەبێـت شـته هـەڵگیراوەکان بـۆی بگەڕێندرێتـەوە یـان هەواڵی پێ بـدەی، چـونکه پیاوەکـەی پـارە عـەمبارە دەکـات بـۆ کاتی پێویست.

٧١. ئایا گوناه دەکەوێتـه سـەر ئـافرەت ئەگـەر خـۆی بگرێـت لـه مێردەکەی به هۆی حاڵەتێکی دەروونی کاتی؟

واجبه لەسەر ئافرەت وەڵامی مێردەکـەی بداتـەوە، ئەگـەر بـانگی سەر جێگای کرد ، بەڵام ئەگەر نەخۆش بووبێت، نەخۆشبوونێکی دەروونی نەتوانێت وەکو پێویست لـه گـەڵی ڕوو بـەڕوو ببێتـەوە، لەم حاڵەتـه بـۆ پیـاو نیـه داوای ئـەم شـتەی لێ بکـات، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی ((لا ضرر ولا ضرار))

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٢. مەکروهـەو پەسـند نیـه، یـەکێك لـه هاوسـەرەکان ئـەویتر بـه یەکێك لەو خزمه نزیکانه بچوێنێت که له پیاوەکەو ژنەکه حـەڕامن (محـارم) وەکـو ئـەوەی بەهاوسـەرەکەی بڵێـت : هـۆ دایـه، هـۆ خوشکم. ئافرەتەکه بڵێت هۆ باوکم یان برام، ئیتر بەو شێوە.

«اللجنة الدائمة»

٧٣. ئایا دروسته بۆ ئافرەت ڕێ به یەکێکی بێگانه بدات لـه مـاڵی مێردەکەی، له حاڵەتێك که خۆی له ماڵ نەبوو؟

دروست نیه، ئەگەر چی دۆستو برادەری مێردەکەی بێت، وە ئەگەرچی بە دڵسۆزو بە وەفا باوەڕ پێکراویش بێت، چونکە ئەوە بە تەنیا بوونە لە گەڵ ئافرەتێکی بێگانە.

❖ هەروەها لەسەر پیاو حەرامە، داوا لە ئافرەتێکی برادەری بکاتو بیباتە ژوورەوە بۆ ئەوەی خزمەتی بکات، لە مەترسی ئەوەی شەیتان وەسوەسەی لێ بکاتو بچێتە نێوانیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( إياكم والدخول على النساء)) قالوا يا رسول الله، أرأيت الحمو ؟ قال الحمو الموت )) رواه البخاري. واتە وریا بن دوور بکەونەوە لە چوونە ژوورەوەی ئافرەتان، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر کەسەکە حەمو بێت، فەرمووی (ﷺ) چوونە ژوورەوە، لە حەمو مردنە.

حمو: برای پیاوەکەیەتی یان نزیکەکانیەتی ، جگە لەوان شایەنو نزیکترە حەرام بێت.

٧٤. ئایا ئافرەت لە بری (لە جیاتی) پیاوەکەی کەسیتری بۆ هەیە، ئەگەر پیاوەکەی لە خەڵکی بەهەشت نەبێت؟

بێ گومان پاداشت لە ڕۆژی دوایی گشتیە بۆ پیاوانو ئافرەتان، خوای گەورە فەرموویەتی ( ومن يعمل من الصالحات من ذكر أو أنثى وهو مؤمن فأولئك يدخلون الجنة ولا يظلمون نقيرا) واتە: ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لە

کاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێناکرێت.

– وە ئەگەر ئافرەت مێرد بە چەند پیاوێك بكاتو لە گەڵیان بچێتە بە هەشت، سەر پشك دەكرێت لە نێوانیان، كامەیان خوورەوشتی لە هەمووان چاكترە، ئەوە ئەو هەڵدەبژێرێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٧٥. ئەگەر هاوسەرگیری كرد لە گەڵ كچێك، دوای چوونەژوور لای بۆی دەركەوت كە كچ نیە، چی بكات؟

بۆ نەمانی پەردەی كچێنی، چەندەها هۆی هەیە، لەوانەیە بە هۆی دیكە جگە لە زینا ڕۆیشتبێت، دەبێ گومانت پێی باش بێت، ئەگەر لە ڕەواڵەت دا ئافرەتێكی باشو دەستگرتوو بێت بەدینەكەی، وەلەوانەیە پەردەی كچێنی نەما بێت بە هۆی توندی حەیزەكەی، یان لەبەر بازدانی بێت لە شوێنێك بۆ شوێنێكیتر، یان كارێكی خەراپی كردبێت، پاشان پەشیمان بووبێتەوەو تەوبەی كرد بێتو چاكە كار بووبێت، ئەوە زیانی بۆی نیە.

«الشيخ إبن باز»

٧٦. ئامادە نەبوون و بزربوونی پیاو لە هاوسەرەکەی بۆ ماوەیەکی درێژ؟

ئەگەر ئافرەتەکە بەو ئامادە نەبوون و بزر بوونە ڕازی بوو، هیچی تێدا نیە چوار مانگ یان شەش مانگ یان ساڵێك یان دوو ساڵ ئامادە نەبێت یان بزر بێت، بە مەرجی ئەوەی کە ئافرەتەکەی :

– لە وولاتێکی سەقامگیر بێت و بەم حاڵەتە ڕازی بێت لەبەر خاتری داوا کردنی بژێوی، ئەوە هیچی تێدا نیە.

– ئەگەر وولاتەکە سەقامگیرو ئارام نەبوو، ڕازی نەبوو بەو حاڵە، بۆ پیاوەکەی دروست نیە بەجێی بێڵێت، پێویستە بە چاکی لەگەڵ هاوسەرەکەی گوزەران بکات و بژی.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٧. ئەگەر بە پیاوەکەی گووت، تۆ براوو باوکمی و هەموو شتێکی منی:

ئەو قسەیەی کە کراوە لەلایەن ئافرەتەوە حەرامی ناکات بۆ مێردەکەی، چونکە واتاکەی: تۆ لای من لە ڕێزو شکۆو چاودێری وەکو باوکم و برامی، مەبەستی ئەوە نیە حەرامی بکات لە خۆی وەکو باوك و برای، حوکمەکەشی حوکمی سوێندە، حوکمەکەی حوکمی (الظهار) نیە. وە لەسەر ئافرەتەکە پێویستە کەفارەتی

سوێندەکە بدات، ئەویش خواردن دانی دە هەژارە، هەر هەژارێك نیو صاع لە خواردنی باوی شارەکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٨. ئاگەداری: (الظهار) لە ئافرەتەوە بۆ پیاو نیە، بەڵکو لە پیاوەوە بۆ ئافرەتەوەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٩. باسکردنی نهێنی ئافرەت لە سەر جێگا.

ئەو شتانەی نێوان ئافرەتو هاوسەرەکەی هەیە لە نهێنیەکانی هاوسەرایەتی لە دەستگەمەو جووت بوونی سەر جێگا، دەکرێ پیاوەکە چەندەها شتی هەبێتو ئافرەتەکەش چەندەها شتیتری هەبێت، ئەو شتانە هەموو ئەمانەتە، بڵاوکردنو باسکردنی ئەو شتانە نابێ روویدات، مەگەر لە کەسانێك کە پیاوەتیو کەسایەتیو بیروهۆشێکی لاوازیان هەیە، ئەو کارەش خو رەوشتێکی خەراپی پێکەوە ژیانە.

«الشيخ محمد بن إبراهيم»

٨٠. دروست نیە بۆ پیاو هیچ شتێك لە ڕاتبی ئافرەتەکە ببات، مەگەر بەرێپێدانو ڕەزامەندی ئەو نەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٨١. ئەگەر ئافرەت دوای مێرد کردنی دووچاری چەند شتێك بوو، کە پێیان ڕازی نەبوو، وە ویستی ئەوەی هەبوو لێی جیا ببێتەوە.

دروستە بۆ ئافرەتەکە داوای تەلاق بکات، لەسەر ئافرەتەکەش پێویستە لەم حاڵەتە، هەموو ئەو شتانەی پێی دراوە بۆی بگەڕێنێتەوە، چونکە جیابوونەکە لە لای ئەو (ئافرەتەکە) هاتووە پێش جووت بوون لە گەڵی. ئەگەر پیاوەکە چاوپۆشی لە هەندێك شت کرد بۆ ئافرەتەکە ئەوە هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٨٢. وێردکردنەکەی کاتی جووت بوون ئایا تایبەتە بە پیاو؟

سوننەت وایە بۆ هەر پیاوو ژنێکی هاوسەر، کاتێك دەیانەوێت جووت بن بڵێن ( بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان و جنب الشيطان ما رزقتنا) رواه البخاري واتە بە ناوی خوا، خوایە گیان دوورمان بخەوە لە شەیتان و شەیتان دووربخەوە لەوەی پێمانی دەدەی.

«اللجنة الدائمة»

٨٣. من پیاوێکی نەزۆکم بەڵام ئافرەتەکەم نازانێت.

لەسەرت پێویستە هەواڵی پێ بدەی، چونکە ئەوە فێڵ کردنە لێی.

«اللجنة الدائمة»

٨٤. هاوسەرگیریو ژن هێنان لە ڕەمەزان.

نا پەسند نیەو ئاسایە، لەسەر نەبوونی هیچ بەڵگەیەك لەسەری.

«اللجنة الدائمة»

٨٥. مانگی هەنگوین.

دروست نیە، چونکە لاسایی کردنی خەڵکی دیکەی نا موسڵمانە (وەکو جولەکەو دیانەکان)، خەرج کردنو زایەع کردنی پارەی زۆری تێدایە، فەرامۆشکردنو زایەع کردنی زۆر لە فرمانەکانی دینی تێدایە، بە تایبەتی کاتێك لە وڵاتانی دیکەی نا ئسلامی دەکرێ.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٦. ئایا خزمەت کردنی دایکی مێرد واجبە.

لە شەرع بەڵگەیەکی وا نیە، خزمەت کردنی دایکی مێرد واجب بکات لەسەر ژن ( مەگەر لە چوار چێوەی چاکەکردن بێت، بە پێی توانای بێت)، چاکە کردنێك بۆ باشتر بوونی پێکەوە ژیانی هاوسەریەتی، ئەنجامدانی ئەو کارەی وەکو چاکەکردنێك بێت لە گەڵ پیاوەکەی کە واجبە چاکەی لە گەڵ بکات.

«اللجنة الدائمة»

٨٧. جووت بوون لە گەڵ ئافرەت دوای گرێبەستی مارە کردنو پێش ئاشکرا کردنی ئاهەنگی گواستنەوە.

لـــه رووی شـــەرعەوه هیـچی تێـدا نیـــه، بــەڵام ئەگـــەر مەترســـی شوێنەواری خەراپی هەبێت، ئەوه قەدەغه دەکرێت

«اللجنة الدائمة»

٨٨.ئایا بـۆ پیـاو هەیـه ئافرەتەکـەی قەدەغـه بکـات لـه کڕینـی جوانکاریو تەواوکاری له پارەی تایبەتی خۆی؟

نەخێر بۆی نیه، مەگەر کاتێك ئافرەتەکـەی دەستبڵاوی کـرد یـان شتێکی قەدەغه کراوو حەڕامی کڕی، ئەوه لەم حاڵەتـه قەدەغـەی دەکات لەو دەستبڵاویەو ئەنجامدانی ئەو حەڕامه.

«اللجنة الدائمة»

٨٩. پیاوەکـــەی داوای لێ دەکـات لـــه گـــەڵی شـــەونخونی بکـــاتو بمینێتەوه.

له سەریەتی گوێرایەڵی پیاوەکەی بکات به چاکترین شێوه، بـەڵام ئەگـەر داوای شـەونخونیەکی وای لێ کـرد کـه بـه هۆیـەوه نوێـژی بـەیانی لـه کـاتی خـۆی بـچێت، یـان داوای سـەیر کردنـی شـتێکی حەڕامی لێ کرد، ئەوه گوێرایەڵی مەکه، بەڵام جگه لـەم حاڵەتانـه دەبێـت گوێرایـەڵی بکـەی، ئەگـەر چـی نـەکردنو چـواندنی شـەو نوێژی تێدا بێت، چونکه شـەو نوێـژ سوننەتەو گوێرایـەڵ کردنـی مێردی واجبه.

«اللجنة الدائمة»

٩٠. چوونه دەرەوە لە ماڵ بە بێ ڕێپێدانی پیاوەکەی.

نابێت دروست نیە بچێتە دەرەوە، نە بۆ سەردانی دایكو باوكی نە بۆ خەڵكی دیكە، چونكە ئەو شتە مافی پیاوەکەیەتی لەسەری، مەگەر کاتێك هەنجەتێكی شەرعی هەبێت، ناچاری بكات بچێتە دەرەوە.

«اللجنة الدائمة»

٩١. پیاو خەرجی ئافرەتەکەی لەسەرە.

ئەگەر چی ئافرەتەکە ڕاتبێكی باشی هەبێت، چونكە خەرجیەکەی بۆ ئافرەتەکەی لە جیاتی ئەو خۆشی وەرگرتنو ڕابواردنەیە کە لە گەڵی دەكات، ئەگەرچی داهاتەکەی کەم بێت، مەگەر کاتێك ئافرەتەکە چاوپۆشی لە هاوسەرەکەی بكات سەبارەت بە خەرجیەکەی ، کارەکە بۆ ئافرەتەکە دەگەڕێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩٢. پیاوەکەی پشتی تێ کردووە بە مەبەستی پەروەردەکردنی.

کاتێك لە لایەن ئافرەتەکەوە یاخی بوون ڕوویدا دەرهەق بە هاوسەرەکەی، ئامۆژگاری کرد، بەڵام ئەو لە کردارەکەی پاشگەز نەبۆوەو وازی نەهێنا ، ئەوە بۆی هەیە پشتی تێ بكات لەسەر جێگا، بە واتای ئەوەی لە گەڵی بخەوێتو قسەی لە گەڵ نەکاتو ڕوخساری لێ نەکات، هەتاکو پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەكات،

ئەو کارەش پێچەوانە نیە لە گەڵ حەرامبوونی پشت تێ کردنی موسڵمان لە سێ رۆژ زیاتر، ئەوەی حەرام بێت پشتێ کردنی بێ هۆیە، بەڵام یاخی بوونی ئافرەت بە سەرپێچی دادەنرێت، ئەو پشتێ کردنە دروست دەکات.

«الشيخ إبن فوزان»

٩٣. فێڵباز کردنی ئافرەت لەسەر پیاوەکەی.

تێکدانی ژن لە پیاوەکەی‌و فڵبازکردنی حەرامە، جا چ ئەگەر فڵبازکردنەکە لە کەس‌و کاری نزیکی بێت یان خەلکی دیکە بێت یەکسانە، پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی (( ليس منا من خبَّب أمراة على زوجها أو عبداً على سيده)) رواه أبو داود. ئەو کەسە لە ئێمە نیە ئەوەی خورەوشتی ئافرەتێك تێك دەدات‌و فێڵبازی دەکات لە پیاوەکەی، یان بەندەیەك تێك دەدات لە گەورەکەی.

واتاکەی: خورەوشتەکەی تێك بدات‌و ببێتە هۆکارێك بۆ یاخی بوونی لە پیاوەکەی (گوێرایەڵ نەکردنی).

«اللجنة الدائمة»

٩٤. ئەگەر پیاوەکەی ماوەیەك ئامادە نەبوو، لە ماوەی ئامادە نەبوونەکەی خەرجی لەسەر خێزانەکەی نەکرد بوو، خەرجی ماوە رابوردوەکەی لەسەر واجب دەبێت.

٩٥. ئەگەر ئافرەت سەفر بكات بە بێ ڕێپێدانی پیاوەكەی ، یان نەیویست سەفەر لە گەڵ پیاوەكەی بكات، یان نەیویست لە گەڵی بخەوێت لەسەر جێگا، ئەوە نە بەشی ( دابەش كردنی سەر جێگای) بۆ هەیە، نە خەرجی، چونكە ئەو سەرپێچی كەرەو یاخی بووە.

٩٦. یاخی بوون(نشوز): سەرپێچی كردنی ئافرەتە بۆ هاوسەرەكەی لەو شتانەی كە واجبە لەسەری بیكات.

٩٧.زینای لە گەڵ كچێكی گەنج كردو دەیەوێت بیكاتە هاوسەری خۆی ئەویش بە چەند مەرجێك ئاسایییەو هیچی تێدا نیە:

١. دەبێت هەر دوو كیان تەوبە بكەن بە تەواوی دەستبەرداری ئەو ستەمە بن .

٢. پەشیمان ببنەوە لەو كارە خەراپەو بەد ڕەوشتەی كە روویدا.

٣. سوو ر بێت كە هەرگیز نەگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانە.

٤. كردەوەی باش زۆر بكات.

ئاگەداری : ئەكەر ویستی هاوسەرگیری لە گەڵ بكات دەبێ بزانێت كە سكی پاكەو بەتاڵە لە منداڵ، ئەویش بە حەیز تووش بوونی دەزانی ،پێش ئەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری بكەن، ئەگەر دیار

کەوت کە دوو گیانە دروست نیە گرێبەستی هاوسەرگیری ببەستن مەگەر دوای دانانی سکەکەی.

«اللجنة الدائمة»

٩٨. دیاری بە بۆنەو یادی هاوسەرگیری.

ئەمن وا دەبینم ئەو دەرگایە دابخرێت، چونکە وای لێدێت ئەو ساڵ دیاریە، ساڵی داهاتوو دەبێتە ئاهەنگ، پاشان خۆڕاهێنان‌و دووبارە کردنەوەی ئەو دیاریە بەو بۆنەیە، بە جەژن دادەنرێت، چونکە جەژن ئەو شتەیە کە بەردەوام دەگەڕێتەوەو دووبارە دەبێتەوە، بەڵکو پێویستە هەموو کاتێك خۆشەویستی‌و سۆز تازە بکرێتەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩٩. گومان لە ئافرەتەکەی پەیدا بکات لە بەر دووری لێکچوونی منداڵەکانی.

لەسەرت پێویستە گوێ بە شتانە نەدەی، چونکە تۆ نازانی لەوانەیە لە باپیرانی تۆ یان لە باپیرانی ژنەکەت کەسێك هەبێت لەو شێوەیەی کەتۆ بێت وایە نامۆیە لە شێوەی منداڵەکانی ترت.گوێی پێ مەدە پشتی خۆت بە خوا ببەستە لە شەیتانی

دوورخراو له بەزەیی خوا. مادەم ئافرەتەکەت ڕێکو پێکو باشە، ئەوە هیچ گومانت نەبێت بەرامبەری.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٠٠. دروستە بۆ پیاو بە دایکی خێزانی بڵێت مامۆژن، پور یان خاڵۆژن. «اللجنة الدائمة»

١٠١.دروستە بۆ پیاو بە باوکی خێزانەکەی بڵێت مامە یان خاڵە

«اللجنة الدائمة»

## ﴿ئاگەدار بووەکانی ژن هێنان﴾

❖ **پێویستە لە مارە بڕی ئافرەت ئاگەداری ئەو شتانە بیت:**

١٠٢. بە تاڵ بوونی گرێبەستی ژن هێنان لە مارەیی، گرێبەستەکە هەر دەبێت مارەیی تێدا بێت، ئەگەر باسکرا بوو باشە، ئەگەر نا مارەیی هاوشانەکانی وەکو خۆی بۆ واجب دەبێت، پێویستیشە لە گرێبەستی مارەیی باس بکرێ، چونکە ئەوە بە سوودترە بۆ ئافرەتەکەو چاکترە بۆ نەمانی مشتو مڕو کێشە.

١٠٣. بە مێرد دانی ئافرەت بەبێ سەرپەرشتکار (ولی): دەبێ ئافرەتەکە سەرپەرشتکاری هەبێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (لا نكاح إلا بولي) واتە هاوسەرگیری‌و ژن هێنان دروست نیە مەگەر بە هەبوونی سەرپەرشتکار نەبێت، وەپێشەوای موسڵمانان سەرپەرشتکاری ئەو کەسەیە کە سەرپەرشتکارو کەسی نزیکی نیە.

١٠٤. شایەتی: گرێبەستەکە مۆر ناکرێت مەگەر بە شایەتی دوو کەسی نێری ئەرکباری موسڵمانی دادوەر نەبێت.

١٠٥. دەبێت هەر دوو هاوسەرەکە بە یەکتر ڕازی بن

١٠٦. دەبێت هەر دوو هاوسەرەکە دیاری بکرێن.

١٠٧. بۆ پیاو دروستە، ئەوەی بیەوێت بداتە ئافرەتەکەی، لەو کاتەی کە لە سەر تەندروستیو ژیانی خۆیەتی بەرامبەر خۆراگریی‌و چاك خزمەت کردنی خێزانەکەی بۆی، بەڵام نابێت ئەو کارەی کردبێت وەکو زیان گەیاندێك بە میراتگرەکانی دیکە، ئەوەش سنوور دار ناکرێت، بە چواریەکی پارەو بڕی دیکە.

١٠٨. هەروەها سەبارەت بە ئافرەتیش بۆی هەیە ئەوەندەی دەیەوێت بداتە هاوسەرەکەی لە پارەکەی یان لە مارەییەکەی.

«الشيخ إبن جبرين»

١٠٩. پارەو پولی ئافرەتەکەی برد، پاشان دوای مردنی وەسیەتی کرد بیدەنەوە.

ئەگەر بەرامبەر ئەو پارە بێت کە لێی بردووە لە ژیانیدا ئەوە دروستە، کاتێك ئەو بڕە پارەی وەسیەتی بۆ کردووە یەکسان بوو لە گەڵ ئەو پارەی کە لە گەردەنیەتی،دەبێت لە میراتە بەجێماوەکە پێی بدرێت نەك لە سێ یەکەکە.

«اللجنة الدائمة»

١١٠.تەصویر کردن ئەو شتەی نێوان ژن‌و مێرد ڕوو دەدات لە کاتی پێکەوە ژیانی هاوسەری

حەرامە،زۆر بەتوندیش حەرامە، هیچ شەرعێك‌و خاوەن عەقلێك‌و هیچ ڕەوشتێك ڕێ پێ نادات، جا پێویستەو واجبە لێی دوور

بکەویەوە، سوور بیت لەسەر پاراستنی ناموس‌و عەورەتەکان، چونکە ئەو شتانە هەموو لە ئیمانەوەیە، لە سروشت‌و فیترەتی ڕاست‌و دروستە.

«اللجنة الدائمة»

١١١. ڕابواردن  بە هەموو لەشی ئافرەت.

دروستە بۆ پیاو کە مەمکی خێزانەکەی بمژی، هیچ حەڕام بوونێك ڕوو نادات بە گەیشتنی شیری مەمکی بۆ گەدەی پیاوەکە.

«اللجنة الدائمة»

١١٢. دروستە بۆ پیاو جووت بێت لە گەڵ هاوسەرەکەی لە پشتەوە ( ئەگەر جووتبوونەکە لە پێشەوە بێت نەك لە پشتەوەی)

«اللجنة الدائمة»

١١٣. ئەگەر مێردەکەی شەڕابی دەخواردەوە ئایا گوناه لەسەر ئافرەتەکە هەیە ئەگەر ڕووی تێ نەکات لەسەر جێگا.

نەخێر گوناهی پێ ناگات، وە لەسەری واجبە ئامۆژگاری بکات، ئەگەر گوێڕایەڵی نەکردو سوور بوو لەسەر ستەمەکە، داوای جیابوونەوە (تەڵاقی) لێ دەکات، بۆ دووركەوتنەوە لەو حەڕامە.

«اللجنة الدائمة»

١١٤. دەنگ بەرزکردنەوەی ئافرەت لەسەر پیاوەکەی.

دروست نیە بۆ یەکێك لە هاوسەرەکان هیچ زیانێك بە یەکتر بگەینن بەبێ هۆ نە بەرزکردنەوەی دەنگ نە بە شتی دیکەش.

«اللجنة الدائمة»

## ❖ چ کاتێك خەرج کردن لەسەر ئافرەت لا دەچێت

١١٥. ئەگەر خۆی بگرێت لە پیاوەکەی، خەرجیەکەی لا دەچێت لەبەر خۆ نەدانە دەستی بۆ ڕابواردن.

«الشيخ إبن فوزان»

١١٦. ئەگەر گوێرایەڵی نەدەکرد( ناشز بێت): ئەویش سەرپێچی کردنیەتی لەو شتانەی کە پێویستەو واجبە لەسەری، وەکو ئەوەی خۆی لێ بگرێت لەسەر جێگا، وەبچێتە دەرەوە بەبێ ڕێپێدانی پیاوەکەی.

«الشيخ إبن فوزان»

١١٧. ئەگەر سەفەر بکات بۆ پێویستی تایبەتی خۆی، بە ڕێپێدانی پیاوەکەی یان بەبێ ڕێپێدانی پیاوەکەی، ئەوە مافی خەرجیو دابەش کردنی سەرجێگای نامینێت.

«الشيخ إبن فوزان»

١١٨. ئەو ئافرەتەی کە پیاوەکەی مردووە جا چ دوو گیان بێت یان دوو گیان نەبێت، چونکە پارەکە گوازراوەتەوە بۆ میراتگرەکان

«الشيخ إبن فوزان»

١١٩.	ئامۆژگاری بۆ قەیرە کچەکان

دەبێ ڕووی خۆیان لە خوا بکەن لێی بپاڕێنەوەو بنوزێنەوە، بۆ ئەوەی پیاوێکیان بۆ بێتە خوازبێنی کە لە دین‌و خورەوشتی ڕازی بن، وەئەگەر مرۆڤ ڕاست گۆ بێت لە ڕووکردنی بۆ خوا، ئادابەکانی دوعا جێ بەجێ بکات‌و واز لە بەربەستەکانی وەڵامدانەوە بێنێت، ئەوە خوا وەڵامی دەداتەوە

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢٠.	حوکمی گونجاندنی نێوان ژن‌و مێردێك بە جادوو.

ئەو شتە حەڕامەو دروست نیە. ئەوە پێی دەگوترێت جادووی (عطف)، وە ئەو جادووەی نێوانیان جیا دەکاتەوە پێی دەگوترێت (صرف)، ئەویش حەڕامە. هەندێك جار دەبێتە کوفر یان هاوبەش دانان.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢١.	وە ئەوەی شتی نووسراو دەنوسێت بۆ ئەوەی هەر دوو هاوسەرەکە یەکتریان خۆشبوێت یان نێوان دوو هاوسەری لا یەکتر خۆشەویست جیا بکاتەوە، ئەوە جادووە.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٢.	ئەوەی غیرەی لە ژنەکەی هەیە، تا دەگاتە سنووری گومان کردن لێی.

لە ئەصل دا ئافرەتی موسڵمان ڕێكو پێكو پاكە، جا دروست نیە بۆ پیاوی ئافرەتە موسڵمانەكە گومانی لیٚ بكات، تەنها لەبەر چەند دالْغەو خەیاڵاتێكی دەروونیو شەیتانی، یان لەبەر هەواڵی یەكێكی دوو ڕووی تێكدەر.

❖ وە پێویستە لەسەر ئەو ئافرەتە موسڵمانەی كە پیاوەكەی تووشی ئەو نەخۆشیە دەروونیە بووە، ئارامو خۆڕاگر بێت، مادەم متمانەی بە خۆی هەیە كە ڕاست گۆ و پاكە، نابێت گومانو دالْغە دەروونیەكانی پیاوەكەی زیانی پیٚ بگەیەنێت، چونكە لەوانەیە ئەو گومانو دالْغانە لە نەخۆشیەكی دەروونی سەریهەڵدابێت بڕوات بە یارمەتی دانی خوا.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٣. پیاوێك قەدەغەی خێزانەكەی دەكات كە سەردانی خزمەكانی بكات.

دروست نیە بۆ پیاو خێزانەكەی قەدەغە بكات لە سەردانی دایكو باوكو خزمە نزیكەكانی، مەگەر كاتێك ئەو سەردانە خەراپەیەكی لیٚ بكەوێتەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٤. ئەو كەسەی هەڵسو كەوتی لە گەڵ خێزانی یەكەمی دەگۆڕێت دوای هێنانی خێزانی دووەم.

واجبـه لـه سـەر پیـاو دادوەری بکـات لـه نێـوان خێزانـەکانی لـه خەرجیو ڕێو جێو جلو بـەرگو دابـەش کردنـی سـەرجێگا، لـەو شتانە، هەموو دەبێت دادوەر بێت لە نێوان خێزانەکانی، جیـاوازی نیە نێوان دۆڵەمەندو فەقیر، چونکە هەموو خێزانی ئەون.

«الشیخ إبن فوزان»

١٢٥. ئافرەتێك لاری هەیە لە گەڵ کەس‌و کاری پیاوەکە بـژێت بۆ دوورکەوتنەوە لە کێشەو گرفت.

ئەوەی پێویستە لەم حاڵەتە پیاوەکە بیکات، هەولبدە چاکسازی بکات لە نێوان ئافرەتەکەو کەس‌و کاری، ئەگەر ئـەم چاکسازییە نەکرا، ئەوە هیچی تێدا نیە ل‌یان جیا بێتەوە ماڵی خـۆی بکـات. وەپەیوەندی لە گەڵ کـەس‌وکاری نەپـچڕێنێت، بـەڵکو سـەردانیان بکات‌و چاکەیان لە گەڵ بکـات، ئـا بـەو ڕێگایـە بـە ئـەرك‌و واجبـی خۆی هەڵسایە بەرامبەر کەس‌و کارو خێزانی.

«الشیخ إبن عثیمین»

١٢٦. (عزل) لـە کـاتی جـووت بـوون دروسـتە، بـە مـەرجی ڕێ پێدانی ئافرەتەکە

(عزل) ڕشتنی مەنییە لە دەرەوەی کۆ ئەندامی زاوزێی ئافرەت.

ڕای دروست: عزل بەبێ هۆ هیچی تێدا نیە بە چەند مەرجێك

١. دەبێت بە ڕێپێدانی ئافرەتەکە بێت، چونکە ئافرەتەکەش مافی هەیە کە منداڵی هەبێت.

٢. وە لەبەر ئەوەی لە عەزلەوە کەم و کوڕی هەیە لە خۆشی بینین و رابواردنی ئافرەتەکە، چونکە لە رزەت وەرگرتن و ڕەحەت بوونی ئافرەتەکە، دوای ئاو هاتنە خوارەکە دەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٢٧. خوازبێنی کار لە بانکەکانی ریبا ئیش دەکات.

ئەگەر حاڵەتی خوازبێنی کار وابێت، چاکتر وایە شووی پێ نەکات.

«الشيخ إبن باز»

١٢٨. پیاوەکەم لە گەڵم نا گوزەرێنێت بە چاکە.

لەسەر ئافرەتەکە واجبە خۆڕاگر بێت و ئارام بگرێت، ئامۆژگاری بکات بە جوانترین ووشە، خوا گەورەو قیامەتی بە یاد بێنێتەوە، دوعای هیدایەتی بۆ بکات لە خوا، وەلەسەری پێویستە لێ پێچینەوەی وورد لە گەڵ خۆت بکات، تەوبە بکەو بگەڕێیەوە لە هەر گوناهێک دەرهەق بە خوا، یان دەرهەق بە پیاوەکە، یان دەرهەق بە کەسانیتر کردووتە، چونکە لەوانەیە بە هۆی ئەو گوناهانەی کردووتە لەسەرت زاڵ بووبێت، چونکە خوای گەورە دەفەرمێت (( وما أصابكم من مصيبة فبما كسبت أيديكم ويعفوا عن كثير )) هەر بەڵاو ناخۆشیەکەتان بەسەر دێت بە هۆی کردەوەی دەستی خۆتانەو چاوپۆشی لە زۆر شتیش دەکات.

## ﴿ چەند مەسەلەیەك لە فرە ژنی ﴾

❖ حیكمەت لە چەند ژنی.

١. ئامارو هەڵژماردن بەڵگەن لە سەر ئەوەی لە دایكبووی مێیینە زیاترە لە ژمارەی ئەو نێرانەی لە دایك دەبن. وە ژمارەی ئەوانەی دەمرن لە نێران زیاترن لە ژمارەی ئەو مێیانەی دەمرن بە هۆی شەڕو شۆڕو شتی دیكە.

٢. ئافرەتان تووشی حەیزو حەملو منداڵبوون دەبن، ماوەیەك خوێنی نیفاس (منداڵبوون) لایان بەردەوام دەبێ، جا ئەگەر پیاو زیاتر لەیەك ژنی هەبێت، ئەوە پیاوەكە ژنیتر تری هەیە بۆ پاراستنی دامێنی خۆی لە حەرام.

❖ ئەگەر چەند ژنی قەدەغە بكرێت، ئەوە ژمارەیەك لە ئافرەتان بێ هاوسەر دەبن، لەززەتو ڕابواردنو تێر كردنی غەریزەی سێكسیيان لا دەفەوتێت بەو شێوەی كە گونجاوە لە گەڵ ڕێزو شەرەفیان.

كۆتایی: دەبێ باوەڕمان وابێت كە چەند ژنی یاسایەكەو تەشریعێكە لە لایەن خوایەكی داناو سوپاسگوزار، بەبەزەییو بەسۆز (رحیم ودود) پرسیاری لێ ناكرێت لەو شتانەی دەیكا، وەئەوانیش پرسیاریان لێ دەكرێت.

«اللجنة الدائمة»

١٢٩. ئايا ڕازی بوونی ئافرەتی یەکەم مەرجە لە چەند ژنی؟

نەخێر فەرز نیە لەسەر پیاو ئەگەر ویستی ژنی دووەمی بێنێت، ژنی یەکەمی ڕازی بکات، بەڵام دڵنەوایی‌و دڵ هێنانەوەی لە خورەوشتە بەرزەکانەو لە چاکی پێکەوە ژیان‌و گوزەرانە، ئەویش بە ڕووێکی خۆش لە گەڵی دابنیشێت بە جوانی پێی بڵێت، وە بڕە پارەیەکی پێ بدات ئەوەندەی کە لە توانایدا هەیە، ئەگەر ڕازی بوونەکەی پێویستی بەو بڕە پارەیە هەبوو.

«اللجنة الدائمة»

١٣٠. دادوەری نێوان خێزانەکانی،

لە دابەشکردنی شەوەکان‌و (سەر جێگا) خەرجی دەبێت، بەڵام دادوەری لە خۆشەویستی‌و پاشکۆیەکانی لە جووت بوون‌و شتی دیکە ئەوە ناتوانرێت.

«الشیخ إبن باز»

١٣١. دەبێت شەوەکان دابەش بکات بۆ حەیزدارو نیفاسداریش، چونکە هەموو هەر خێزانی ئەون.

«مذهب الحانبلة »

١٣٢. ئەگەر کچە گەنجێك بێنێت حەوت ڕۆژ لە لای دەبێت، پاشان دابەش کردنی شەوەکان دەست پێ دەکات، بەڵام ئەگەر بێوەژنێکی پیر بێنێت سێ ڕۆژ لە لای دەبێت.

١٢٣. چوونە لای ئافرەتەکەی لە شەوێکی دیکەی جگە لە شەوی خۆی،

ڕای ڕاستو دروستر : ئەوەیە بگەڕێیەوە بۆ دابو نەریتی باوی ئەو خەڵکە، ئەگەر چوونە لای خێزانەکەیتری بۆ ماوەی شەوێك یان ڕۆژێك، خەڵکی بە ستەم دایاننەدەنا ئاسایەو چی تێدا نیە، چونکە گەڕانەوە بۆ دابو نەریتی باوی ناو خەڵکی، بنچینەیەکی گەورەیە لەو مەسەلانەی کە بەڵگەیان لەسەر نیە.

«الشيخ السعدي»

١٢٤. ئەگەر ئافرەتەکە بەشە خەوتنەکەی خۆی لەسەر جێگا بە هەوێیەکەی خۆی یان بە خێزانێکیتری بەخشی.

دروستە ، چونکە ئەوە مافی خۆیەتی، وە چ کاتێك ئافرەتە بەش بەخشەرەکە گەڕایەوەو پەشیمان بۆوە، واجبە لەسەر پیاوەکەی بەشی بۆ دابنێ لە داهاتوو (وەکو جارانی پێشووی).

«اللجنة الدائمة»

١٢٥. بۆ پیاو دروست نیە یەکێك لە خێزانەکانی تایبەت بکات بە بەخششێك جگە لە ئەوەکانیتر بەبێ هۆیەکی شەرعی.

وە بەو شتەش بۆمان روون دەبێتەوە خەڵاتکردنی ئەو خێزانەی کە یارمەتی پیاوەکەی دەدات لە کردەوەکانی، بەرامبەر خزمەتەکەی خەڵات بکرێت، هیچی تێدا نیەو دروستە.

«اللجنة الدائمة»

١٣٦. حوكمی ئەو كەسەی كە (چەند ژنی) دەبوغزێنیو نا شیرینی دەكات لە لای خەڵك؟

دروست نیە بۆ موسڵمان ڕقی لەو شتە ببێتەوە كە خوا بە یاسا دایناوەو خەڵكی لێ دوور بخاتەوە، وە ئەوەش بە پاشگەز بوونەوە (الردة) لە ئسلام دادەنرێت، لەبەر فەرموودەی خوای گەورە (ذالك بأنهم كرهوا ماأنزل الله فأحبط أعمالهم) واتە لەبەر ئەوەی ڕقیان هەبوو لەوەی كە خوا دایبەزاندبوو، سەرەنجام كردەوەكەیان بە تاڵ بۆوە. جا كارەكە زۆر ترسناكەو هۆیەكەشی كارتێكردنی پروپاگەندەی ئەو كافرانەیە كە خەڵك دوور دەخەنەوە لە ئیسلام، ئەو كاریگەریەش ڕەنگ دەداتەوە لەسەر ئەو موسڵمانە ساویلكانەی كە حیكمەتی شەرعی ئسلامیان لا شاراوەیە لەو بەرژەوەندیەی كە تێیدایە بۆ ئافرەتان پێش پیاوان.

«الشيخ إبن فوزان»

١٣٧. ئەگەر ویستی سەفەر بكات بە یەكێك لە خێزانەكانی لەسەری پێویستە تیرو پشك بكات.

جا كامەیان پشكەكەی دەرچوو سەفەری پێ دەكات، هەروەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) وای دەكرد، بەشە شەوی كاتی سەفەرەكەی قەزا نەدەكردەوەو نەیدەگێڕاوە بۆ ئافرەتەكان، بەڵكو تەنها كاتی

ئامادە بوونی، سەرجێگای بۆیان دابەش دەکرد، سەفەری حەج و عومرەش وەکو سەفەرەکانیتر دەبێت تیرو پشك بکرێت.

«اللجنة الدائمة»

١٣٨. ئەوەی ئافرەتی دووەم بێنێت ئایا مارەیی بداتە یەکەم؟

ئەوەی ژنێکیتر بێنێت لەسەری واجب نیە ئەو مارەیی و زێڕەی دەداتە ژنەکەی دووەمی بداتە یەکەمیش،وە ئەگەر پێیدا وەکو دڵنەواییەك و دڵ هێنانەجێی ئافرەتەکە ئەوە چاکە.

«اللجنة الدائمة»

١٣٩. ئەگەر ئافرەتەکە مەرجی تەڵاق دانی هەوێیەکەی داناو دەیزانی حەڕامە (ئەو مەرجە دابنێ)، ئەوە مەرجێکی بە تاڵەو دروست نیە، بەڵام ئەگەر حوکمەکەی نە دەزانی ئەوە بۆی هەیە داوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستی مارەییەکە بکە ( فسخ).

«الشيخ محمد بن إبراهيم»

## ﴿ئامۆژگاری زێڕینی بۆ ئافرەتانی خاوەن مێرد﴾

### ❖ چەند بڕگەیەکی وەرگیراو لە کتێبی "القاموس في ما يحتاج إليه العروس" (صالح الغزالي)

١. لە بیروبۆچوونە هەڵەکان لە لایەن هەندێك لە ئافرەتان بڕوایان وایە خەرجی پیاوەکانیان بۆیان، تەنها بەڵگەیە بۆ خۆشەویستی هاوسەرەکانیان بۆیان، هەر چەند خەرجی زیاتر بێت خۆشەویستیەکە زیاترە، وە پێچەوانەکەشی پێچەوانەیە.

٢. لە شتە سەرسوڕهێنەرەکان، ئەوەیە ئافرەت ژیرو هاوسەنگ بێت لە هەڵس و کەوتیدا لە گەڵ هەموو خەڵکێك تەنها لە گەڵ پیاوەکەی وانەبێت.

٣. لە هەڵە دووبارە بووەکانی ئافرەت، خەراپ پێشوازیکردنی پیاوەکەیەتی لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵ.

٤. یەکێك لە هۆکارەکانی وورژاندن ( تەماشا کردنی حەڕام، قسە کردن، دەست لێدان، بۆنی خۆشیە)

٥. دەبێت دروشمی هەر دوو هاوسەرەکە بەرامبەر یەکتر لێبووردنو چاوبۆشی بێت لە یەکتر لە هەڵسو کەوتیان.

٦. ئاگەدارو ووریای غیرە بە، چونکە کلیلی تەلاقدانە، وە لەسەرت پێویستە خۆت جوان بکەیتو برازێنیەوە، لە هەموو جوانیەکانیش جوانتر، کل لە چاو کردنە، وەلەسەرت پێویستە خۆت بۆن خۆش بکەی بە هەموو بۆنو عەترێك، لە هەموو بۆنێکیش خۆشتر، دەست نوێژ هەلگرتنە.

٧. لە دابو نەریتی خە‌،‌ا‌ هەندێك ئافرەتان، ئەگەر لە لای ئافرەتێکیتر دانیشت ئەگەرچی نامۆش بێت هەموو ووردو درشتی حاڵی خێزانی خۆی بۆ باس دەکات.

٨. زۆربەی ئافرەتان لە بیروبۆچوونیان ناوەراستو مام ناوەند نین، یان پێیان وایە پیاوەکانیان خۆشیان دەوێن یان پێیان وایە رقیان لێی دەبنەوە... کاتێك باوەری وابوو کە رقیان لێدەبنەوە، وا وەیلا بۆ خۆیانو پیاوەکانیان.

٩. زۆربەی گرفتو کێشەکانی هاوسەرایەتی بۆ کەمو کورتیو کەمتەرخەمی هەر دوو هاوسەرەکە یان یەکێکیان دەگەرێتەوە لە تێر کردنی سۆزو ئارەزووی سێکسی یەکتر،چەندەها گرفتو کێشەی تریش بەو هۆیەوە پەیدا دەبێت، دەکرێ ئەو گیرو گرفتانە چارەسەر بکەی بەبێ دەست لێدانی گیرو گرفتە راستەقینەکان.

١٠. ئافرەتی ژیر هەموو شتێك كە گوێ بیستی دەبێت لە دەستە خوشكو هاوەڵەكانی باوەڕ ناكات سەبارەت بە پێداهەڵگوتنی مێردەكانیان، یان ئەم جۆرە قسانە كاری لێ نا كات لە كاردانەوەی خەراپی دژی پیاوەكەی. لەوانەیە تەنها مەبەستییان خۆ هەڵكێشان بێت یان لەبەر غیرەی زۆریان بێت بەرامبەرت یان دەیانەوێت دوژنایەتی بخەنە نێوان تۆو پیاوەكەتو هۆی دیكەیشی هەیە.

١١. یەكێك لە شارەزاكان ئامۆژگاری هاوسەرێك دەكات بۆ پاراستنی گەرمی خۆشەویستی نێوانیانو گوتی:

- دیاری بۆ یەك هێنان (( چاكترین دیاریش ووشەیەكی چاكە))
- پەیوەندی تەلەفۆنی بۆ پرسیار كردنی حاڵی.
- بە تەنیا لە گەڵ خۆی بیباتە سەفرەیەك.

١٢. ژیانی هاوسەری لەلایەن هەر دوو هاوسەرەكەوە پێویستی بە جۆرەها خۆڕاگریو ئارامیو داناییو دان بە خۆ داگرتنو وەفاو خۆشەویستیو متمانە هەیە، وە پێویستی بە ڕاستكردنەوەی هەڵەكان هەیە لە ژێر تیشكی ئیسلام.

١٣. زۆرێك لە ئافرەتان گازندەو گلەیی لە دوور كەوتنەوەو ئامادە نەبوونی پیاوەكانیان دەكەن لە ماڵ بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ، وە لەیادیان نیەو لەبیریان چووە هەر خۆیان هۆكاری ئەو شتەن. ئەویش بە گۆڕینی ماڵەكەیان بۆ پارچەیەك لە ئاگر، پیاو حەز ناكات ماوەیەكی زۆر لە ماڵ بمێنێتەوە.

# ﴿گیرو گرفتی هاوسەری چارەسەرەکەی﴾

❖ هیچ هاوسەرگیریەك نیە بێ گرفتو کێشەو دووبەرەکی بێت نێوان ژنو مێرد، هەرچەند نەریتو سروشتیان وەکو یەك بێت، بەڵام بەسەبرو خۆڕاگرتنو ئیش کردنو عوزر بۆ هێنانەوەو هەبوونی متمانەو گومانی باش بە هاوسەرەکەت، زۆربەی هەرە زۆری دووبەرەکیەکان لا دەچێت، خۆشەویستیو گونجاندن لە نێوانیاندا بە دەست دێت.

❖ چەند نموونەیەك لەدووبەرەکیەکانی هاوسەری، چۆنیەتی هەڵسو کەوت لە گەڵ کردنی.

١. گیرو گرفت لە گەڵ کەسو کاری پیاوەکەو نزیکەکانی.

❖ **چارەسەر:**

❖ پێویستە لەسەر ئافرەتی تێگەیشتوو بزانێتو هەست بەوە بکات کە دایكو باوکی مێردەکەی هەر دووکیان خاوەن چاکەن لەسەری، لە فەراهەم هێنانی خوشیو بەختەوەری بۆی، لە پێکەوە ژیانیو پەیوەندی لە گەڵ ئەم پیاوە.

- پێویستە لەسەر ئافرەت ڕێزیان بگرێتو بە خۆشەویستیو ڕێزەوە هەڵسو کەوتیان لە گەڵ بکات.

٢. گیروگرفتی خۆ تێهەڵقورتانی دایکی ژنەکە لە کاروباری هاوسەرەکەی: خۆ تێهەڵقورتانی هەندێك دایك لە ژیانی هاوسەری کچەکەی، تا دەبێتە ڕێنیشاندەرو ئارەستەکەرێك بۆ کچەکەی پشتی پێ دەبەستێت لە بەڕێوەبردنی هێلانەی هاوسەرایەتی، ئەوەش تووڕە بوونی پیاوەکەی لێدەکەوێتەوە، لەبەر ئەوەی ژیانەکەیان ئاشکرا دەبێت لەلایەن کەسانیتر.

❖ چارەسەر:

- لەسەر ئافرەتەکە پێویستە لە کەسایەتی خۆیو ڕایەکانی سەربەخۆو سەربەست بێت، چونکە بەو شتە متمانەی پیاوەکەی وەردەگرێت

- واجبە لەسەر ئافرەتەکە پارێزگاری لە نهێنیەکانی ژیانیان بکات.

- هەموو ئەوانەش ئەوە ناگەینێت کە سوود وەرنەگرێت لە ئامۆژگاری شارەزایی گەورەکان لە ژیان.

٣. ئەو گیروگرفتانەی پەیوەستە بە بەجێ هێشتنی ماڵ لەلایەن پیاوەکەی، ووشکی هەڵسو کەوت کردنی لە گەڵی،

پشتکردنی له خێزانی ( نه له گەڵی دادەنیشێت، نه له گەڵی قسه دەکات، نه هۆگری پێ دەگرێت).

ئاگەداری: پێویسته لەسەر هەر ئافرەتێك پرسیار له خۆی بکات، چی کردووه بۆ بەرگری کردنی له ڕوودانی ئەم ساردو سڕییە که تێکەڵی ژیانی هاوسەریان بووه.

### ❖ چارەسەر:

– دوعاو پاڕانەوەو پشت بەستن به خوا بۆ چاکسازی له حاڵیان

– دوور کەوتنەوه له گوناهو تاوان، چونکه گوناهو تاوان بێ گومان دەبێته هۆکارێك له پشتێ کردنی پیاو له ژنەکەی وەکو سزایەك له لایەن خواوه، گوناهەکانه هەندێك لەو وەکو ( خۆ بەدەرخستنی(تبرج)، گۆرانیو غەیبەتو نوێژ دواخستنو چاوچلێسیو حەسودی کردن).

– زۆر داوا کردنی چاوپۆشی له خوای گەوره (ئەوەی بەردەوام داوای چاوپۆشیو لێخۆشبوون له خوا بکات، خوای گەوره له هەموو غەمو پەژارەیەك دەرچەیەکت بۆ دەکاتەوه، له هەموو تەنگژەیەك دەرگایەکی بۆ دەکاتەوه بۆ ڕزگار بوون.

– هەوڵی زانینی هۆکاری دوورکەوتنەوەو گوێڕایەڵ نەبوونی بده..

له میانەی دانیشتنێکی خێزانی بۆ بەدوا چوونی کاروبارەکانو پالاوتنیان.

- ئەی‌ئافرەت: بە خەراپە لە پیاوەکەت تێ مەگە، چونکە شتە سەرقاڵکەرەکان‌و قورسەکانی ژیان، زۆری بەرپرسیاریەتەکەی، لە یادی دەبەنەوە لە هەموو کاتێک قسەی شیرین‌و هەنگوینیت لە گەڵ بکات.

- رۆژانە هەندێك شتی تازەو لە ناکاو بکە، لە شێوە، لە گفت‌و گۆ، لەجۆری خواردن، لەبەر کردن، ئەو شتانە گۆڕانکاری کەش‌و هەوای ماڵ دەستەبەر دەکەن‌و گەرم‌و گوڕی دەکەن.

- ببە هاورێیێك بۆ پیاوەکەت، هەتاکو بە خۆی لە گەڵت باش دەبێت...وە گرنگی بەو شتانە بدە، کە پیاوەکەت گرنگی پێ دەدەن.

٤. گیرو گرفتی پەیوەست بە خەرجی کردن، یان نەبوونی پارەی پێویست، یان دەستبلاوی ئافرەتەکە، یان رژدی پیاوەکە.

❖ **چارەسەر:**

- خوا فەرموویەتی ( وكلوا واشربوا ولا تسرفوا .... ) واتە بخۆن‌و بخۆنەوەو دەستبلاوی مەکەن...)

- ئامۆژگاری هاوسەرەکان دەکەین کە هاوسەنگی بکەن لە خەرجی کردن ، وە گرنگترینی بە پێش گرنگ بخەن.

- پێویستە لە سەریان هەندێك راتب عەمبار بکەن‌و هەڵیبگرن وەکو یەدەگێك بۆ هەر رووداوێکی لە ناکاو.

- پێویستە هاوسەنگیەکی روون و دیار دابنرێت، کە چۆن پێداویستیەکانیان دیاری بکەن و چۆن پارەی بۆ خەرج بکەن.

٥. هۆکاری گیرو گرفتی هاوسەری هەموو بۆ نەزانینی دوو شتی گرنگ دەگەرێتەوە.

- نەزانینی یاساو رێساو مافەکانی شەرعی هاوسەری، وەپاشان کەم و کوری و کەم تەرخەمی ائێ.

- نەزانینی پێکهاتەی دەروونی و خەسڵەتی کەسیەتی بۆ هەر یەك لە پیاوو ژن ( واتە پیاوەکە لە سروشت و نەریتی ئافرەتەکە تێ ناگات و نەزانە... وە بە پێچەوانەش) ئەوەش سەر دەکێشێت بۆ نەزانینی چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردنی هەر یەکەیان بەرامبەر یەکتر.

## ﴿ماڵێکی بێ گیروگرفت﴾

❖ ئەو ماڵەی بەیەکەوە دەژین بەبێ گیروگرفتێکی شایەن باس، مەگەر هەندێك دووبەرەکی سادە نەبێت، کە دەکرێ چارەسەر بکرێت لە کاتی خۆی، شوێنەواری زۆر جوانی هەیە لەوانە

- زیاد بوونی سۆزو خۆشەویستیو میهرەبانی لە نێوان هاوسەرەکە، وە پاشان هەموو کەسو کارەکە دەگرێتەوە.
- پێکەوە ژیان بە چاکە، هەروەك چۆن خوا فرمانی کردووە.
- گرنگی دان بە پەروەردە کردنی منداڵ.
- خۆ یەکلاکردنەوە بۆ کردنی کاری چاكو مل کەچی خوا...

ئەگەر ماڵێك بە تاڵ بوو لە گیروگرفت، ئەوە ئەو کات ئەو خێزانە کارەکانی بەرەو چالاکیو بەرهەمداری دەڕوات... وەهەروەها خۆ یەکلا کردنەوە بۆ سوود گەیاندن بە خەڵکی دیکە... ئایا گومان دەبەی ماڵێك پڕ بێت لە گیروگرفت، بەشداری بکات لە چارەسەر کردنی گیروگرفتی ماڵێکیتر؟!.

❖ هۆکارەکانی تێکچوونو ڕمانی خێزان زۆرن لە گرنگترینیان.

١. پەیوەندی بەستن لەنێوان ژنو مێرد لەسەر شتی دیکەی جگە لە گوێرایەڵی خوا.

٢. پەلە کردن لە هەڵبژاردن.

٣. ئەو فێڵەی کە لە هەردوو لا ڕوو دەدات.

## ﴿ سیفاتی خەراپ لە هەندێك ئافرەتان ﴾

١. زۆر پێ داگرو سوور بێت لە داواکاریە ماددیەکانی.

٢. زیاتر لە پێویستی خۆی داوا بکات لەبەر لاسایی کردنەوەی کەسانی دیکە.

٣. لاسارو ڕقاوی بێت بە پێچەوانەی مەبەستی پیاوەکەی هەڵس و کەوت بکات.

٤. زمان شڕو هەراش بێت لە گەڵ پیاوەکەی یان لە گەڵ نزیکەکانی پیاوەکەی.

٥. قسە گێڕەوە بێت یان بەزیادەوە قسە بگێڕێتەوە، بە شێوەیەك کە نهێنیەکانی ماڵ لە کەدار بکات.

٦. مێردەکەی شەرمەزار بکات، بەوەی بە ڕژدو ڕەزیلی یان بە کەمتەرخەمی وەصفی بکاتو لەلای کەسانی دیکە باسی بکات.

٧. زۆر چوونە دەرەوەی لە ماڵ، بە شێوەیەك لە ماڵەوە هیچ ئۆقرە نەگرێتو بە دەگمەن ببینرێ.

٨. زۆر بە زەبرو زەنگو ڕەقو تووڕە بێت.

٩. بێ ئەمەكو سپڵە بێت ئینکاری چاکەکان بکات.

١٠. کەمتەرخەمی کردنی هەندێك لە ئافرەتان لە ئەرك و واجباتی ماڵەوە، وەکو پاك و خاوێنی و خواردن ئامادە کردن و ڕێك و پێك کردنی کاروباری ماڵەوە.

١١. سوور بوونی هەندێك لە ئافرەتان لە سەر زانینی نهێنی پیاوەکانیان.

١٢. هەوڵ دانی هەندێك لە ئافرەتان لە جێ بەجێ کردنی هەموو ئەو شتانەی کە لە ماڵی کەس و کاری خۆیان هەیە لەسەر ماڵی مێردەکانیان ئەگەرچی نەشگونجێت.

**( القاموس ف ما يحتاج إليه العروس)**

# ﴿ ئافرەتو تەڵاق دان﴾

❖ (٤٥) وەڵامی تێدایە.

١. تەڵاق دەکەوێ، ئەگەر ئافرەتەکەش پێی نەگەیشتبێت، ئەگەر مرۆڤ زاراوەی تەڵاق بەسەر زمانی دا هات ووتی تەڵاقم دا خێزانەکەم، خێزانەکەم تەڵاق دا ، جا چ ئافرەتەکە بزانێت یان نەزانێت، ئەگەر هاتوو زانی دوای بینینی سێ حەیز، ئەوە کاتی (عیدەکەی) بەسەر چووە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢. مەبەستی تەڵاق دانی هەبێت بەڵام نە بزمان دەریبڕیوە نە بە نووسین نووسیویەتی، ئافرەتەکە تەڵاق نادرێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

٣. هەندێك لە هۆیەکانی تەڵاق.

– نەبوونی خۆشەویستی نێوان دوو هاوسەرەکە.

– هەڵنەستان بە ئەرکو مافی هاسەرایەتی، وە کەوتنە ناو گوناهو تاوان لە لایەن یەکێکیان یا هەر دووکیان.

– بەکار نەهێنانی ڕێگای دبلۆماسیو دانایيو زانایی لە هەڵسو کەوت کردن لە گەڵ یەکتردا، لە کاتی هەبوونی گیرو گرفت.

- بایەخ نەدانی ئافرەت بە پاكو خاوێنیو خۆڕازندنەوە بۆ پیاوەکەی، بە جلو بەرگو بۆنو قسەو گوفتارو ڕوو خۆشی لە کاتی بە یەکتر گەیشتنو کۆ بوونەوەیان.

«الشیخ إبن باز»

٤. خێزانی پیاوێك تەلاق نادرێت بە هۆی تووشبوونی زینا، بەلام واجبە لەسەری لە خوا بترسێتو دامێنی خۆی بپارێزێت لەو شتەی خوا حەرامی کردووە.

«الشیخ إبن باز»

٥. مانەوە لە گەڵ پیاوێکی نوێژ نەکەر دروست نیە ئەگەر هاتوو ئافرەتەکە بڕوای وا بوو کە نوێژنەکەر کافرە.

«الشیخ إبن عثیمین»

٦. پێکەوە ژیان لە گەڵ پیاوێکی مەی خۆر.

- پێکەوە ژیانی ئافرەت لە گەڵ ئەو پیاوە حەڕام نیەو قەدەغە کراویش نیە، چونکە بە مەی خواردنەوە نابێتە کافر، بەلام لەسەری پێویستە ئامۆژگاری بکات.

- بەلام کۆچکردن لێی لەسەر جێگا: ئەگەر هاتوو بەرژەوەندی تێدا بوو، بۆ وازهێنانی لە مەی خواردنەوە، ئەوە دروستە ( بەلام ئەگەر بەرژەوەندی تێدا نەبێت، ئەوە بۆی دروست نیە پشتی تێ

بکات لەسەر جێگا، چونکە هۆکارێکی وای نەکردووە لێی حەرام بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧.ئافرەتەکەی تەلاق دا سێ جار بەیەك ووشە:

وەکو ئەوەی پێی بڵێت: تۆ سێ جار تەلاق دراوی یان سێ بەسێ تەلاق دراوی، ئەوە بەیەك تەلاق دادەنرێت، وەبۆی هەیە بیگەڕێنیتەوە ئەگەر هاتوو لە ناو (عیددە)ی خۆی بێت، بەلام ئەگەر (عیددە)ی تەواو بووبێت و دەرچووبێت بە مارە بڕینێکی نوێ بۆی حەلال دەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٨.وا سوننەتە بۆ ئافرەتی تەلاقدراو نەچێتە دەرەوە لە ماڵی خۆی، مەگەر بۆ حاڵەتی پێویستی نەبێت.

٩. سوننەتە شاهێدی هەبێت لەسەر تەلاقدانەکە، وە بەبێ شاهێدیش هەر دروستە.

١٠. ئەوەی گومانی لە تەلاقدان هەبێت: یان مەرجداری بکا، ئەوە تەلاقەکەی ناکەوێت، وە ئەگەر گومانی لە ژمارەکەی هەبێت بە یەك تەلاق دایدەنێت

## ❖ ئەو حاڵەتانەی دروستە بۆ ئافرەت داوای تەلاق بکات.

١١. ئەگەر پیاوەکەی کەمتەرخەم بێت لە خەرجی کردنی.

١٢. ئەگەر پیاوەکە زیانێکی وا بە ئافرەتەکە بگەیەنێت، ئیتر نەتوانێت ژیان‌و گوزەرانی لە گەڵ بەردەوام بکە، وەکو ئەوەی جنێوی پێ بدە، یان لێی بدە بەشێوەیەك لە توانای‌دا نەبێت، یان زۆری لێ بکات لەسەر ئەنجام دانی خەراپە.

١٣. ئەگەر زیانی پێ گەیشتبێت بە هۆی بزربوونی یان دوور بوونی پیاوەکەی، وەترسی گێروگرفت‌و فیتنەی هەبوو لەسەر خۆی.

١٤. ئەگەر پیاوەکەی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ گیرا بێت‌و زیانی پێ گەیشتبێت بەم لێك دوور بوونەیان.

١٥. ئەگەر ئافرەتەکە عەیبێکی دیارو بەجێی لە پیاوەکەی بینی بێت، وەکو نەزۆکی، یان بێ تواناو دەسەڵات بێت لە سەر جووت بوون، یان نەخۆشیەکی ترسناك‌و دوور خەرەوەی هەبێت، شتی دیکەی هاوشێوەی ئەوانە.

١٦. تەڵاقی سوننەتی: ئەوەیە پیاو هاوسەرەکەی تەڵاق بدات یەك جار، لە کاتی پاکبوونەوەی لە حەیز،وە لە ماوەی ئەو پاکبوونەوەدا لە گەڵی جووت نەبووبێت.

١٧. تەڵاقی بیدعی: ئەو تەڵاقەیە کە پێچەوانەی شەرعە:

١٨. وەکو ئەوەی تەڵاقی بدات لە کاتی حەیزی یان نیفاسی.

١٩. یان لە کاتی پاکبوونەوەی لە حەیز بەڵام لە گەڵی جووت بوویێت.

٢٠. یان سێ جار تەڵاقی بدات بە یەك ووشە ( تۆ تەڵاقدراوی سێ جار)، یان سێ جاری جیا تەڵاقی بدات لەسەر یەکتر، لەیەك گۆڕو نیشتگەدا، وەکو ئەوەی بڵێ: ( تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی، تۆ تەڵاقدراوی)

٢١. تەڵاقی ڕەجعی: ئەوەیە پیاو ئەو هاوسەرەی کە لە گەڵی جووت بووە یەك جار تەڵاق بدات، بۆی هەیە بیگەڕێنیتەوە ئەگەر حەزی لێ بوو، مادەم لە (عیددە)ی خۆیەتی.

٢٢. لەو گەڕاندنەوە مەرج نیە،سەرپەرشتیاری ئافرەتو مارەیی و ڕەزامەندی ئافرەتەکە هەبێت یان نەبێت. زانینی ئافرەتەکەو گرێبەستی نوێش مەرج نیە هەبێت.

٢٣. ئافرەتە تەڵاق دراوەکە لە تەڵاقی ڕەجعی حوکمی خێزانی هەیە.

- بۆی هەیە سەیری بکات.
- لە گەڵی بە تەنیا بێت.
- دروستە خزمەتی پیاوەکەی بکات مادەم لە (عیددە)ی خۆیەتی.

– پێویسته لەسەری لەماڵەوە نەچێتە دەرەوە، هەتاکو کۆتایی هاتنی (عیددە)کەی.

٢٤. ئەگەر پیاو خێزانەکەی خۆی تەڵاق دا، تەڵاقدانێکی ڕەجعی، پاشان وا پیشانی دا کە خێزانەکەی گەڕاندووتەوە، بەڵام خێزانەکەی بە درۆی خستەوە (کە نەیگەڕاندووتەوە)، قسەی وەرگیراو، قسەی ژنەکەیە، هەتاکو بەڵگەیەك دێنێت و دەبێتە شاهێد کە گەڕاوەتەوە پێش تەواو بوونی (عیددە)کەی.

٢٥. تەڵاقی بائین: ئەو تەڵاقەیە کە ژنەکە لە پیاوەکەی جیا دەکرێتەوە بە شێوەیەکی کۆتایی ئەویش دووبەشە.

٢٦. بائن بینونة الصغری.

ئەو تەڵاقە خوارووی سێ تەڵاقە، ئەگەر خێزانەکەی یەك جار تەڵاق دا، یان دوو جار تەڵاقیدا، لەماوەی (عیددە)کەی چووە دەرەوەو کۆتایی هات و نەیگەڕاندەوە، ئەوە پێی دەگوترێت تەڵاقی (بائن بینونة الصغری) (پیاوەکە مافی خۆیەتی سەر لە نوێ مارەی بکاتەوە بەگرێبەست و مارەیی نوێ)

٢٧. بائن بینونة الکبری:

ئەو تەڵاقە تەواو کەری تەڵاقی سێیەمە، ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەلاقی دا، ئەوە بە یەکجاری لێی جیا دەبێتەوە، بۆی حەلال نیە هەتاکو شوو بە پیاوێکیتر نەکات، شووکردنێکی شەرعی بە نیەتی

بەردەوام بوون لە گەڵ یەکتر، جیماعی لە گەڵ بکات و لەگەڵی جووت بووبێت، ئەگەر دووبارە تەڵاقیان داوەو (عیددە)کەی تەواو بوو ، ئەوە بۆ هاوسەری یەکەمی دروستە مارەی بکاتەوە، بەگرێبەست و مارەییەکی نوێ وکو ئافرەتانی دیکە.

٢٨. پێناسەی (خلع)

ئەگەر ئافرەتەکە ڕقی لە پیاوەکەی بوو بە دڵی نەبوو لەبەر ڕوخسارو شێوەی، یان لەبەر خوڕەوشتی، یان لەبەر کەمی دینی، یان لەبەر گەورەیی تەمەنی، یان لەبەر لاوازیو بێهێزی، یان لەبەر شتی دیکەی هاوشێوەی ئەو شتانە، وەلە گوناه دەترسا ، ئەوە بۆ ئافرەتەکە دروستە داوای (خلع) بکات، ئەویش بەوەی خۆی لە پیاوەکەی بکڕێتەوە بە پێدانی مارەییەکەی.

٢٩. (خلع) دروستە لە هەموو کاتێك لە کاتی خاوێنیو حەیز، (عیددە)ی ئەو ئافرەتەی ( خلع) کراوە یەك حەیزە.

❖ کۆڕای زانایەکان بۆ ئەوە ڕۆیشتوونە کە تەڵاقی بیدعی لە گەڵ حەڕام بوونی دەکەوێت، وەهەموو ئەحکامەکانی تەڵاق لەسەری بنیات دەنرێت.

«كتاب نيل المآرب»

٣٠. میراتی ئافرەتی تەڵاقدراو لە مێردەکەی پێش کۆتایی هاتنی (عیددە)ی:

- ئەگەر تەڵاقی رەجعی بێت: ئەو بڕەی کە شەرع بۆی دایناوە بە میرات دەیکەوێ.                    «الشيخ إبن باز»

- وە ئەگەر کاتی (عیددە)ەکەی بەسەر چووبێت، ئەوە هیچی بۆ نیە، هەروەها تەڵاقی بائینیش هیچی بۆ نیە.

«الشيخ إبن باز»

- بەڵام ئەو ئافرەتەی کە پیاوەکەی تەڵاقی دەدات لە نەخۆشی مردنی مەبەستی ئەوەی بێ بەشی بکات لە میرات، ئەوە میراتی لێ دەگرێ لە کاتی (عیددە)و دوای (عیددە)ش ئەگەر دووبارە مێرد نەکاتەوە، ئەگەرچی تەڵاقەکە (بائن)یش بێت، چونکە بە پێچەوانەی مەبەستی پیاوەکەی هەڵس و کەوتی لە گەڵ دەکرێت.

«الشيخ إبن باز»

٣١. سوێندی بە تەڵاق خوارد بۆ ئەوەی خۆی لە کردنی شتێك قەدەغە بکات، تەڵاقەکەی ناکەوێت و کەفارەتی سوێندەکەی لەسەرە، وەکو ئەوەی بڵێت: تەڵاقی لەسەر بێت ئەگەر مەی خواردەوە، وەئەگەر قسەی لە گەڵ فولان کرد یان لە چوونە دەرەوەی ماڵ قەدەغەی بکات. وە مەبەستەکەشی خۆی لە کردنی ئەو شتانە قەدەغە بکات، نەك تەڵاقەکەی بکەوێت

٣٢. ئاگەداری : ئەوەی شەرعی بێت بۆ موسڵمان بەکار نەهێنانی ئەو جۆرە شتانەیە، چونکە زۆر لە ئەهلی عیلمو زانایەکان پێیان وایە ئەم تەڵاقە دەکەوێت ئەگەر مەبەستی تەڵاقدانیش نەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٣. ئافرەتێك داوای تەڵاق بکات بەبێ هۆکار.

دروست نیە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت( أيما امراة سألت زوجها الطلاق من غير ما بأس، فحرام عليها رائحة الجنة) هەر ئافرەتێك بە بێ هۆکارێك داوای تەڵاق لە پیاوەکەی بکات، بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرمە. رواه أبو داود والترمذي.

«اللجنة الدائمة»

٣٤. دانایی(حکمە) لەوەی کە تەڵاق بە دەستی پیاوە:

– هێزی عەقڵو ویستەکەی، دوور بینی بە سەرەنجامی کارەکان زیاترە بە پێچەوانەی ئافرەت.

– هەڵسانی بە خەرجی کردن، خاوەن دەسەڵاتە، خاوەن فرمانو قەدەغەیە لەماڵەکەی خۆی.

– مارە بڕین واجبە لەسەر پیاو، بۆیە تەڵاق دراوەتە دەستی، بۆ ئەوەی ئافرەت تووشی تەماعیو جلێسی نەبێت، ئەگەر ئافرەتەکە شووی کردو مارە بڕینەکەی وەرگرت، مێردەکەی خۆی

تەڵاق دەدات، بۆ ئـەوەی مارەییـەکی‌تری بێتـە دەست ئـیتر بـەم شێوە، بەم شتەش زیان بە پیاو دەگەیەنێت.

«اللجنة الدائمة»

٣٥. حوکمی گوێڕایەڵ کردنـی دایـك لـە تـەڵاق دانـی خێزانەکـەی:
ئەگەر هاتوو ئەو ئافرەتەی کە دایکت فرمانی پێ کـردووی تـەڵاقی بدەی ڕێك‌و پێك بێت لەدینداریەکەی، ئەزیەتدەری دایکـت نـەبێت، ئـەوە واجـب نیـە تـەڵاقی بـدەی، وە ئەگـەر ڕێك‌وپێـك نـەبوو لـە دینداریەکـەی، یـان ئەزیـەتی دایکتـی دەدا، لەسـەری پێویـستە ئامۆژگاری بکات، ئەگـەر هـەر گوێڕایـەڵ نـەبوو، لەسـەرت واجبـە تەڵاقی بدەی.

«اللجنة الدائمة»

٣٦. ئەگـەر خێزانەکـەی خـۆی تـەڵاق بـدات لــە مــاڵی خــۆی دەمێنێتەوە لە ماوەی (عیددە)کەی.

- لەســەر ئافرەتەکــە واجبــە لــە ماڵەکـەی دابنیـشێت لــە لای پیاوەکـەی، وەلەسـەری حەڕامـە بـچێتە دەرەوە، هـەتاکو لـە نـاو (عیددە)کە بێـت.

«اللجنة الدائمة»

٢٧. بـۆ پیاوەکـە حەڕامـە لـە ماڵـەوە دەری بکـات هـەتاکو (عیددە)کەی تەواو بێت، مەگەر کاتێك دەم پیس و هەراش بێت لـە گەڵ کەس و کاری پیاوەکە.

«اللجنة الدائمة»

٢٨. بەڵام ئەگەر پیاو خێزانەکەی تەڵاق بدات بە تەڵاقدانێکی بائن ، وەکو ئەوەی تەڵاقی بدات پێش جووت بوون لە گـەڵی یـان دوای جووت بوون بەڵام لە بری تەڵاقەکە شتێکی دابێت (واتـای ئەوەیە (خلـع) کرابێـت بـە زاراوەی تـەڵاق ، لـەبری تەڵاقدانەکـەش شـتێك وەرگیرا بێت لە لایەن پیاوەکە یـان ژنەکـە چـونکە خلـع لـە لایـەن هەردووکیان دەکریّ داوا بکرێـت) ، ئـەوە ئافرەتەکـەی لێ دەبێتـە بێگانە، ئەوە بۆی دروسـت نابێـت مەگـەر بـە گرێبەسـت و مـارەیی نویێ، بە ڕەزامەندی خۆشی.

«اللجنة الدائمة»

٢٩. ئایا دروستە تەڵاق بەدەستی ئافرەت بێت.

– ئەصـل وایـە تـەڵاق بەدەسـتی پیـاو بێـت بـەڵام ئەگـەر پیـاو خێزانەکەی کردە وەکیل لە تەڵاق دانی خۆی پاشـان خـۆی تـەڵاق دا، تەڵاقەکەی کەوتووە.

«اللجنة الدائمة»

بەلآم ئەگەر پیاو دەسەلآتو پشتگیریەکەیدا دەست ئافرەتەکەو کردیانە مەرجێك لە گرێبەستەکەیان هەر کاتێك ئافرەتەکە ویستی خۆی تەلآق بدات، ئەو مەرجە بەتاڵە، چونکە پێچەوانەی پێویستیەکانی گرێبەستەکەیە.

«اللجنة الدائمة»

٤٠. تەلآقدانی ئەو ئافرەتەی کە نوێژ ناکات.

ئەگەر ئامۆژگاری کراو نوێژی نەکرد، واجبە تەلآقی بدات چونکە کافرە.

«اللجنة الدائمة»

٤١. حوکمی ئەو ئافرەتەی کە داوا لە هاوسەرەکەی دەکات کە تەلآقی بدات لەبەر ژن بەسەر هێنانی.

ئامۆژگاری ئافرەتەکە دەکەین لە خوا بترسیو خۆڕاگر بێتو داوای تەلآق نەکات، خوا لە دوا ڕۆژ دەرگای خێری لێ دەکاتەوە، ڕزگاری دەکات، هەروەك خوا فەرموویەتی ( ومن يتق الله يجعل له مخرجا) هەر کەسێك لە خوا بترسێ خوای گەورە لە ناخۆشیەکان دەرگای خۆشی بۆ دەکاتەوە)

«الشيخ إبن باز»

٤٢. ئەگەر ئافرەتەکە تەڵاق درا (عیددە)کەی لەسەر واجب دەبێت دوای تەڵاقەکە، ئەگەر چی ماوەیەکی دوورو درێژ دوور بوو بێت لە پیاوەکەی. «الشیخ إبن باز»

٤٣. ئەگەر پیاو ئافرەتەکەی یەك جار تەڵاق دا

لە میانەی (عیددە)کەی تەڵاقی دووەمیشی دا، ئەوە ئافرەتەکەی لێ حەڕام دەبێت بە کۆتایی هاتنی (عیددە)ی تەڵاقی یەکەم.

«اللجنة الدائمة»

٤٤. ئافرەتەکە مەرجی تەڵاقدانی هەوێیەکەی دابنێ.

دروست نیەو نابێت ئەم مەرجە جێ بەجێ بکرێت، ئەویش تەڵاقدانی ئافرەتی یەکەمیەتی، چونکە مەرجێکی بەتاڵو خەراپە، وە بۆت هەیە خێزانەکەت بگەڕێنیەوە، ئەگەر تەڵاقەکە ڕەجعی بێت، مادەم هەر لە (عیددەی)ی خۆی بێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ( لا تسأل المرأة طلاق أختها لتكفىء مافي إنائها) رواه البخاري.

واتە هیچ ئافرەتێك داوای تەڵاقدانی خوشکەکەی نەکات، بۆ بەتاڵ کردنی جامی خوشکەکەی بۆ ناو جامی خۆی. ( مەبەستەکەی ئەوەیە: ئافرەتێك داوای تەڵاق دانی خێزانی پیاوێك بکات، بەو تەڵاق دانە ژنە نوێیەکە شوێنی ژنە تەڵاقدراوەکە بگرێتەوە لە خەرجیو پێکەوەژیانو شتی تریش) «اللجنة الدائمة»

# ﴿ ئافرەت و عیددە ﴾

### ❖ (١٧) وەڵامی تێدایە.

١. ئەو ماوەیە کە ئافرەت تێدا چاوەڕوان دەکات، دوای مردنی مێردەکەی یان جیا بوونەوە لێی ، لەو ماوە هاوسەرگیری لێ قەدەغەیە، گرتنی ئەو عیددەیە واجبە.

٢. دانایی و زانایی لە شەرعیەتی.

- دڵنیا بوون لە بەتاڵ بوونی ڕەحمی لە منداڵ.

- بوار ڕەخساندنێك بۆ هەردوو هاوسەرەکە بۆ دووبارە کردنەوەی ژیانی هاوسەری.

- ڕێز گرتن لە پێکەوە ژیانی هاوسەری.

٣. ئەو ئافرەتەی ( کە جیماعی لە گەڵ نەکراوە) ئەگەر تەڵاقدرا، هیچ (عیددە) یەکی بۆ نیە.

٤. ئەو ئافرەتەی کە جیماعی لە گەڵ نەکراوە ئەگەر هاوسەرەکەی مرد (عیددە)کەی چوار مانگ و دە ڕۆژە، وەکو دڵسۆزیەك بۆ پیاوەکەی.

### ❖ ئەو ئافرەتانەی کە (عیددە)یان هەیە شەش جۆرن.

٥. جۆری یەکەم: سك پڕ بوو (دووگیان) (عیددە)کەی لە مردنی هاوسەرەکەی یان لە تەڵاقدانەکەی دانانی سکەکەیەتی.

«اللجنة الدائمة»

٦.جۆری دووەم: ئەوەی پیاوەکەی لێ مردووە سکی پڕ نیە، ئەوە (عیددە)کەی چوار مانگو دە ڕۆژە لە کاتی مردنی پیاوەکەی.

«اللجنة الدائمة»

٧.جۆری سێیەم: ئەو ئافرەتەی کە حەیزدارە (عیددە)ەکەی لە تەڵاقدانەکەی‌و هەڵوەشانەوەی نیکاحەکەی( فسخ)، سێ (قروء)ەە واتە سێ حەیزو سێ پاکبوونەوەیە.

«اللجنة الدائمة»

٨.جۆری چوارەم: ئەو ئافرەتەی کە تووشی حەیز نابێت لەبەر گچکەیی یان لەبەر گەورەیی، ئەوە (عیددە)کەی سێ مانگە، هەروەها ئەوەی خوێنچرکەی نەخۆشی هەیە (الأستحاضة) هەمان شتە.

«اللجنة الدائمة»

٩. جۆری پێنچەم: ئەوەی بەردەوام حەیزدارەو نازانێت هۆکارەکەشی چی‌یە، (عیددەی) ئەوانە یەك ساڵە، لەبەر فەرموودەی شافیعی" ئەوە قەزای ئیمام عمر (رضي الله عنه) لە نێوان کۆچکەرەکان‌و(المهاجرین) سەرخەرەکان (الأنصار)، نەمانزانیوە کەسێك لەوان نکوڵی لەم کارەی کرد بێت.

«اللجنة الدائمة»

١٠. جۆری شەشەم: ئەو ئافرەتەی هی یەکێك بێت بێ سەرو شوێنو بزربوو بێت، دوای چاوەڕوان کردنی چوار مانگو دە ڕۆژ، (عیددە)ی دەگرێت، وەکو ئەوەی پیاوی مردووە.

«اللجنة الدائمة»

١١. چ کاتێك (عیددە)ی تەڵاق دەست پێدەکات

(عیددە)کە دەست پێدەکات لەکاتی دەرچوونی تەڵاق لەلایەن پیاوەکە نەك لە گەیشتنی کاغەزی تەڵاق.

«اللجنة الدائمة»

## ❖ خەرجی ئەو ئافرەتانەی کە (عیددە)یان هەیە

١٢. ئەو ئافرەتەی کە تەڵاق دراوە بە تەڵاقدانێکی ڕەجعی، جا چ سك پڕ بێت یان نا، ئەوە شوێنی نیشتەجێ بوونو خەرجیو جلو بەرگ کردنیشی بۆ هەیە، چونکە هاوسەریەتی .

١٣. ئەگەر تەڵاقەکەی بائن بێتو سك پڕیش بێت، ئەوە وەکو خێزانی دادەنرێت لە خەرجی کردنی لە کاتی سك پڕیەکەی.

١٤. وە ئەگەر هاتوو سك پڕ نەبێت ئەوە هیچ خەرجیو شوێنی نیشتەجێ بوونی بۆ نیە.

١٥. ئافرەتی یاخی بووی (ناشز) سك پڕ. وەکو ئافرەتی یاخی نەبوو وایە ،چونکە خەرجیەکە بۆ سکەکەیەتی، بە یاخی بوونی دایکی منداڵەکە خەرجیەکە لە سەر منداڵەکە لا نا چێت.

١٦. ئەو ئافرەتە سك پڕەی کە پیاوەکەی وەفاتی کردوە:
ئەوە وەکو خێزانی دادەنرێت لە خەرجیو جلوبەرگو نیشتەجێ بوونی، خەرجیەکەی بۆ دەدرێت لەبەشی میراتی منداڵەکەی، ئەگەر هاتوو میراتی هەبوو، خەرجیەکەی لەسەر کەسانیتر واجب نابێت، چونکە کۆرپەڵەکە هەبووەو هەیەتی، بەلآم ئەگەر میراتی نەبوو، خەرجیەکەی لە سەر میراتگرە نزیکەکانی کۆرپەڵەکە واجب دەبێت، بەلآم ئەگەر ئافرەتەکە سکی نەبوو، ئەوە نە خەرجی نە شوێنی نیشتەجێی بۆ هەیە.

١٧. عیددەی ئەو کەسەی بە گومان جیماعی لە گەڵ کراوە یان ئەو کەسەی زینای لە گەڵ کراوە، یان عیددەی ئەو کەسەی کە لە ئەنجامی هاوسەرگیریەکی بەتاڵ لە گەڵی جووت بووینە، عیددەی ئەوانە وەکو ئافرەتی تەلآقدراوە جا چ مێردی کردبێت یان نەیکردبێت.

# ﴿ ئافرەتو منداڵ ﴾

### ❖ (٩١) وەڵامی تێدایە.

١. کچ ڕق لێبوونەوە: لە خەسڵەتەکانی نەفامیيە، جۆرێك لە ناڕەزایی دەر بڕینی تێدایە لەسەر قەزاو قەدەری خوا، وە مرۆڤ نازانێت لەوانەیە کچ بۆی باشتر بێت لە چەندەها منداڵی کوڕ.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢. منداڵ تکا دەکات بۆ دایكو باوکی.

٣. کردەوەی باشی منداڵ

ئەگەر منداڵەکە بمرێت تکا بۆ دایكو باوکی دەکات، پاداشتی کردەوەکانیشی بۆ خۆیەتی، بۆ دایكو باوكو کەسیتر نیە، بەڵام دایكو باوکی پاداشت دەکرێن لەسەر فێرکردنی منداڵەکەو ڕێنمایی کردنی بۆ چاکە.

«اللجنة الدائمة»

٤. ئاهەنگ گێران بە بۆنەی جەژنی لە دایك بوونی منداڵ.

بە پێی شەرع ئامادە بوون لەوێ دروست نیە، وە هاندانی کەسو کاری منداڵەکەو پیرۆزبایی لێ کردنی یان، یان شتی دیکەی لەو

بابەتە دروست نیە، چونکە ئەم شتانە یارمەتی دان‌و دان پێنانی ئەم خەراپەیەی تێدایە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥. پاراستنی وێنەی منداڵان

دروست نیە، ئەگەرچی هەڵنەواسرێت لەسەر دیوار، مەگەر ئەوەندەی کە کاری پێویست دەیخوازێت ( لە جەواز سەفەرو شتی دیکەش)

«اللجنة الدائمة»

٦.هەڵواسینی نوشتە بە منداڵ.

بۆ دوور خستنی لە چاووزارو جنۆکەو نەخۆشی دروست نیە، هەندێکیان پێی دەڵێن کۆ کەرەوە ( الجامعة) ، وە هەندێکیان دەڵێن پاڕاستن (الحرز) ، وە هەندێکیان پێی دەڵێن پارێزگاری (الحماية)

«الشيخ إبن باز»

٧.کاتی ناونان لە منداڵ.

فراوانی تێدایە، ئەگەر ناوی لێنا لە ڕۆژی لە دایکبوونی، یان لە ڕۆژی حەوتەم ئەوە بێ گومان دروستە، بەڵگەمان بۆ هاتووە لەم بارەوە.

«اللجنة الدائمة»

٨.ناو لێنان مافی باوکە

بەڵام سوننەتە ڕاوێژی دایکیشی بکرێت بۆ دڵنیا بوونی دەروونەکانو کۆ بوونەوەی دڵەکان.

«الشيخ إبن باز»

٩. دروست نیە لە ناو لێنان

بەندایەتی بۆ جگە لە خوا بەکار بێت وەکو عبد النبي، عبدالرسولو شتیتری هاوشێوەی.

«الشيخ إبن باز»

١٠. ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی ناو لێنانی کۆرپەلە.

لە ڕێو شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) نەبووە، لەسەردەمی هاوەڵەکانیش شتی وا ڕووی نەداوە.

١١. ئەوەی بیکات وەکو خۆشیو شادی دەربڕینێکو لەبەر خاتری نان خواردنی هۆزەبانە، مەبەستەکەی لێ جێ بەجێ کردنی سوننەت بێتو دابو نەریت نەبێت، ئەوە هیچی تێدا نیە.

«اللجنة الدائمة»

١٢. گچکە کردنەوەی ئەو ناوانەی ووشەی عەبدی تێدایە یان وەرگێڕانی وەکو (عبید، عبود، رحیم ، عزیز، عزوز...)

١٣. هیچی تێدا نیە، نەمزانیوە یەکێك لە زانایەکان قەدەغەی کرد بێت، وە زۆرێك لەو ناوانە لە فەرموودەدا هاتوونە.

١٤. ئاگەداری: بەلام ئەگەر ئەو کارەی کرد لە گەڵ ئەو کەسەی پێی ناخۆشە، ئەوە دیارە حەرام دەبێت گچکەی بکاتەوە، چونکە دەچێتە ژێر قالبی ناوو ناوتۆرەو بە سوك ناو هێنانی ناوی خەڵکی، کە خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەی قەدەغەی کردوە، مەگەر بەو ناوو ناوتۆرە بناسرێتەوە، ئەوە هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن باز»

١٥. گۆڕینی ناوەکان لەبەر خاتری نەگونجانی لە گەڵ بورجی هەڵهاتوو.

١٦. دروست نیە سەیری ئەو بورجە هەڵاتووانە بکەی، بەڵکو ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی هەواڵ دان بە غەیب (الكهانـه)، وە گۆڕینی ناوەکان لەبەر ئەو مەبەستە دروست نیە، لەبەر ئەوەی باوەڕ هێنانی بەو کاهینانە تێدایە.

«اللجنة الدائمة»

١٧. ناو نان بە ناوەکانی خوا وەکو (کریم، عزیز) ناوی دیکەی هاوشێوە.

١٨. ئەگەر (الـ)ی پێوە بێت لەم حاڵەتە ئەوە بۆ جگە لە خوای گەورە بەکار نایەت، وەکو (العزیز) ئەوە بۆ جگە لە خوا بەکار نایەت.

١٩. ئەگـەر ناوەکـەی لێبنرێـت بـەبێ (الـ) وەمەبەسـتی لێـی سیفەتەکە نـەبێت ،ئـەوە هیـچی تێـدا نیـە، وەکـو حکیم ، نـاوی یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ)(حکیم بن حزام) بوو.

«الشیخ إبن عثیمین»

٢٠. ناو نان بە ناوەکانی هەندێك لە ئایەتە قورئانیەکان.

هیچی تێدا نیە، ئەو شتانە دروستکراوی خـوان، (الآء) بەخشـشە ،وە (أفنان) لقی دارە.

«الشیخ إبن باز»

٢١. ئەو ناوانەش ( هـدی، حمـد، برکـة،إیمـان) گونـاهی تێـدا نیـە وەکو صالح، سعید.

«الشیخ إبن باز»

٢٢. خۆشەویسترین ناو لە لای خوا (عبـدالله و عبـدالرحمن)ە رواه مسلم.

٢٣. (قژ تراشینی منداڵی کوڕ) سوننەتە لە کاتی ناو لێنانی بێـت لە ڕۆژی حەوتەم، بەڵام منداڵی کچ قژی ناتراشرێت.

«الشیخ إبن باز»

٢٤. هۆزەبانەی منداڵبوون سوننەتێکی (مؤکدة)یە

ئەویش قوربانی سەر برینە بۆ نزیك بوونت لە خـوای پـەروەردگار، وەکـو سوپاسـگوازارییێك لەسـەر بەخشـشی منـداڵبوون لـە ڕۆژی حەوتەمی لە دایك بوونی، بۆ کوڕ دوو بەرخەو بۆ کچ یەکێکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٥. ئەوەی توانای هۆزەبانەی نەبێت لەسەری لادەچێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٦. چاکتر وایە بۆ هۆزەبانە کردنەکە.

لە ڕۆژی (٧) حەوتەم بێت ئەگـەر فـەوتاو نـەکرا ، لـە چـواردەمین ڕۆژ بێـت ئەگـەر فـەوتا نـەکرا، لـە بیـستو یەکـەمین ڕۆژی منداڵبوونەکە بێت، چاکتر وایە بەم شێوە بکرێت، بەڵام ئەگەر هەر نەکرا، ئەوە هەر ڕۆژێك بۆی بکرێت ئاساییەو هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٧. هۆزەبانەی ئەو کۆرپەڵەی لەبەر دەچێت.

ڕای ڕاسترو دروستر ئەوەیە کۆرپەڵە ئەگەر لە دایك بوو دوای چوار مانگ، ئەوە حوکمەی وەکو کۆرپەڵەی زیندووە، چونکە کاتێك چوار مانگ تەواو دەکات روحی تێدا فوو دەکرێت، پاشان ئەگەر لەبەر چوو، ئەوە دەشوردرێـتو کفن دەکرێتو نوێژی لەسەر دەکرێتو لە قەبرەستانی موسڵمانان دەشاردرێتەوەو ناوی لێ دەنرێتو هۆزەبانەشی بۆ دەکرێـت. «الشيخ إبن عثيمين»

– ئەگەر لەبەری چوو بێت پێش ڕوحی تێدا فوو کرا بێت، ئەوە هۆزەبانەی لەسەر نیە، ئەگەر چی دیاریش بێت نێرە یان مێیە.

«اللجنة الدائمة»

٢٨. – ئەگەر منداڵەکە بە زیندویی لە دایك بوو، مرد پێش ئەوەی بگاتە ڕۆژی حەوتەم، سوننەتە هۆزەبانەی بۆ بکرێت لە ڕۆژ حەوتەم، وە بۆی دروستە هۆزەبانەی بۆ بکات ئەگەرچی دوای مانگێك بێت یان ساڵێك یان زیاتر، لە کاتی لە دایك بوونی بەپێی ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) جێگیر بووە.

«اللجنة الدائمة»

٢٩. ڕێ نموونیو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) وا بووە بۆ کوڕ دوو بەرخ بێت ئەگەر یەکێکیش بێت بەسە،– إن شاء الله– وە هەروەها دروستە لێکیان جیا بکاتەوە، یەکەمیان دوای هەفتەیەكو ئەویتر دوای دوو هەفتە بێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٣٠. ئەگەر باپیری یان برایەکەی یان کەسی دیکە قوربانیەکەی سەر ببڕێت بۆ منداڵەکە لە جیاتی باوکی دروستە، مەرج نیە باوکی بێت، یان هەندێکیان کەمێك پارەکەی بۆ بدەن.

«الشيخ إبن جبرين».

٣١. سوننەت وایە سێیەکی بکرێتە خواردن و سێیەکی بکرێتە دیاری لەسەر هاوەڵەکانی‌و سێیەکی بکرێتە خێرو صەدەقە لەسەر موسڵمانان.

«الشيخ إبن جبرين»

٣٢. دروستە دۆست‌و برادەرەکانی‌و خزمە نزیکەکانی بانگێش بکات، یان هەمووی بکاتە خێرو صەدەقە.

«الشيخ إبن جبرين»

٣٣. میزی کوڕی کۆرپەڵە: ئەوەی شیری دەرخوارد دەدرێت پیسیەکەی سوکە، بۆ پاکبوونەوەی لێکردنی ئاوو بڕژاندنی بەسە بەبێ هەڵکڕانی جلەکە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٤. ئایا دەستنوێژی یەکێك دەشکێت ئەوەی پیسایی کۆرپەڵەکە پاك دەکاتەوە؟

دەستنوێژ ناشکێنێت مەگەر کاتێك کە عەورەتی منداڵەکە بگرێت.

«اللجنة الدائمة»

٣٥. دەست لێدانی جلە تەڕەکانی منداڵ، ئەوەی بە میز تەڕ بووە، دەستنوێژ ناشکێنێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٦. میزی کچ: میزەکەی هەر دەبێ بشورێت.

٣٧. ئەگەر ئافرەت کوڕە یان کچە کۆرپەلەکەی خاوێن کردەوەو دەستی لە عەورەتی‌دا، ئەوە دەستنوێژ شوشتنەوەی لەسەر واجب دەبێت، ئەوەش بەڕای زۆرینەی زانایەکان (جمهور)

«اللجنة الدائمة»

❖ ڕای دیکەش هەیە دەڵێ دەستنوێژ ناشکێنێت

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٨. دەستی لە منداڵێك دا تەڕایەتی‌یەکی پیسی هەبوو، وە شوێنەواری ئەو تەڕایەتی‌یەی بینی، ئەو جێگایەی کە تەڕیەکەی بەرکەوتووە لە لەش‌و جل‌وبەرگ‌و شوێن دەشوات، ئەگەر کچ بوو یان کوڕی نان خۆر بوو ، وە ئەگەر کوڕ بوو خواردنی نەدەخوار (شیری دەخوارد) ئەوە تەنها ئاو دەپرژێنێتە شوێنی پیسیەکە.

٣٩. بەڵام ئەگەر هیچ تەڕیەك بەدی نەدەکرا، ئەصل وایە لەش‌و شوێنەکە پاك‌و خاوێنە.

«اللجنة الدائمة»

٤٠. خەتەنە کردن دەرهەق بە پیاو واجبە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤١. خەتەنە کردنی دەرهەق بە کچ سوننەتە، واجب نیە.

«الشيخ إبن باز»

٤٢. كاتی خەتەنە كردن ئاسانكاریو فراوانی تێدایە، تەماشای بەرژەوندی كۆرپەڵەكە دەكرێت.

«اللجنة الدائمة»

٤٣. ئاهەنگ گێران لە بۆ خەتەنە كردن: داهێنانێكی نوێیە (بدعة).

٤٤. منداڵو دەست لێدانی قورئان، دووبەرەكی تێدایە لە نێوان زانایان

– حەرام نیە لەسەر یەكێك نەگەیشتووتە تەمەنی هەرزەكاری دەست لە قورئان بدات، چونكە ئەركبار (مكلف) نیە.

– وەهەندێكیان دەڵێن هەتا بۆ منداڵیش دروست نیە دەست لە قورئان بدات بەبێ دەستنوێژ، دەكرێت دەست لە قورئان بدە لە دوای پەردە یان بەربەست، ئەو جۆرە دەست لێدانە بۆ خاوەن دەستنوێژو بەبێ دەستنوێژیش دروستە، وە ئەوە دڵنیاترو چاكترە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٥. دروستە بۆ منداڵ دەست لە تابلۆیەك یان تەختە ڕەشێك بدات، كە ئایەتەكانی تێدا نووسراوە لە شوێنێكی بەتاڵ لە نووسین، واتە بە مەرجێك دەستی نەكەوێتە سەر پیتەكان.

«الشيخ إبن عثيمين»

٤٦. حوکمی ئەو ئافرەتە چیە مندالەکانی دەباتە مزگەوت؟

مندالبردنە مزگەوت درێژەی تێدایە.

- ئەگەر گەیشت بێتە تەمەنی حەوت سالان : ئەوە دەبرێنە مزگەوت لەبەر ئەوەی تا لەسەر نوێژ کردن پەروەردە بکرێن.

- وە ئەگەر لە تەمەنی خوارووی حەوت سالان بوون، ئەوە نابرێنە مزگەوت، مەگەر کاتێك دلنیا بێت کە ئەزیەتی نوێژکەرەکان نادەن و خەراپەکاری لە مزگەوت ناکەن، یان پیسی ناکەن ئەگەر دەیتوانی کۆنترۆلیان بکە، وە پێویستیش بووبێت بهێنرێنە مزگەوت، وەکو ئەوەی مەترسی لێیان هەبێت ئەگەر لە مال بمێنێنەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

٤٧. سوننەتە ئەو مندالانەی گەیشتوونەتە حەوت سالان یان زیاتر دوای پێش نوێژ خوێن ( إمام) بوەستێن، وەکو پێگەیشتووەکان (بالغەکان) بەلام ئەگەر یەك کەس هەبێت ئەوە لای دەستە ڕاستی دەوەستێت.

«اللجنة الدائمة»

٤٨. پێش نوێژی ئەو مندالەی کە ژیرو هۆشیارە، دروستە.

«اللجنة الدائمة»

٤٩. ئـيش كـردن‌و بـەڕێوەبردنی مـاڵی هـەتیو، دروسـتە بـۆ سەرپەرشتكاری هەتیو ، پارەكە بەشێوەیەك ئیش پـێ بكات‌و بەڕێوەی ببات كە زیادی بكات، ئەو شتەی پـێ بكات كە لە بەرژەوەندی ئەوان دابێت. بەڵام ئەگەر بە شێوەیەك كاری پـێ كردو بەڕێوەی برد كە كەمی بكات، یان زیانی پێ بگەیەنێت ئەوە دروست نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٠. حەجی منداڵ: سوننەتەو خێرو پاداشت وەردەگرێت، بەڵام جێگای حەجی ئیسلام ناكرێتەوە (حەجی واجب)

«الشيخ إبن باز»

٥١. نیەتی منداڵ لە ئیحرام ئەگەر هاتوو خوارووی حەوت ساڵ بێت. هیچ نیەتی بۆ نیە، بەڵكو سەرپەرشتكارەكەی نیەتی بۆ دێنێت، كـاری حـەج پـێ كردنـی دەخاتـە ئەسـتۆی خۆی،جـا سەرپەرشتكارەكە دایكی بێت یان باوكی یان كەسی دیكە بێت جگە لە ئەوان.

«الشيخ إبن باز»

٥٢. بەڵام ئەگەر منداڵەكە گەیشتبێتە تەمەنی حەوت ساڵی یان زیاتر. ئەوە سەرپەرشتكارەكەی نیەت‌و شتی دیكەی فێر دەكات.

٥٣. تەوافەکە دروستە بە نیەتی هەڵگرو هەڵگیراو بکرێت، ئەگەر هاتوو باشەو خەراپەی جیا دەکردەوە.

«اللجنة الدائمة»

٥٤. ئیحرام پێ کردنی منداڵ:

دروستە، سەرپەرشتکارەکەی لێی بەرپرسیارە، جلوبەرگەکانی لەبەر دەکاتو ئیحرامەکەی بۆ دەبەستێت، لە جیاتی ئەو نیەتی (مناسك الحج) دێنێتو تەلبیە دەکات، وە دەستی دەگرێت لە تەوافوسەعی کردندا، ئەگەر هاتوو بێ توانا بوو (وەکو ئەوەی گچکە بێت یان شیرە خۆرە بێت) هیچی تێدا نیە هەڵیبگرێت، وەیەك تەواف بەسە بۆ هەڵگرو هەڵگیراو، لەسەر رای دروستی زانایەکان، ئەگەر منداڵەکە شتێکی قەدەغە کراوی کرد بە نەزانی (وەکو لەبەر کردنی شتێك یان سەرداپۆشینێك)، ئەوە هیچ فیدیەی لەسەر نیە لەبەر مەبەست نەبوونی، ئەگەر بە ئەنقەست بوو، وەکو ئەوەی پێویستی بە جلوبەرگ بووبێت لە بەر ساردی یان شتی دیکە، ئەوە سەرپەرشتکارەکەی فیدیەی بۆ دەدات.

«الشيخ إبن جبرين»

٥٥. حەفازە بۆ منداڵ ئەویش لە ئیحرام: بە حوکمی درووین دانانرێت، دروستە لەبەری بکات.

«الشيخ عبد العزيز آل الشيخ»

٥٦. مردنـی کـچە کۆرپەڵـە شـیرە خۆرەکـەی بـە نووسـتوویی لـە تەنیشت دایکە ماندووەکەی.

– لەبەر ئەوەی نەیزانیوە هۆی مردنـی کـچە کۆرپەڵەکـەی چییە، ئەوە هیچی لەسەر نیە، چونکە مرۆڤ لەوانەیە لـە کـاتی نووسـتنی دەمرێت، بێ تاوانیو پاك بوونی ئەستۆی دایکی ئەوە ئەصلە.

هـیچ شـتێك ناخرێتـە ئەسـتۆی هـەتاکو دڵنیـا نـەبین لـە هۆکـاری ڕووداوەکە.

– بـەڵام ئەگـەر هـاتوو زێـدەرەوی کـرد بێـت لـە داپۆشـینی کۆرپەڵەکەی بە پۆشاکێکی ئەستور دەزانرا دەکوژرێت، ئـەوە بـێ گومان لەو کاتەدا قەرزداری خوێنبایەکەیەتی بـۆ میراتگرانـی کـچە کۆرپەڵەکـە، وە کفرانەکـەی (کفارەتەکـەی) بـە ڕۆژوو بـوونی دوو مانگی لەسەر یەکترە، ئەگەر بەندەی نەبوو ئازادی بکات.

«الشیخ إبن عثیمین»

٥٧. بەسـەر منداڵـە کـچکەکەدا ڕۆیـشت تـا پلیـشانیەوە (پـانی کردەوە) هەتاکو مرد.

– ئەگەر منداڵەکە خـۆی، خـۆی فرێدە بـەردەم ئوتومبێلەکـە لـە کاتێك کە باوکەکەی ڕۆیشتنێکی ئاسایی دەڕۆیشتو نەیـدەتوانی ئۆتۆمبێلکـە بوەسـتێنێت، ئـەوە هـیچ نیـە لەسـەر بـاوکی نـە خوێنبایی، نە کفرانە دان.

- وە ئەگەر هاتوو کارەکە لە هەڵس و کەوتی باوکەکە بوو بێت ،لە کەمتەرخەمی کردنی لە پشکنین و تەماشا کردنی دەوربەری ئوتومبێلەکە، ئەوە خوێنبایی لەسەرەو کفرانەشی لەسەرە.

❖ خوێنبایییەکە بۆ میراتگرانە مەگەر لە مافی خۆیان چاوپۆشی بکەن.

جـ. بەڵام کفرانەشی لەسەرە ئەویش بەڕۆژوو بوونی دوو مانگی لەسەریەکترە، ئەگەر نەیتوانی بە هیچ شێوەیەك هیچی لەسەر نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥٨. ئافرەتێك بێ ئاگا بوو لە کۆرپەڵە کچەکەی، قۆری قاوەی بەسەر دا ڕشت و مرد.

ئەگەر ئافرەتەکە ئەوە لە سەر گومانی زاڵ بوو، کە کەمتەرخەمە لە واز هێنانی کچە منداڵەکەی هەتاکو ئەوەی بەسەری هات، وە دایکەکە هۆکاری ڕوودانی ئەم کارە بێت، ئەوە کفرانەی لەسەرە، کە ئازاد کردنی بەندەیەکە، ئەگەر نەیتوانی ئەوە دوو مانگ لەسەر یەکتر بە ڕۆژوو دەبێت.

«اللجنة الدائمة»

٥٩. چاکە کردن لە گەڵ کچان: لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە ( من كانت لة إبنتان فأحسن إليهن كن لة سترا من النار)

واته ئەوەی دوو کچی هەبێتو لە گەڵیان چاکبووبێت، ئەوە بۆی دەبنە پەرژین لە ئاگر) ئەویش بە پەروەردەکردنیان دەبێت بە پەروەردەکردنێکی ئیسلامی، وە بە سوور بوونی دەبێت لەسەر پاراستنی دامێن پاکیانو دوور خستنیان لەو شتەی کە خوا حەرامی کردووە لە سفوریو خۆ دەرخستن، هەتاکو هەموویان لەسەر گوێرایەڵی کردنی خواو پێغەمبەرو (ﷺ) دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی یان، پەروەردە دەبنو رادێن، مەبەست لەچاکە کردن لە گەڵیان تەنها خواردنو خواردنەوەو جلوبەرگ ناگرێتەوە.

«الشيخ إبن باز»

٦٠. دادوەری کردن لەنێوان منداڵەکان.

واجبە لەسەر دایکو باوك لە حاڵەتی ژیانیان بەخششو خەڵات بدەنە منداڵەکانیان، بۆ کوران دوو هەندی کچان ، بەخششیش وەکو میراتە، چونکە ئەو کەسەی کە میراتەکەی بۆ داناون خوای گەورەیە کە (الحكم العدل)ە، وەنابێت هەندێك منداڵ بە چاکتر دابنرێتو تایبەتمەند بکرێن بە بەخششو خەڵات لەسەر هەندێکیتر.

«الشيخ إبن باز»

٦١. نابێت ئافرەت یەكێك لە مندالّە كوڕەكانی یان كچەكانی تایبەتمەند بكات بە شتێك جگە لە مندالّەكانی تر.

بەڵكو واجبە دادوەری بنوێنێت لە نێوانیان بە پێی میرات، یان واز لە هەموویان بێنێت، بەلاّم ئەگەر هەموویان ڕازی بوون بەوەی یەكێكیان تایبەتمەند بكات بە شتێك، ئەوە هیچ گوناهی تێدا نیە. ئەگەر هاتوو ڕازی بووەكان پێگەیشتوو، خاوەن عەقڵو ژیر بوون.

٦٢. بەلاّم ئەگەر یەكێك لە مندالّەكان توانای ئیش‌وكاری نەبوو لەبەر نەخۆشیەك یان لەبەر شتێكی دیكە. وەهیچ ڕاتبێكی لەدەوڵەت نەبوو، ئەوە لەسەرت پێویست دەبێت بە پێی پێویست خەرجی بكەی.

«الشیخ إبن باز»

٦٣. نەفرەت‌و جنێو بە مندالّەكانی دەدات.

نەفرەت كردنی مندالّەكان لە گوناهە گەورەكانە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ( لعن المؤمن كقتله) متفق علیه، واتە نەفرەت كردنی ئیماندار وەكو كوشتنی وایە، وەدروست نیە نەفرەت لە یەكێكی دیاری كراو بكەی جا چ مرۆڤ بێت یا حەیوان یان شتێكیتر بێت.

٦٤. واجبە لەسەر دایك:

أ. تەوبە بكات بۆ خوای گەورە بگەڕێتەوە.

ب. زمانی خۆی بپارێزێت لە جنێو دانی مندالّەكانی.

ت. وە زۆر دوعای ڕێنموونیو چاکبوونیان بۆ بکات.

«الشيخ إبن باز»

٦٥. دوعا لێ کردن لە منداڵەکانت.

❖ دروست نیە، لەوانەیە هاوکات بێت لەگەڵ کاتەکانی وەلامدانەوە. وەواجبە لەسەر ئافرەت

أ. خۆڕاگر بێت کاتێك تورە دەبێت.

ب. نابێت دەستبەجێ دوعا لە منداڵەکانی بکات.

ج. بۆی هەیە لێیان بداتو پەروەردەیان بکات، ئەوە چاکترو لە پێشترە لەوەی دوعای نەخۆشیو مردنیان لێ بکات.

«الشيخ إبن جبرين»

٦٦. منداڵی گچکە: ناشێتو دروست نیە ببێتە مەحرەم، چونکە لە مەرجەکانی مەحرەم ئەوەیە دەبێت پێگەیشتوو (بالغ) بێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٧. دیاری بردن بۆ منداڵی تازە لە دایك بوو یان بۆ دایکی.

هیچی تێدا نیە، ئەگەر دابو نەریت وا باو بوو، خەڵکێك ئەگەر منداڵی بوو کەسو کارە نزیکەکەی هەندێك پارەی بۆ بکەنە دیاری بەپێی ئەو دابو نەریتەی باوە نەك وەکو پەرستنێك ئەنجام بدرێت بۆ خوای پەروەردگار.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٨. بەند کردنی باڵندە بۆ ئاسودە کردنو خۆ خەریك کردنی منداڵ.

هیچ گوناهێکی تێدا نیە ئەگەر هەموو پێداویستیەکی بۆ دابنرێت لە خواردنوخواردنەوە، وەهیچ بەڵگەیەك نیە پێچەوانەی ئەمە بێت، بەپێی زانینی ئێمە.

«الشيخ إبن باز»

٦٩. ئەو یاریو گەمانەی کە وێنەی بووكو زاوایان تێدایە.

– ئەگەر هاتوو شێوەی دروستکردنەکەی بە تەواوی دیار نەبێتو وێنەکە تەواوو دیار نەبێت، ئەوە هیچ گومانێك نیە لە دروست بوونی، چونکە ئەوە لە ڕەگەزی ئەو بووکانەیە کە عائیشە(رضي الله عنها) گەمەی لە گەڵ دەکردن.

– بەڵام ئەگەر هاتوو شێوەی دروستکردنەکەی تەواو بێت، وەکو ئەوە بێت کە مرۆڤێك دەبینی، من شتێك لە دەروونم هەیە لە دروست بوونی، چونکە لەیەك چوونی تێدایە لە گەڵ دروست کراوەکانی خوا، ( بەڵام سوور نیم لە حەرام بوونەکەی، چونکە ئەوەی بۆ منداڵ ڕوخسەت دەدرێت بۆ گەورە ڕوخسەت نادرێت لەم جۆر شتانە).

«الشيخ إبن عثيمين»

- ڕایەکی تریش هەیە بۆ حەڕام بوونی ( وێنەی پەیکەردار لە گەمەو یاری منداڵ)

«الشيخ إبن جبرين»

٧٠. کونکردنی گوێچکەی منداڵو لووتەکەی لەبەر خاتری جوانی.

هیچی تێدا نیە، چونکە ئەوە لەو مەبەستانەیە کەپێی دەگەیە جوانی دروستو حەلال.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧١. دزی کرد بە منداڵیو بچوکی.

پێویستە لەسەری بیگەڕێنیەوە بۆ خاوەنەکەی بە هەر ڕێگایەك پێی بکات.

«الشيخ إبن باز»

٧٢. گۆرانی منداڵان

ئەگەر هاتوو مۆسیقای لە گەڵ بێت دروست نیە جا چ دینی بێت یان نیشتمانی بێت جیاوازی نیە.

«اللجنة الدائمة»

٧٣. سوێند دەخوات لەسەر منداڵەکانی ئەوانیش وەلامی نادەنەوە:

ئەگەر مەبەستی لە سوێندەکە ئەوە بووبێت شتێك بکەن یان نەیکەن، ئەوانیش پێچەوانەیان کرد، ئەوە کفرانەی سوێندەکەی دەکەوێتە سەر.

٧٤. لەبەر کردنی شتێك کە وێنەی تێدا بێت.

دروست نیە، جا چ لە جلو بەرگی منداڵە بچووکەکان بێت یان لە جلو بەرگی گەورەکان، وە وێنە هەبوونو هەڵگرتنی بۆ یادگاریو شتیتر دروست نیە، مەگەر ئەوەندەی پێویستی دەیخوازێت وەکو کارتو (بطاقة) جەواز سەفەرو شتیتریش.

«الشیخ إبن عثیمین»

٧٥. لەبەر کردنی شتی کورتو تەسك بۆ منداڵە بچووکەکان.

نابێت مرۆڤ ئەو جۆرە جلوبەرگانە لەبەر بکات کاتێك کە بچووکە، چونکە ئەگەر ڕاهات، لەسەر ئەم جلو بەرگانە دەمینێتەوە، کارەکەی لا سوکو ئاسان دەبێت، بەڵام ئەگەر هاتوو لە بچووکیەوە لە سەر خۆداپۆشینو پۆشتە بوون ڕا هێنرا، لەسەر ئەم حاڵەتە دەمینێتەوە لە گەورە بوونی.

«الشیخ إبن عثیمین»

٧٦. نوێژکردنی کچی بچووك بەبێ چەفیە.

– ئەگەر بەبێ چەفیە نوێژی کرد، نوێژەکەی دروستە لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (لا یقبل الله صلاة حائض إلا بخمار)

رواه أبو داود والترمذي. واتە خوای گەورە نوێژی هیچ حەیزدارێك گیرا ناكات مەگەر بە چەفیە نەبێت ( مەبەستی ئەو ئافرەتەیە كە بالغ بووەوگەیشتووتە كاتی حەیز)

❖ وە چاكتر وایە بە چەفیە نوێژ بكات.

«اللجنة الدائمة»

٧٧. كچ و بالاپۆشی.

ئەگەر كچ گەیشتە ئاستێك كە ئارەزوو دەوروونی پیاوەكانی بۆ دەچوو، ئەوە پالا دەپۆشی بۆ نەهێشتن و لابردنی ئاشوب وو شەڕو گرفت، ئەوەش دەگۆڕێت بە گۆڕینی ئافرەت، هەی ئاوایان تێدایە زوو پێ دەگات و گەنج دەبێت، هی ئاواشی تێدایە بە پێچەوانەیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٧٨. تێكەڵی لە قوتابخانەكان.

هۆكارێكی گەورەی شەڕو خەراپەكارییە، دروست نیە بكرێت. پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی كردووە كە جیا بكرێنەوە لەسەر جێگا، چونكە نزیكبوونەوەی یەكێكیان لەوەیتر لە تەمەنی دە ساڵی و دوای دە ساڵیش، هۆكارێكە بۆ ڕوودانی كاری خەراپ بە هۆی تێكەڵ بوونیان.

«الشيخ إبن باز»

٧٩. ترسناکی فێرکردنی ئافرەت بۆ منداڵەکان لە قۆناغی سەرەتایی، چونکە بۆ تێکەڵی سەردەکێشێت، پاشان درێژە دەکێشێت بۆ قۆناغەکانیتر، چونکە کوڕ ئەگەر گەیشتە دە ساڵ بە هەرزەکار دادەنرێت و بە سروشتی خۆی دڵی بۆ لای ئافرەت دەچێت. چونکە هی وەکو ئەو دەتوانێت ژن بێنێت، ئەو کارەی پیاو دەکات ئەویش بیکات.

«الشیخ إبن باز»

٨٠. هەڵسانەوەی کچە قوتابییەکان یان قوتابیەکان بۆ مامۆستا دروست نیەو شتێکە نابێت بکرێت، کەمترین شت کە تێیدا بێت زۆر نا پەسندە.

«الشیخ إبن باز»

٨١. تەلەفزیۆن و شوێنەوارەکەی لە سەر ڕۆڵەو کوڕەکانی.

ئەگەر بە دەستهێنانی بۆ بەکار هێنانی بێت بۆ ئەو شتانەی کە خوا حەرامی کردوە ( لەبیستنی گۆرانیو مۆسیقا، یان تەماشا کردنی ئەو زنجیرەو فلیمە بێ ئابرۆیانە بێت کە تێکەڵی پیاوو ژنی تێدایەو وێنەی ئافرەت بە سفوری دیاردەکەوێت، شتی دیکەش لەو شتە حەرامانە) ئەوە هەبوون و بەدەست هێنانی دروست نیە بۆ کەس وکاری ئەو منداڵانەی کە ناتوانن لەم جۆرە پرۆگرامانەی باسمان کرد منداڵی خۆیان بپارێزن، ئەوە گوناهێکیان خستۆتە

ئەستۆی خۆیـان، چونکە یارمەتی منداڵەکانیان داوەو ئاسانکارییان بۆ کردوونە بۆ ئەنجام دانی حەرام، وەئەوەش لە خەراپی پەروەردەکردنە، کەمرۆڤ لە دوا رۆژدا لێپێچینەوەی لە گەڵ دەکرێت لەسەری.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٢. ئەگەر مامۆستا داوای کێشانی وێنەیەکی گیانداری کرد لە قوتابی نابێتو دروست نیە، دەکرێت مامۆستا بڵێت وێنەی ئوتومبێلێك یان دارێك یان شتێکی هاوشێوە بکێشن، ئەویش لەو شتانەیە کە خەڵك پێوەی گیرۆدە بووە بەهۆی شەیتانەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٣. چەپڵە لێدان بۆ منداڵ.

بەکار هێنانی لەلایەن پیاوەوە بۆ گەمەو گاڵتە کردن لە گەڵ کۆرپەڵەکەی، یان داوا لە قوتابیەکان بکات لە پۆل چەپڵەی لێ بدەن بۆ هاندانی قوتابیەکان، دروست نیە، چونکە لە خەسڵەتەکانی نەفامیەیە، هەروەها لەبەر ئەوەی لە تایبەتمەندیەکانی ئافرەتە، بۆ ئاگەدار کردنەوە لە نوێژ لەکاتی هەڵە کردن.

«اللجنة الدائمة»

٨٤. به كورِ كردن‌و حوكمه‌كانی.

- به كورِ كردن ناسراو بوو له‌كاتی نه‌فامی پێش هاتنی په‌یامی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌وه‌ی یه‌كێكی كردبایه‌ رۆڵه‌ی خۆی جگه‌ له‌ منداڵه‌كانی، ئه‌وه‌ ره‌چه‌ڵه‌كیان بۆ ئه‌و ده‌گه‌ڕانده‌وه‌و میراتی ده‌گرت، بۆی هه‌بوو به‌ ته‌نها (خه‌ڵوه‌ت) بێت له‌ گه‌ڵ خێزانه‌كه‌ی‌و كچه‌كه‌ی، خێزانی به‌ كورِ دانراوه‌كه‌ حه‌ڕام ده‌بوو له‌سه‌ر باوك دانراوه‌كه‌. ( به‌ كورتی له‌ هه‌موو كاروبارێك به‌كورِ دانراوه‌كه‌ وه‌كو كوڕی ڕاسته‌قینه‌ بوو)

«اللجنة الدائمة»

- جا ئسلام هات میراتی نه‌هێشت له‌ نێوان زڕ باوك‌و زڕ كوڕه‌كه‌، وه‌ بۆ هه‌ر یه‌كێكیان چاكه‌ كردنی پێویست كرد له‌ گه‌ڵ یه‌كتر دا له‌ ژیاندا، دوای مردنیش وه‌صیه‌تكار چاكه‌ی له‌ گه‌ڵ بكات به‌ وه‌سیه‌تێك كه‌ شایه‌ن بێت، به‌ مه‌رجی ئه‌وه‌ی تێ نه‌په‌ڕێ له‌ سێیه‌كی ماڵی وه‌صیه‌تكاره‌كه‌.

ج. خوای گه‌وره‌ بۆ به‌ باوك دانراوه‌كه‌ (متبنی) خێزانی به‌ كورِ دانراوه‌كه‌ی حه‌لال كرد دوای جیا بوونه‌وه‌ لێی، ئه‌و شته‌ش قه‌ده‌غه‌ بوو له‌ نه‌فامی.

«اللجنة الدائمة»

٨٥. دروسته بۆ مرۆڤ بانگی یەکێك لە خۆی بچوکتر بکاتو بلێ کوڕەکم واتە بە کوڕی خۆی دابنێت لە قالبی سۆزو خۆشەویستیو نەرمو نیانی لە گەڵی.

«اللجنة الدائمة»

٨٦. دروستە بۆ مرۆڤ بانگی لە خۆی گەورەتر بکات بلێت باوکە وەکو ڕێزگرتنێك لێی.

«اللجنة الدائمة»

٨٧. دروستە بۆ باوکێك بەخششێکی مانگانە لە ڕاتبەکەی دیاری بکات بۆ کوڕە گوێرایەڵەکەی کە هەڵساوە بە کاروبارەکانی، بە ئەندازەی ئیشەکەی وەکو کارکەرێکی بێگانە، لەگەڵ ڕەچاو کردنی خەرجیەکەی ئەگەر هاتوو خەرجی بۆ دەکرد، ئەوەش بە ستەم کردن لە گەڵ منداڵەکانیتر دانانرێت.

«الشيخ إبن باز»

٨٨. ڕشانەوەی منداڵ لە سەر جلو بەرگ.

پێویستە لەسەری بیشۆرێت پێش نوێژ کردن، چونکە هەندێك لە زانایان بە پیسیان داناوە.

«الشيخ إبن جبرين»

٨٩. شیر دەداتە منداڵەکەی کاتێك ئەو جەنابەتە.

هیچی تێدا نیە، پێویست نیە لەسەری خۆی بشوات یان دەستنوێژ بشوات پێش شیردانەکەی.

«الشیخ إبن جبرین»

٩٠. تێپەڕ بوونی منداڵ لە پێش نوێژکەر.

هەوڵ بدە قەدەغەی بکەی، بەڵام ئەگەر لەسەرت زاڵ بوو ڕۆیشت ، ئەوە هیچ گوناهت لەسەر نیە، چونکە نوێژ هیچ شتێك نایپچڕێنێت مەگەر ئافرەتی پێگەیشتوو(بالغ)و کەرو سەگی ڕەش بێت، کاتێك نێوان نوێژکەرو پەناگەکە (سترە) تێ دەپەڕن.

«اللجنة الدائمة»

٩١. بەکار هێنانی ووشەی (شاطر) بۆ منداڵی زیرەكو ووریا.

ئایا دەزانی ووشەی شاطر بە زمانی عەرەبی واتای دزی ڕێگرە. وە أصمعی دەفەرمێت ( شاطر الذي شطر عن الحق.... أي بعد عنه) واتە ئەو کەسەیە کە لە هەقو ڕاستی دوور کەوتۆتەوە. بۆ ناگوترێت منداڵێکی زیرەکە یان منداڵێکی نایابە؟

٩٢. یارمەتی منداڵەکەت بدە لەسەر چاکە کردنی بۆت

یارمەتی منداڵەکەت بدە لەسەر چاکەکردنی بۆت بە سێ شت:

– بە نەرمو نیانی هەلسو کەوتی لە گەڵ بکە.

– جوان ئاگەدار کردنەوەی لە لاریەکانیو لادانەکانی.

– چاك ئاگەدار کردنەوەی لە ئەركو واجبەکانی.

## ﴿ ئافرەت و شیردان ﴾

### ❖ (١٢) وەڵامی تێدایە.

١. ئەندازەی شیردان.

مەمکەکە بمژی پاشان بپچڕێنێت لەبەر هەناسەدان، یان تێر بوون یان بێزاری ،یان لە مەمکێك بگوازرێتەوە مەمکێکی‌تر، ئەوە شیردانێکە ئەگەر گەڕاوە دەبێتە دوو، ئەگەرچی لە یەك دانیشتنیش بێت.

٢. پێغەمبەر (ﷺ) ( يحرم من الرضاع ما يحرم من النسب) واتە ئەوەی لە شیردان حەڕام دەبێت وەکو ئەوەیە لە بنەچە و ڕەچەڵەك حەڕام دەبێت.

٣. سەلماندنی شیردان:

بە شایەت دانی یەك ئافرەتی دینداری دەبێت، ناسراو بێت بە ڕاستگۆیی، جا چ شیردەر بێت یان خەڵکی دیکە بێت جیاوازی نیە.

٤. حوکمەکانی شیردان جێگیر نابێت مەگەر بە دوو مەرج نەبێت.

أ. دەبێت پێنج جار یان زیاتر تێری خوارد بێت.

ب. دەبێت شیردانەکە لە دوو ساڵەکە بێت.

٥. ئەوەی گومانی لە شیردانەکە هەبێت.

یان گومانی لە تەواو بوونی پێنج جاری شیردانەکە هەبێت، هیچ بەڵگەیەکی روونیش نەبێت، ئەوە حەڕام ناکرێت، چونکە شیر نەدانە کە ئەصڵە.

٦. ئەو شتانەی لەسەر شیردان دەکەوێتەوە.

ئەگەر ئافرەتەکە شیر بداتە منداڵێك دەبێتە کوڕی لە:

أ. حەرامبوونی هاوسەرگیری

ب. حەلال بوونی سەیر کردنی.

جـ. دروستە بە تەنها لە گەڵ یەکتر بن.

د. دەبێتە مەحرەمی.

٧. ئەو شتانەی لەسەر شیردان ناکەوێتەوە.

١. خەرجی واجب نیە لەسەر ئەو کەسەی شیرەکەی خواردووە.

٢. میراتی یەکتر ناگرن.

٣. نابێتە سەرپەرشتکاری .

٨. ئەگەر شیرەکە بکاتە قورکی منداڵە بەبێ مەمگ دانی.

حوکمەکەی حوکمی مەمك پێ دانیتی، وەکو ئەوەی بە دڵۆپە لە دەمی بکات، یان لە جامێك بیخواتەوە یان بە شتێتر. چونکە ئەو

شتەی بە مەمك دان بە دەست دێت هەمان شت بەم جۆرە شیردانەش بە دەست دێت، ئەویش خۆراك وەرگرتنە، بە مەرجی ئەوەی پێنچ جار ئەوە ڕوویدات.

٩. کاریگەری شیردان بڵاو نابێتەوە، مەگەر لەسەر شیرە خۆرەکەو لقەکانی، لە منداڵەکانیو منداڵی منداڵەکانی.

١٠. حەرام بوونەکە بڵاو نابێتەوە لەسەر ئەوانەی لە خۆی گەورەترن، لە (باوكو دایكو مامو مامۆژنەکانیو خاڵو خاڵۆژنەکانی)

١١. هەروەها بڵاو نابێتەوە بۆ ئەوانەی وەکو خۆیەتیو لە نمرەی خۆیەتی لە دەورەبەری، ئەوانیش (برایەکانوخوشکەکانی)

١٢. مەحرەمەکانی شیر دەرەکە.

وەکو باوکەکانیو منداڵەکانیو دایکەکانیو خوشکەکانیو مامەکانیو هاوشێوەیان. هەموویان دەبنە مەحرەمی شیر خۆرەکە.

**هذا المبحث ملخص من كتاب**

**الملخص الفقهي للفوزان**

## ﴿ ئافرەتو لە پرسەدا دابوون ﴾

❖ (٦٩) وەلامی تێدایە.

١. پێناسەی لە پرسەدابوون: واز هێنانە لە هەموو شتێك كە دەبێتە هاندان بۆ هاوسەرگیریو سەیر كردنی ( لە خشڵو زێڕو كلو بۆنو جلوبەرگی جوان)

٢. حوكمی: واجبە.

٣. حیكمەتو دانایی لە پرسەگرتن.

بەو ماوەیە ( چوار مانگو دە ڕۆژە) دروستبوونی كۆرپەلەی تێدا تەواو دەبێتو فووی ڕوحی تێدا دەكرێت، ئەگەر هاتوو دوو گیان بوو، ئەگەر وەها نەبوو، ئەوە بەبێ گومان دیارە كە سكەكەی پاكەو هیچی تێدا نیە.

«الشیخ البسام »

٤. ئەگەر ئافرەتی خاوەن پرسە لە (عیددە)كەی چووە دەرەوە ئایا هیچی لەسەر پێویست دەبێت؟

نەخێر هیچی لەسەر پێویست نابێت، وەكو هەندێك خەڵك گومانیان وایە.

«الشیخ إبن فوزان»

❖ چ كاتێك دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە لەماڵی خۆی بگوازرێتەوە.

٥. ئەگەر لە نەفسی خۆی ترسا لەوێ بمینێتەوە.

٦. ئەگەر بە زۆرەملێ لەوێ گوازراوە.

٧. ئەگەرماڵەکە بە کرێ بوو، خاوەنی ماڵەکە دەریکرد، یان داوای کرێی زیاتری کرد لە کرێی خۆی.

«الشيخ إبن فوزان»

٨. پێوەرو لێکدانەوەی جوانی.

جوانیو دژەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دابو نەریتی باو لە کاتێكو شوێنێکی دیاری کراو، چونکە حەزرو ئارەزووە، پەیوەست ناکرێت بە جۆرە جلێكو شێوەیەك، لەوانەیە لای گەلێك جوان بێت، لای کەسانیتر جوان نەبێت، کەوابوو دەگەڕێتەوە بۆ دابو نەریتی باو لە ناو خەڵك

٩. خەرجی ئەو ئافەرەتی کە لەناو پرسەدایە.

هیچ خەرجی بۆ نیە، جا چ دووگیان بێت یان دووگیان نەبێت جیاوازی نیە. چونکە پارەکە گوازراوەتەوە بۆ میراتگرەکان.

١٠. چ کاتێك ئافرەت پرسەکەی دەست پێ دەکات.

لەو ڕۆژەی کە پیاوەکەی دەمرێت، ئەگەر چی هەواڵی مردنی درەنگ پێ گەیشت بێت.

❖ جۆرەکانی پرسە

١١. پرسەی ئافرەت بۆ کەسانیتری جگە لە پیاوی خۆی.

سنووردارە بە سێ ڕۆژ، دروست نیە بۆ ئافرەتی ئیماندار تێیپەڕێنێت.

١٢. پرسەی ئافرەت بۆ مێردە مردووەکەی چوار مانگو دە ڕۆژە.

❖ حیکمەتو دانایی لە پرسە گێری.

١٣. بە گەورە دانانی مافەکانی هاوسەرایەتی، پاراستنی پێکەوە ژیانی ژنو مێردایەتی.

١٤. دڵنەواییەکە بۆ دەروونی خزمەکانی پیاوەکەو پاراستنی هەستو نەستیان

١٥. زانینی بەتاڵ بوونی ڕەحم لە منداڵ لەو ماوەیە.

## ❖ ئەو شتانەی لەسەر ئافرەتی خاوەن پرسە پێویست دەبێت لە حوکمەکان:

١٦. واجبە لەسەری لەوماڵە بمینێتەوە کە پیاوەکەی تێدا مردو خۆی تێدا دەژیا لێی نەچێتە دەرەوە، مەگەر بۆ پێداویستیو خواستی پێویست بێت، وە چوونە دەرەوەکەشی بۆ پێویستی تەنها لە کاتی ڕۆژ بێت (بە شەو نەبێت) ، وەکو سەردانی نەخۆشخانە بکات لە کاتی نەخۆشی، یان کڕینی پێداویستیەکانی لە بازاڕ.

«الشیخ إبن باز»

١٧. واز لە هەموو بۆن‌و عەترێك دێنێت.

جا چ بخور بێت یان روونی جوانکاری بێت، مەگەر کاتێك لە حەیز پاکدەبێتەوە، لەو کاتە بۆی هەیە بۆن‌و عەترێك بەکار بێنێت وەکو بخور ئەویش بۆ لابردنی بۆنی بۆکەنە، کە لە حەیز پەیدا دەبێت.

«الشيخ إبن باز»

١٨. واز لە خشڵ‌و زێڕ بێنێت بە هەموو جۆرەکانی.

جا چ لە دەست بێت یان سینگ یان پێی یان گوێچکە یان سەر جیاوازی نیە،وە جا چ زێر یان ئەڵماس بێت جیاوازی نیە.

«الشيخ إبن باز»

١٩. واز لە هەموو جوانکاریەکان دێنێت، وەکو کل یان سوور کردنی لێوو خەنە یان هاوشێوەی ئەو شتانە.

«الشيخ إبن باز»

٢٠. واز لە جل‌و بەرگی جوان دێنێت، جل‌و بەرگی‌تر لەبەر دەکات.

«الشيخ إبن باز»

٢١. دروست نیە بە شێوەیەکی ڕاشکاو داوا بکرێت‌و بخوازرێت هەتاکو لە (عیددە)کەی دەردەچێت‌و تەواو دەبێت. وەهیچ لاریەك نیە بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ ئاماژە بە داواکردنی بکرێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٢. دروست نیە ڕۆژەکانی (عیددە)و پرسە، زیاتر بکرێت ئەگەر هاتوو بەئەنقەست کردی، بەڵام ئەگەر لە بیری کرد، هیچ گوناهی لەسەر نیە.

«الشيخ محمد بن إبراهيم»

٢٣. ئەو ئافرەتەی لە ناو پرسەدایە، سەفەری حەجی بۆ نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٤. ئەو ئافرەتەی کە پیاوەکەی مرد بێت دوای گرێبەستەکەو پێش جووت بوون لە گەڵی، ئەوە پرسە گرتنی لەسەر پێویست دەبێت، چونکە تەنها بە گرێبەستە کە دەبێتە خێزانی.

«اللجنة الدائمة»

٢٥. لەبەر کردنی جلو بەرگی ڕەش.

لەبەر کردنی دروست نیە لەبەر غەمو پەژارە بۆ مردووەکە، جا چ هاوسەری بێت یان کەسیتر بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٦. گواستنەوە لە ماڵی پیاوەکەی دروست نیە، بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە هەتاکو (عیددە)کەی تەواو نەبێت، مەگەر (لەبەر هۆیەکی شەرعی بێت)، ئەگەر بەبێ هۆیەکی شەرعی شوێنەکەی گۆڕی بێت، ئەوە دەبێت بگەڕێتەوە ئەو ماڵەی کە لێی دەرچووە.

«الشيخ محمد بن إبراهيم»

٢٧. دوای تەواو بوونی کاتی عیددە قەزا ناکرێتەوە.

ئەگەر هەواڵی مردنی مێردەکەی دوای چوار مانگ دە رۆژ پێگەیشت، ئەوە هیچ (عیددە)ی بۆ نیە چونکە کاتەکە بەسەر چووە.

«الشیخ إبن عثیمین»

## ❖ ئەو شتانەی دروستە ئافرەت بیکات لەو کاتەی پرسەی بۆ هاوسەرەکەی گرتووە:

٢٨. بۆی دروستە خۆی بشوات بەئاوو صابوون‌و سیدر، هەر کاتێك ویستی.

«الشیخ إبن باز»

٢٩. بۆی دروستە هەر کاتێك ویستی لە گەڵ خزمە نزیکەکانی قسە بکات‌و لە گەڵ مەحرەمەکانی دابنیشێت، قاوەو خواردن‌و شتی دیکەش پێشکەش بکات.

«الشیخ إبن باز»

٣٠. بۆی دروستە هەموو کارەکانی ماڵ بکات، وەکو شیو لێنان‌و دورمان‌و پاکژ کردنەوەی ماڵ‌و جل‌وبەرگ شۆرین‌و شتی دیکەش لەو شتانەی کە هەر ئافرەتێکی ئاسایی دەیکات، کە خاوەن پرسە نەبێت.

«الشیخ إبن باز»

٣١. بۆی هەیە لە بەر مانگ پیاسە بکات وەکو ئافرەتەکانی دیکە.

«الشيخ إبن باز»

٣٢. هیچ لارییەك لە پێشکەش کردنی بۆنو عەتر نیە، بۆ میوانەکانو منداڵەکانی بەبێ ئەوەی خۆی بەشداریان لە گەڵ بکات.

«الشيخ إبن باز»

٣٣. لەبەر کردنی کاتژمێر دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە لەو کاتەی کە لە پرسە دایە بۆ رێكو پێك خستنی کاتەکانی نەك بۆ جوانی، بەڵام واز هێنان لێی چاکترە، چونکە بە خشڵو زێر دەچێ.

«اللجنة الدائمة»

٣٤. بۆ ئەو ئافرەتەی کە پیاوەکەی مرد بێت لە شارێك، کە هیچ کەسو کاری ئافرەتەکەی لێ نیە، بۆی هەیە بگوازرێتەوە بۆ ماڵی سەرپەرشتکارەکەی یان شوێنێکیتر، کە لە گیانی خۆی دڵنیا بێت.

٣٥. بەڵام ئەگەر لە شوێنێك بێت دڵنیا بوو لە دەستدرێژی دوژمنانی لێی، ئەوە بۆی دروست نیە بگوازرێتەوە، بەڵکو

لەسەری پێویستە هەر لە شوێنی خۆی بمینێتەوە، هەتاکو ماوەی پرسەکەی تەواو دەبێت.

«اللجنة الدائمة»

٣٦. پرسە گرتن تەنها دەرهەق بە ئافرەتان هەیە، نەك دەرهەق بە پیاوان. پیاوەکان بۆیان دروست نیە پرسەگیری بکەن لەسەر مردوو.

«الشيخ إبن فوزان»

٣٧. بەکارهێنانی تەلەفۆن.

دروستە بۆ ئافرەت لەکاتی پرسەی پیاوە مردووەکەیدا تەلەفۆن بەکاربێنێت لە گفتو گۆ کردنی لە گەڵ ئافرەتانو ئەوانەی مەحرەمەکانی خۆیەتی.

«اللجنة الدائمة»

٣٨. دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە قسە لە گەڵ خەڵکیتر بکات، جگە لە مەحرەمەکانی لە ڕێی تەلەفۆن یان لە ڕییێتر، بە شێوەیەك دوچاری شتێکی قەدەغەکراو نەبێت لە شەرع.

«اللجنة الدائمة»

٣٩. جلو بەرگی ئافرەتی خاوەن پرسە.

دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە هەموو جۆرە ڕەنگێك لەبەر بکات بە مەرجێك جوان نەبێت، یان ڕازاوە نەبێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٤٠. ئافرەتی خاوەن پیشە یان خوێندکار چۆن پرسە بگرێت؟

بۆی دروستە بە ڕۆژ بچێتە دەرەوە بۆ کارەکەی، چونکە ئەوە لە پێداویستە گرنگەکانە، وە ئەگەر پێویستی دەکرد، بە شەویش بۆی هەیە بچێتە درەوە لەبەر گرنگیو پێویستی، نەوەك لە کارەکە دەر بکرێت.

«الشيخ إبن باز»

٤١. ئایا ئافرەتی پرسەدار قژی خۆی دەربخات لە لای مەحرەمەکانی؟ هیچی تێدا نیە قژی خۆی دەربخات ، ئەوەندەی کە لە دابو نەریت باوە.

٤٢. ئایا ئافرەتەکە خۆی بشوات دوای تەواو بوونی پرسەکەی؟

نەخێر، خۆشوشتنێکی دیاری کراوی لەسەر نیە، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) واتە ئەوەی لە کاروباری پەرستن شتێك دابێنێت کە نەبێت ئەوە لێی وەرناگیرێت.

«اللجنة الدائمة»

٤٣. وەلیمە کردن بۆ ئەو ئافرەتەی کە لە پرسەکەیدا دەردەچێت.

- ئەگەر لە قالبی دابو نەریتو ڕێز گرتنی ئافرەتەکە بێت ئەوە هیچی تێدا نیە.

- بەڵام ئەگەر لە قالبی دینداری بێت و بڕوای وابێت ئەو شتە شەرعیە، ئەوە دروست نیەو شتێکی داهێنراوە (بیدعەیە).

«اللجنة الدائمة»

٤٤. حوکمی دەرچوونی ئافرەتی پرسەگێر بە شەو.

ئەو ڕایەی کە کۆمەڵەی زانایان لەسەرن، دروستە لەسەرەتاو کۆتایی شەو بچێتە دەرەوە، بەڵام هەر دەبێت لە ماڵەکەی بخەوێت (ئەگەر پێویستی دەکرد بۆی دروستە هەموو کاتێك بچێتە دەرەوە)

«الشیخ إبن باز»

٤٥. ئایا ئەو حوکمانە جێ بەجێ دەکرێت، ئەگەر هاتوو ئافرەتە خاوەن پرسەکە لە ماڵێکی نوێ جێگیر بێت؟

- ئەگەر هاتوو لە ماڵی خۆی چووە ماڵێکیتر لەبەر عوزرێك، ئەوە شوێنی نیشتەجێ بوونی لە ماڵە نوێیەکەی کە بۆی گوازراوەتەوە، وەکو ئەو ماڵەی لێ دێت کە لێی ڕۆیشت بوو، لە حەرام بوونی چوونە دەرەوە، چونکە وەکو ماڵی یەکەمی لێ دێت.

«الشیخ إبن عثیمین»

٤٦. جۆرەکانی پرسە کردن.

ئیبنولقەیم فەرموویەتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پرسە گرتن لە بۆ هاوسەر واجبەو بۆ سەر کەسانیتر دروستە، ئەو ڕایەی پێ

پەسند بووە بۆ هەموو مردوویکی نزیك یان دوور بکرێت بەلام لە سێ ڕۆژ تێنپەڕێت.

«الشيخ إبن باز و الشيخ إبن عثيمين»

٤٧. حوكمی كل چیە؟ بۆ ئافرەتی پرسەدار ئەگەر پێویست بوو.

دروستە كل بەكار بێنێت ئەگەر پێویست بوو، بۆ چارەسەر كردن نەك بۆ جوانی. بۆی هەیە بە شەو بیكاتو بە ڕۆژ بسرێتەوە.

٤٨. لەبەر كردنی هاوریشم بۆ ئافرەتی پرسەدار؟

بە هیچ جۆرێك نابێت، چونكە ئافرەتی پرسەدار، خوڕازاندوەی لێ قەدەغەیە. بەلام ئەگەر پێویست بوو، وەكو ئەوەی خورانی هەبوو، یان نەخۆشی پێستی هەبێت (حساسية) ،ئەوە هیچی تێدا نیە لە بەر پێویستی.

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ جلو بەرگ دوو جۆرە.

٤٩. جلو بەرگی خۆڕازاندنەوەو جوانی دروست نیە بۆ ئافرەتی پرسەدار لەبەری بكات.

٥٠. جلوبەرگی كاركردن: واتە ئەو جلوبەرگەیە كە بۆ خۆڕازاندنەوە نیە، ئەم جۆرەیان ڕەنگەكەی هەر ڕەنگێك بێت دروستەو هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥١. حوكمی ئەو كەسە چییە، كاتێك كە هەواڵی(مردنی هاوسەرەكەی) پێدەگات لە ماڵی خۆی نەبوو.

زانایەكان دوو فەرموودەیان هەیە، ڕای ڕاسترو دروستر ئەوەیە كە زۆربەی زانایەكان بۆی چووینە دەبێ پرسە لەو ماڵە بگرێ كە پیاوەكەی تێدا مردووەو بە خۆشی لەوێ دەژیا، ئەگەر هاتوو هەواڵی پێ گەیشتو ئەویش لە ماڵ نەبوو، واجبە بگەڕێتەوە، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (أمكثي في بيتك ) رواه أبو داود واتە لە ماڵی خۆت بمینێیەوە.

٥٢. حوكمی خواردنی بۆندار.

دروست نیە بۆ ئافرەتی پرسەدار ئەو خواردنە بخوات كە بۆنێكی دیاری هەبێت، بۆی دروست نیە قاوەیەك بخوات زەعفەڕانی تێدا بێت چونكە بۆنە، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)( ولا تمس طيبا) واتە نزیك بۆن مەكەوە.

«الشيخ إبن باز و الشيخ إبن عثيمين»

٥٣. حوكمی ئەو ڕوونانەی كە بۆندار نین.

ڕای ڕاستو دروستر ئەوەیە هیچی تێدا نیە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە، چونكە دەقەكەكان لە خۆی ناگرنو هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر حەڕام بوونی.

«المالكية والحنابلة »

٥٤. بەڵام پێشەوایەکانیتر ( وەکو مالیكو شافیعیو ڕیوایەتێك لە ئەحمەد بەکار هێنانیان قەدەغە کردوە بۆ سەر، چونکە جوانی دەکاتو دەیڕازێنێتەوە، ئەویش خۆڕازاندنەوەی لێ قەدەغە کراوە).

٥٥. ئەو روونانەی بۆ خۆڕازاندنەوە بەکار دێت.

ئافرەتی پرسەدار لێ قەدەغە دەکرێت، چونکە خۆڕازاندنەوەی لێ قەدەغە کراوە.

٥٦. ئەو صابوون شامپۆیەی کە بۆنی خۆشە.

دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە بەکاری بێنێت، چونکە ئەوەی بۆ صابون بەکار دێت بۆنو عەتر نیە، بەڵکو تەنها بۆنو مەرامە (نكهة) ، ئەو بۆنە نیە کە مەبەستە، بەڵام چاکتر وایە وازی لێ بێنێت بۆ دەرچوونت لە دووبەرەکی ڕای زانایان.

«الشيخ إبن باز و الشيخ إبن عثيمين»

٥٧. ئایا ئافرەتی پرسەدار دروستە بۆ مزگەوت بچێتە دەرەوە؟

نەخێر بۆی دروست نیە بچێتە دەرەوە، دەبێت لە ماڵی خۆی نوێژ بکات، چونکە ئەو شتە لەو پێداویستیە گرنگانە نیە کە چوونەدەرەوەکەی بۆ حەلال بکات.

«اللجنة الدائمة»

٥٨. چوونه دەرەوەی ئافرەتی خاوەن پرسە بۆ ماڵی کەس‌وکارو کورەکانی هیچی تێدا نیە، ئەگەر یەك پەرژین کۆیان بکاتەوە، چونکە حوکمی یەك ماڵی هەیە.

«اللجنة الدائمة»

٥٩. ئەوەی مێردەکەی لە وڵاتی نامویی بمرێت لە کوێ پرسە بگرێت؟

لەو شوێنە پرسە دەگرێت کە پیاوەکەی تێدا مردوەو لە گەڵی بووە، ئەگەر بۆی ئاسان بوو، لەخۆی دڵنیا بێت، وەمانەوەی لەو شارە بۆی قورس‌و گران نەبێت‌و ئەوەندە مەحرەمەی لە گەڵ دابێت کە بیپارێزن، ئەگەر وەها نەبوو، دەگەڕێتەوە شاری مێردەکەی، لە ماڵی پیاوەکەی پرسە دەگرێت، ئەو ماڵەی کەلە ناویدا دەژیان، پێش سەفەر کردنەکەیان، ئەگەر بۆی ئاسان بوو.

«اللجنة الدائمة»

٦٠. دروست نیە، بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە خۆی بۆن خۆش بکات، یان ئەو شتە بەکار بێنێت کە بۆنی هەیە لە لەش‌و جل‌وبەرگ‌و خواردن‌و خواردنەوە، لەو شتانەش زەعفەران.

«اللجنة الدائمة»

٦١. ئایا لابردنی ئەو شتانەی کە ئەزیەتی پێوە دەبینێت دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە.؟

هیچی تێدا نیە، وە جێبەجێ کردنی سوننەتی نینۆك کردنو کردنی ئەو موانەی کە دروستە بیکات (وەکو مووی بەرو بن هەنگل) ئاسایەو دروستە.

«اللجنة الدائمة»

٦٢. ئایا درەستە ئافرەتی خاوەن پرسە قژی خۆی دابێنێت بە شانە؟

دروستە وابکات.

«اللجنة الدائمة»

٦٣. ئایا دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە گەشتێك بکات بۆ چارەسەر کردن؟

بۆی دروستە گەشت بکات، لە گەڵ گەشتەکەی پارێزگاری لە حوکمەکانی پرسەگیری بکات.

«اللجنة الدائمة»

٦٤. ئایا دروستە بۆ ئافرەتی خاوەن پرسە هەندێك لە ماوەی (عیددە)کەی بباتە سەر لەماڵی دایکی، لەبەر نەخۆش بوونی دایکی؟

واجبە لە ماڵی پیاوەکەی (عیددە)کەی بگرێت، دروست نیە بۆی، هەندێك لە ماوەکەی لە لای دایکی بەسەر ببات لەبەر نەخۆشبوونی.

٦٥. بەلام سەردانی ئەو دایکەی کە پێویستی بە سەردانی ڕۆڵەکەی هەیە، ئەوە لە گەورەترین پێداویستیەکانە ، بۆی دروستە ئەگەر هاتوو پێویستی بە سەفەر کردن نە دەکرد.

«اللجنة الدائمة»

٦٦. ئایا ئەو کەسەی وازی لە (عیددە)کەی هێناوە، یان وازی لە پرسە گرتن هێناوە بەئەنقەست، ئایا هیچ کفارەتی (کفارە) لەسەر پێویستە؟

نەخێر کفارەی لەسەر واجب نیە، بەڵکو پێویستە لەسەری زۆر پەشیمان بێتەوەو داوای لێبوردنی ئەو گوناهە لە خوا بکاتو کاری چاك بکات.

«اللجنة الدائمة»

٦٧. حوکمی ئەو ئافرەتەی کە ماڵی پیاوە مردووەکەی خەرج دەکات لە ڕۆژەکانی پرسە گرتنی.

هەموو ئەو پارەی کە خەرج کردووە لە بەشە میراتی خۆی دادەنرێت، مەگەر کاتێك میراتگرەکانیتر چاوپۆشی لێ بکەنو ڕێی پێ بدەن.

«الشيخ إبن باز»

٦٨. ئایا پیاو ئەو دەسەلاتەی هەیە پرسەگیری لەسەر هاوسەرەکەی لا بدات؟

نەخێر ئەو دەسەڵاتەی بۆ نیە کاتێك پیاوەکەی لە پێش ئەو بمرێت. واجبە لەسەری پرسەی بۆ دابنێت.

«اللجنة الدائمة»

٦٩. ئەگەر یەکێك هەندێك لە قەدەغەکراوەکانی پرسەگێری بکات ئایا لەسەری پێویستە چی بکات؟

پێویستە لەسەری داوای لێبووردنی گوناهەکانی لە خوا بکاتو تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە، هیچ کفارەتێکی دیاریکراوی نیە.

«اللجنة الدائمة»

# ﴿ چەند ووشەیەك لە كاتی گیرو گرفت ﴾

❖ ئەی خوشكی پیرۆز ئەگەر دووچاری هەر گرفتێكی كۆمەڵایەتی، یان دارایی یان سایكۆلۆجی بووی، ئەوە ئەو هەنگاوانە جێ بەجێ بكە:

١. ڕازی بوون بە قەزاو قەدەرو ئارامیو خۆڕاگرتنو نارەزایی دەرنەبڕین:

تورەییو نارەزایی خۆت دەرمەبڕە لەسەر قەزاو قەدەری خوا، نە بە دڵت نە بە زمانت نە بە ئەندامەكانی لەشت، وە ڕازی بە بە قەزای خواو سوپاسی خوا بكە بە زمانتو بڵێ سوپاس بۆ خوا لە هەموو حاڵەتێك، وە داوای لێبوردنی لێ بكە.

٢. بڵێ (إنا لله وإنا إليه راجعون، اللهم أجرني في مصيبتي هذه واخلفني خيراً منها )، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێت:

( إلا أخلفه الله خيراً منها) واتە ئێمە هی خواین هەر بۆ ئەویش دەگەڕێینەوە، خوایە گیان پاداشتم بدە لەو گیرو گرفتەم هی چاكترم بۆ قەرەبوو بكە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێت( بێ گومان خوای گەورە هی چاكترو باشتری بۆ قەرەبوو دەكاتەوە).

٣. زۆر داوای چاوپۆشین‌و لێبوردن له‌ خوا بكه‌.

له‌ ئه‌سه‌ره‌وه‌ هاتووه‌ ( من لزم الأستغفار جعل الله له من كل هم فرجاً ومن كل ضيق مخرجا) واته‌ ئه‌وه‌ی به‌رده‌وام داوای لێبوردن‌و چاوپۆشین له‌ خوا بكات خوای گه‌وره‌ له‌ هه‌موو غه‌م‌و خه‌فه‌تێك كه‌لێنێكی خێری بۆ ده‌كاته‌وه‌، وه‌ له‌ هه‌موو ته‌نك‌و چه‌ڵه‌مه‌یه‌ك قوتاری ده‌كات.

٤. ڕاپچله‌كێ بۆ نوێژ:

ده‌ستنوێژێك هه‌ڵده‌گریت‌و دوو ره‌كعه‌ت نوێژ ده‌كه‌ی، چونكه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ( إذا حزبه أمر (أي تضايق أو أهمهُ أمر) قام إلى الصلاة) كاتێك تووشی ته‌نك‌و چه‌ڵه‌مه‌یه‌ك ده‌بوو، یان كارێكی لا گرنگ بوایه‌ بۆ نوێژ هه‌ڵده‌ستا.

٥. چاكسازی بكه‌ نێوان خۆت‌و خوا

ئه‌ویش به‌ به‌دوا ڕۆیشتنی فرمانه‌كانی‌و دوور كه‌وتنه‌وه‌ له‌ قه‌ده‌غه‌كراوه‌كانی، له‌قسه‌ی زاناو دانایی‌یه‌كان هاتووه‌ ( ئه‌وه‌ی نێوان خۆی خوای چاك بكات، خوای گه‌وره‌ نێوان خۆی‌و خه‌ڵك بۆ چاك ده‌كات.

٦٢. دوعاو پاڕانه‌وه‌

خـوای گـەورە فەرمویـەتی ( ادعـونی أسـتجب لكـم) واتـە داوام لێ بکـەن وەڵامتـان دەدەمـەوە. علـي کـوڕی أبـی طالـب فەرمويـەتی (ڕەزای خـوای لـیٚ بێـت) ( إدفعـوا أفـواج الـبلاء بالـدعاء) واتـە شەپۆلەکانی بـەڵاو موسـیبەت لـە خۆتـان دوور بخەنـەوە بـەدوعاو پاڕانەوە) دوعای غەمو پـەژارە ( اللـهم إنـی عبـدك ابـن عبـدك ابـن أمتك، ناصیتی بیـدك، مـاض في حكمـك، عـدل في قـضاؤك، أسـألك بكل اسم هو لك، سميت به نفسك ، أو أنزلته في كتابـك ، أو علمتـه أحدا من خلقـك، أو أسـتأثرت بـه في علـم الغيـب عنـدك، أن تجعـل القرآن ربيع قلبي، ونور صدري ، وجلاء حزني، وذهاب همي )

(رواه أحمد)

واتە خوایە گیان من بەندەم، کوڕی بەندەتم کوڕی بەنـدەتم کـوڕی کـەنیزەو کۆیلەکـەتم.نـسیبو ناوچـەوانو چارەنوسـم بـە دەسـت تۆیەو حوکمو بڕیارت بەسەرمدا ڕابووردووە. بڕیاردانـت بەسـەرمدا دادپەروەرانەیە.داوات لێ دەکەم بە هەموو ناوێك، کە هەتەو خۆتت پێ ناوناوە، یان لە کتێبەکەتدا ناردووتەتـە خـوارەوە. یـان فێـری یەکێك لە دروست کراوەکانت کردووە. یان لە عیلمی غەیبدا لە لای خۆت هەڵتگرتووە تەنها خۆت دەیزانی. کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵـمو نـووری سـینگمو ڕەوێنـەرەوەی دڵتـەنگیمو لابـەری غـەمو خەفەتم.

## ﴿کورتەی جیاوازیەکان نێوان پیاو ژن﴾

### ❖ جیاوازیە شەرعیەکان.

### ﴿ئەوەی تایبەتمەندە بە پیاو.﴾

١. ئەوان زاڵو دەسەلات دارن لە ماڵەکانیان، بە پارێزگاری کردنو چاودێری کردنەکەیان.

٢. پەیامو پێغەمبەران لە پیاوان بووە لە ئافرەتان نەبووە.

٣. سەرپەرشتکار لە مارە برین، تایبەتە بە پیاوان.

٤. جیهادو تێکۆشان فەرزە لەسەریان.

٥. نوێژی جومعە فەرزە لەسەریان.

٦. نوێژی جەماعەت " لە مزگەوت" فەرزە لەسەریان

٧. بانگدانو قامەت (تایبەتە بە پیاوان).

٨. تەلاق دراوەتە دەست پیاو.

٩. منداڵەکان دەرێتە پاڵ پیاو.

١٠. پیاوان دوو هێندەی ئافرەتیان هەیە " لە میرات، دیەو شایەت دانو هۆزەبانە "

١١. سەرپەرشتکاری گشتی " سەرۆکایەتی دەوڵەتو حوکمو قەزا، دانیشتنەکانی پرسو ڕا (مجلس الشوری)، هەموو تایبەتە بەپیاوان.

### ❖ جیاوازیەکانی لاشەیی.

١. بە ژنو باڵای ئافرەت کورترە لە بەژنو باڵای پیاو.

٢. کۆ ئەندامی ئێسکی ئافرەت کێشی سوکترە لە کۆ ئەندامی پیاو.

٣. دڵی ئافرەت کچکەترەو کێشیشی سوکترە، خێراترو زۆرتر لێ دەدات لە دڵی پیاو.

٤. خوێنی ئافرەت خڕۆکە سوورەکانی زیاترە لە هی پیاو لەگەڵ ئەوەی بڕەکەی کەمترە لە هی پیاو.

٥. خڕۆکە خوێنە سپیەیەکانی پیاو زیاترە لە هی ئافرەت.

٦. هەناسە هەڵمژینی ئافرەت پەلەترە لە هەناسە هەڵمژینی پیاو.

٧. کۆ ئەندامی هەرسکردن لە لای ئافرەت کەمتر پێویستی بە خۆراکە.

٨. هەبوونی حەیز لە لای ئافرەت وای لێکردووە کەمتر لە پیاو توانای جولەو گواستنەوەی هەبێت.

٩. ماسولكەكانی ئافرەت بێ هێزترە لە ماسولكەكانی پیاو، بە نزیكەی سێیەكی هێزەكەی.

١٠. لاشەی ئافرەت زیاتر توانای قەڵەو بوون و گەشەكردنی هەیە لە هی پیاو.

١١. بە ژن و باڵای ئافرەت ئەگەر جوڵەو جمو جۆڵی كەم بێت، ڕێك و پێك كردنی دوورترە لە هی پیاو.

# ﴿ ئافرەتو کڕینو فرۆشتن﴾

❖ (١٨) وەڵامی تێدایە.

١. دانی بە های زێڕ بە چەکی دراو (شیك)( لە جیاتی پارەدان)

هیچی تێدا نیە، چونکە چەك وەرگرتنی فرۆشیار وەکو حوکمی وەرگرتنی نرخەکەیە ، ئەگەر هاتوو چەکەکەی بڕوا پێکراو بوو لە بانك.

«اللجنة الدائمة»

٢. گۆڕینەوەی زێڕی بەکار هاتوو بە زێڕی نوێ سەر بە سەر لە گەڵ وەرگرتنی نرخی دروستکردنی.

دروست نیە، ڕێگای ڕاستو دروست ئەوەیە زێڕە بەکار هاتووەکە بفرۆشێت بەبێ هیچ ڕێککەوتنێك، وە دوای ئەوەی کە خاوەنەکەی پارەکە وەردەگرێتەوە، ئەو کاتە زێڕە نوێیەکە دەکرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣. ڕێگای شەرعی فروشتنی زێڕ بە زێڕ.

ئەو زێڕەی لە لای ئافرەتەکە هەیە بیفرۆشێت بە نرخێکی سەربەخۆو، وەریبگرێت لەو زێڕینگرەی کە پێداویستیەکانی لێ دەکرێت، پاشان زێڕەکەتر بکرێت

## ❖ فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ هیچی تێدا نیە

ئەگەر هاتوو سەر بە سەر، کێش بە کێش، وەکو یەکترو دەست بەدەست بوو، جا چ زێڕەکە نوێ بێت یان کۆن بێت جیاوازی نیە.

«الشيخ إبن باز»

## ❖ ئایا پێویستە پاداشتی دروستکردنەکەی یەکسەر پێ بدرێت.

٤. نەخێر پێویست نیە، چونکە ئەو پاداشتە لەسەر ئیشکردنەکەیەتی، ئەگەر وەریگرت لە حاڵەتی پارە وەرگرتنەکە تەواوە، ئەگینا هەر کاتێك پێی بدات تەواوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٥. ئەگەر فرۆشیار کردیە مەرج لەسەر کڕیار زێڕێکی نوێی لێ بکڕێت، کاتێك کە زێڕە کۆنەکەی بە زێڕینگر دەفرۆشێت، ئەوە دروست نیە چونکە ئەوە فێڵە لە فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ لەگەڵ هەبوونی جیاکاری.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦. زێڕی کڕی نرخی هەندێکی پێ داو ڕۆیشت بۆ ئەوەی نرخی ئەوەی ماوە لە بانك دەربێنێت.

چاکتر وایە عەقەدەکە دووبارە بکرێتەوە پاش هێنانی پارەکە لە بانك، چونکە پێویست ناکات هیچ گرێبەستێك بکرێت پێش هێنانی نرخی زیرەکە. «الشيخ إبن عثيمين»

٧. ئاگەداری: بە دانی کەمێك لە نرخی زێڕەکە، دروست نیە زێڕەکە داگیر بکرێت، بەڵکو دەبێت هەموو نرخەکەی بە تەواوی وەربگیرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨. فرۆشتنی زێڕ لە سەر شێوەی ئاژەڵ.

لەسەر شێوەی پەپولە یان سەرە مار..... حەرامە فرۆشتنو کرینو لەبەر کردنو هەبوونی، چونکە ئەو وێنانە دەبێ لا ببرێت.

«اللجنة الدائمة»

٩. دروست نیە بۆ پیاوی بێگانە زێڕ بخاتە دەستی ئافرەت، جا چ فرۆشیار بێت یان کەسیتر بێت جیاوازی نیە.

«اللجنة الدائمة»

١٠. گەڕاندنەوەی زێڕ دوای کڕینی لە گەڵ وەرگرتنی جیاوازیەکەی.

دروست نیە، نموونەکەی " گەڕاندنەوەی بازنی گەورەو وەرگرتنی بازنی کچگە لە گەڵ دانی جیاوازی نرخەکەی. چونکە فرۆشتنی زێڕ بە زێڕە لە گەڵ چەند درهەمێکی زیاتر.

١١. ڕێگای شەرعی: هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکەیەو گەڕاندنەوەی ئەو بازنانەیە کە نە گونجاو بووە بۆ ئەو کەسەی کڕاوە، پاشان کڕینی بازنیتر پێی بە نرخێکی کەمتر لە یەکەم جار.

«اللجنة الدائمة»

١٢. بەکار هێنانی ئامێر هیچی تێدا نیە لە دانی بە های زێڕەکە،

ئەویش بە گۆڕینی (تحویل کردنی) نرخی زێڕەکە لە بانك لە حیسابی کڕیارەکە بۆ سەر حیسابی فرۆشیارەکە. (( وەهیچ پارەیەك بەرامبەر ئەم تەحویلە نەبێت)) ئەوە حوکمی وەرگرتنی هەیە لە هەمان شوێن.

«اللجنة الدائمة»

١٣. زێری بەکار هاتوو نوێ بکاتەوە، بە زێری نوێ بیفرۆشێت، کڕیاریش نەزانێت ، دروست نیە، چونکە جۆرێکە لە غەش

«اللجنة الدائمة»

١٤. زێر هەلگرتنە

دروستە زێڕ هەڵبگرێت پاشان بیفرۆشێت بە کەمتر یان زیاتر لە نرخی رابوردووی، ئەوە نابێتە ئەو گەنجینەی کە لێمان قەدەغە کراوە ئەگەر هاتوو زەکاتە فەرزەکەی لێ بدات.

«اللجنة الدائمة»

١٥. فرۆشتنی زێڕ بە نرخێکی دواخراو (بە قەرز) یان بەشێك لە نرخەکەی دوا بخرێت.

دروست نیە زێڕ بفرۆشێت بەجۆرێك هەموو نرخەکەی یان هەندێکی دوا بخرێت، ئەگەر هاتوو پارەکە لە یەکێك دوو (نقد) ەکە بوو. جا چ کاتەکە زانراو دیاریکراو بێت یان زانراو دیاریکراو نەبێت جیاوازی نیە. وەئەگەر کڕین و فرۆشتنەکە کرا ئەوە بە تاڵەو گرێبەستەکە حەرامە. بکەری ئەم کارەش تاوانبارەو یەکێك لە گوناهە گەورەکانی کردووە، ئەویش گوناهی سوو خواردنە (الربا).

«اللجنة الدائمة»

١٦. وەرگرتنی پاداشت لە سەر دروستکردنی زێڕ.

ئەگەر هاتوو لە گەڵ نرخی فرۆشراوەکە بێت، هیچی تێدا نیە، کاتێك فرۆشرا بێت بە شتێك لە ڕەگەزی خۆی نەبێت، وەکو ئەوەی بە وەرەقەی نەقدی فرۆشرا بێت ،بەلاّم ئەگەر هاتوو فرۆشرا بێت بە ڕەگەزی خۆی وەکو زێڕ بە زێڕ لە گەڵ وەرگرتنی پاداشت ئەوە دروست نیە.

«اللجنة الدائمة»

## ❖ فرۆشتنی جل و بەرگی تەسکی ئافرەتان.

١٧. ئەوەی بۆی قەدەغەیە لەبەریبکات لە هەندێك حاڵەت، لە هەندێك حاڵەتیتر ئاسایە.

بۆ بازرگان هەیە بازرگانی پێ‌ی بکات وەکو ( جلوبەرگی کورت، کە دروستە بۆ پیاوی خۆی لەبەری بکات جگە لە کەسی دیکە) لەسەر ئافرەتەکەش پێویستە بەکاربێنێت بۆ حەلال نەك بۆ حەرام.

«اللجنة الدائمة»

١٨. ئەوەی لەبەر کردنی حەرام بێت لە هەموو حاڵەتێك

(ئەو جل و بەرگانەی کە لێکچوونی تێدایە بە پیاوان یان لێکچوونی تێدایە بە ئافرەتە کافرەکان) ئەوە نابێت لەبەر بکرێت و دروست نیە ،وە نابێت بازرگانی‌یان پێوە بکرێت و دروست نیە بۆ ئافرەت لەبەریان بکات.

«اللجنة الدائمة»

## ﴿ ئافرەتو وەڵامی جۆراو جۆر﴾

### ❖ (١٣٦) وەڵامی تێدایە.

١. دەنگی ئافرەت:

دەنگی ئافرەت خۆی عەورەت نیە، گوێبیستنی حەڕام نیە، مەگەر لە گفتو گۆ کردنیدا لارکردنەوەو ناسك بوون هەبێت، ئەوە لەم کاتە حەڕام دەبێ بۆ جگە لە پیاوەکەی، لەسەر پیاوەکانیتر حەڕامە ببیسترێت جگە لە مێردەکەی.

«اللجنة الدائمة»

٢. باڵدانەوەی ئافرەت لە گەڵ ئافرەت دروست نیە لە یەك بێخەف، لەبەر ئەو فەرموودە ( وفرقوا بينهما في المضاجع) واتە جیایان بکەنەوە لە خەوتنو پاڵدانەوە.

٣. گۆڤاری بەڕەڵاییو بێ ئابڕۆکان.

– وێنەی بێ شەرمو دڵڕفێن لە خۆی دەگرێت لەسەر بەرگی گۆڤارەکان.

– ئافرەتان بە هەموو جوانکاریەك خۆیان ڕازاندۆتەوە، بۆ ئەوەی ببنە گرفتو فیتنە.

- له خۆ گرتنی چیرۆکی خۆشەویستیو رۆمانسی سەرشۆرکەری هیچو بووچ.

- نیشاندانی جلوبەرگی نیمچە رووت بۆ ئافرەتی ئیماندار.

❖ وەڵام: دەرکردنی ئەو جۆرە گۆڤارانەو ئیش کردن تێیدا لە هەموو روویێك حەرامە، هەروەها برەوپاکندە بۆ کردنو کرینوفرۆشتنو بەدەست هێنانی حەرامە.

«اللجنة الدائمة»

٤. بۆ شوفێرو کەسانیتریش نیە لە گەڵ ئافرەتێك بە تەنیا بێت لە ناو ئوتومبێل چونکە ( بە تەنیا بوونی لە گەڵ پیاوانی نا مەحرەم حەرامە، جا جیاوازی نیە نێوان ئۆتۆمبێلو بازاڕو شوێنی بازرگانیو شوێنی تریش) بەلام ئەگەر هاتوو دوو ئافرەت بوون یان زیاتر هیچی تێدا نیە بە مەرجێك

- دڵنیا بێت لە شوێنەکە، وە لە سەفەردا نەبێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٥. ئەو کەسەی ( بەتەنیا بوونی (خەڵوەت)) پێ لادەچێت دەبێ گەورە بێت، هەبوونی تەنها منداڵێك بەس نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٦. سلاو کردنی پیاوێك لە ئافرەتێکی بێگانە بە قسە کردن هیچی تێدا نیە، بە مەرجی ئەوەی ئافرەتەکە بالاپۆش بێت، بەبێ

دوقه كردن بێت، تەنیا بوون (خەڵوەت)ی تێدا نە بێت ، بە بێ زەردەخەنە بێت.

«اللجنة الدائمة»

٧. مەرجەکانی ئیشی ئافرەت.

دەبێت لە دەوروبەرێك بێت هەموو ئافرەت بن، وەنابێت تێکەڵی لە گەڵ پیاوانی تێدا بێت، وە نابێت بە تەنیا بوونی (خەڵوەت)ی تێدا بێت لە گەڵ پیاوێکی بێگانە، بەڕێپێدانی پیاوەکەی بێت، وەدەبێت باڵاپۆشێکی شەرعی تەواو لەبەر بکات.

«اللجنة الدائمة»

٨. مەرجەکانی هەبوونی خزمەتکار:

دەبێت ئافرەتەکە موسڵمان بێتو دەستگرتوو بێت بە شەرع، بۆیە دەبێت باڵاپۆشینێکی ڕێكو پێكو تەواو بپۆشێت لەو پیاوانەی کە لە ماڵەوە هەن. وەنابێت سفور بێتو جوانیەکانی خۆی دەربخات. وە حەڕامە لەسەر خاوەن ماڵەکە بە تەنیا بێت لە گەڵی، وەدەبێت بە لە گەڵ بوونی مەحرەم لای ئامادە بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩. دروست نیە بۆ ئافرەت بەبێ مەحرەمەکەی گەشت بکات بە فڕۆکە، لە گەڵ هەبوونی ئارامیو دڵنیاییش.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٠. ئەو کچەی لە کەش‌و هەوایەك‌و دەوربەرێك دەژی پڕیەتی لە خەراپەو گوناهـ : واجبە لەسەری بەرەنگاری خەراپەکان‌و گوناهەکان ببێتەوە بە پێی توانای، بە قسەو گوفتاری جوان‌و نەرم‌و نیان، وەنابێت لە گوناهەکانیان بە شداریان بکات، وە دەبێ لێیان جیا ببێتەوە بە پێی توانای

«الشيخ إبن باز»

١١. واز هێنان لە ئامۆژگاری کردنی خەڵکی لە ترسی ریابازی ئەو کارە لەو فرفێڵانەی شەیتانە کە خەڵکی پێ سارد دەکاتەوە لە بانگەوازی کردن بۆ خوا، وەدروست نیە بۆ ئافرەتی ئیماندار واز لە شتێك بێنێت کە خوا لەسەری فەرز کردووە لەبەر ریابازی.

«الشيخ إبن باز»

١٢. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووەیەتی ( لا طاعة لمخلوق لمعصية الخالق)واتە هیچ گوێرایەڵێك نیە بۆ هیچ دروستکراوێك بۆ سەرپێچی کردنی دروستکار، جا چ ئەو دروستکراوە باوك بێت یان دایك بێت یان کەسیتر بێت.

«الشيخ إبن باز»

١٣. هەندێك دوعاو پاڕانەوە هەیە بۆ پیاوان ئایا ئافرەتانیش بیڵێن؟

وەکو (اللهم إنی عبدك ابن عبدك ابن امتك ناصیتی بیدك .....) بڕیارِ دان لەسەر ئەو شتە فراوانی تێدایە إن شاءالله ، وە چاکتر وایە بلێی ( اللهم إنی أمتك ابنة أمتك.....) ئەگەر چی بەو دەقەی کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، ئەگەر پاراوە هیچ زیانی نیە إن شاءالله، چونکە ئەویش بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا.

«الشيخ إبن باز»

١٤. ئافرەتان دەچنە ژێر فەرموودەی حەوت کەسەکەی کە خوا بە سێبەرەکەی سێبەریان لێ دەکات، لەو ڕۆژەی هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری ئەو نەبێت، بەلام تەنها پێشەوایەتی و ئەمارەت نەبێت چونکە لە تایبەتمەندیەکانی پیاوە، وەهەروەها نوێژی بە کۆمەڵ تایبەتە بە پیاوان، وەنوێژی ئافرەتان لە ماڵەوە چاکترە بۆیان.

«الشيخ إبن باز»

١٥. ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت ناوە لە پاراستنی مافەکانی و بەرز ڕاگرتنی کارەکانی، کردویەتیە هاوبەشی پیاوان لە میرات، ڕوخسەت خواستنیشی واجب کردووە لە مارە کردن، وەڕفتارکردنی ڕەهای بۆ دانراوە لە پارەکانی ئەگەر تەواو هۆشمەند بێت. وەمافی زۆری لەسەر پیاوەکەی بۆی واجب کردوە، وەبالاپۆشینیشی بۆ واجب کردووە لەبەر تەماشا نەکردنی

بێگانـان، نـەوەك ببێتـە كاڵایـەكی بـێ نـرخ هـەموو كەسێك پـێی ڕابوێرێت، جگە لەوانە چەندەها جۆریتری ڕێز لێنانی لێناوە.

«الشیخ إبن باز»

١٦. دوقە كردنی ئافرەتی بە ساڵا چوو لە دوای عەبایەك.

دروست نیـە بـۆ جگـە لـە مەحرەمـەكانی دوقـەی لـە گـەڵ بكـەن، ئەگەرچی دەستەوانەشی لـە دەسـت بێـت، وە لـە دوای پـەردەش بێت، چونكە هەر بـە دۆقـە كـردن دادەنرێـت، لەبـەر كـۆی گـشتی بەڵگەكان و ڕێگەگرتن لە خەراپەكاری.

«الشیخ إبن باز»

١٧. سەیركردنی ئافرەت بۆ پیاو لە ڕێگای تەلەفزیۆن.

واچاكترە بـۆ ئافرەتـان كـە پیـاوان نـەبینن و نـەبینرێن. وەهـیچ جیاوازییـەك نیـە ئەگـەر لـە زۆرانبـازی یـان لـە تـۆپی پـێ یـان لـە فلیمەكان و شتیتر بێـت. چونكە ئافرەت خۆڕاگرتنی بێ هێزە، وە زۆر جـار لـە سـەیركردنێك شـەهوەتەكەی دەوروژێـت و دووچـاری گرفت و ئاشوب دەبێت. جا دوور كەوتنەوە لە هۆكارەكانی خەراپە نزیكترە لە سەلامەت بوونت.

«الشیخ إبن جبرین»

١٨. دروست نیە بۆ ئافرەت سەیری وێنەی ڕووتی ئافرەت بكات لە گۆڤارەكان. «الشیخ إبن جبرین»

١٩. جەژنی دایك.

ئاهەنگ گێڕان بەو بۆنەیە دروست نیە. وە بۆ هیچ بۆنەیەکیتریش دروست نیە لەو جەژنانەی کە داهێنەرەکان (مبتدعە) دایان هێناوە.

«اللجنة الدائمة»

٢٠. ئافرەتان زۆرینەی خەڵکی ئاگرن.

چونکە ئافرەتان زۆر نەفرەت دەکەنو، تانو تەشەرو جنێو دەدەن، بێ ئەمەکنو سپلەن بەرامبەر مێردیان.

٢١. مەبەست لە کەمی عەقلودینیان.

– کەمی عەقل : لەرووی بێ هێزیو لاوازی لەبەر کردنی، وەشایەت دانەکەی دەبێ بە شایەتدانی ئافرەتێکیتر پشگیر بکرێت، ئەویش بۆ رێكو پێکردنی شایەتدانەکەیە.

– کەمی دین: چونکە لە کاتی حەیزو نیفاس واز لە نوێژو رۆژوو دێنێتو نوێژەکە قەزا ناکاتەوەو ناگێڕێتەوە، بەڵام رۆژووەکان دەگێڕێتەوە. جا کەمی دین لێرە هاتووە.

«الشيخ إبن باز»

❖ **ئاگەداری: بە بوونی ئەم کەمو کوڕیە ایمانی ناگیرێت، چونکە ئەم کەمو کوڕیە بە شەرعی خوای گەورە روویداوەو بووە.**

«الشيخ إبن باز»

٢٢. ئەوەش کەمی عەقڵو دینی ناگەینێت لە هەموو شتێك، وە ئەوەش ناگەینێت کە ئەو خوارووی پیاوە لە هەموو شتێك، وە پیاو لە هەموو شتێك لەو باشتر بێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٣. دروست نیەو نابێ پیاوی ئیماندار لە هەموو شتێك کەمو کوڕیو لاوازی دینداری بداتە پاڵ ئافرەت، بەڵکو دەبێت فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بە چاکترینو جوانترین شێوە بەکار بێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٤. سەیرکردنی تەلەفزیۆن.

ئامۆژگاریتان دەکەم کە نەیبەرنەوە ماڵی خۆتان، بەڵام ئەگەر تەماشاکەرەکە توانای هەبوو سوود لە خێرەکەی ببینێتو سەرینەکێشێت بۆ شەڕ، ئەوە لە بەکار هێنانی هیچ لاریەك نیە، گوێبیستی شتی چاك بێتو لە شتی خەراپ دووربکەوێتەوە وەکو (گۆرانیەکان، زنجیرەکان، فلیمەکان) بەڵام زۆر جاری وا هەیە هەندێ: شت سەردەکێشێت بۆ هەندێکیتر.

٢٥. مرۆڤ "مسیر"ە و "مخیر"ە.

"مسیر" ە بەپێی ئەوەی لە قەدەری خوا رابوردووە، خوای گەورە چارەنووسی هەموو شتێکی داناوەو بڕیاری داوە چ

ڕوودەدات لە بوونەوەر پێش دروستکردنی ئاسمان‌و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ.

وەهەروەها " مخیر"ە لە ڕووی ئەو عەقڵ‌و ویست‌و هەڵبژاردنەی کە خوا پێی داوە، ئەو سەرپشك کراوە دەتوانێت کاری چاك یان خەراپ بکات.

«الشیخ إبن باز»

٢٦. ئەو شتەی دروستە بکرێتە دیاری بۆ مردوو.

بەخشینی پارەو دوعاو پاڕانەوەو قەرز دانەوەو حەج‌و عومرە، ئەو کردەوانە لە شەرعدا هاتووە.

«الشیخ إبن باز»

٢٧. ئەو شتانەی دروست نیە بۆ مردوو بنێردرێت.

نوێژو تەواف‌و خوێندنی قورئان، چاکتر وایە نەکرێت لە بەر نەبوونی هیچ بەڵگەیەك لەسەری، وەهەندێك لە زانایەکان دروستیان کردووە لەبەر ئەوەی لە گەڵ بەخشین‌و دوعا بەراوردیان کردووە، بەڵام باشتر وایە نەکرێت.

«الشیخ إبن باز»

٢٨. ئایا دروستە بۆ کەسێك پارە ببەخشێت بۆ دایك‌و باوکی‌و ئەوانیش زیندوو بن.

دروسته، تەنها نیەتی دڵی بەسە، بەڵام ئەگەر دەریببڕێتو بڵێت: خوایە گیان ئەو پارە بەخشینەم لێ وەرگرە لە جیاتی دایكو باوکم ئەوە هیچی تێدا نیەو ئاسایە.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٩. یاد کردنی خوا بەدڵ شەرعیە لە هەموو شوێنێكو کاتێك، لە گەرماوو شوێنی دیکەش، بەڵام ئەوەی ناپەسند بێت ئەوەیە لە گەرماوو هاوشێوەکانی ناوی خوا دەربېڕێت بەدەم، لەبەر گەورەیی‌و پاكو بێگەردی خوا.

«الشيخ إبن باز»

٣٠. حوکمی پاشملە باسکردن، ئەگەر لە کەسەکە قسە گوتراوەکە هەبوو؟

پاشملە باسکردن حەڕامەو لە گوناهە گەورەکانە، جا چ عەیبو کەمو کوڕیەکە لە کەسەکە هەبوو یان نەبوو، لە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار کرا لەسەر پاشملە باسکردن، گوتی باسکردنی برایەکەتە بەو شتەی کە پێی ناخۆشە.

«الشيخ إبن باز»

٣١. کۆڕەکانی پاشملە باسکردنو بۆختان هەڵبەستن.

پێویـستە لەسـەر ئـافرەت ئینكـاری خەراپەكـە بكـات، ئەگـەر گوێرایەڵ كرا، ئەگەر نا لەسەری واجبە شوێنەكە بەجێ بێڵێتو لە گەڵیان دانەنیشێت.

«الشیخ إبن باز»

٣٢. كفارەتی پاشملە باسكردن.

داوای لێبوردن لـەو كەسـە بكـەی كـە باسـت كـردووە، وەداوای لێ بكەی كە چاوپۆشیت لێ بكات، بەڵام ئەگەر ترسـا لـەوەی كـە پـێ گووتنەوەی خەراپەیەكی گـەورەتری لێ دەكەوێتـەوە، ئـەوە داوای لێخۆشبوون بۆ كردنی بەسە، وەبە چاكە باسـی بكـاتو بەسـەریدا هەڵبڵێت بەو شتە باشانەی كە تێیدایە.

٣٣. پەند لەم چیرۆكە وەربگرە.

ڕیوایـەت كـراوە كـە ئـافرەتێكی پـیر زۆر باسـی ناموسـی خـەڵكی دەكردو بە پاشملە باسییانی دەكردو گۆشتی ئەوانی دەخوارد، لە كاتی سەرەمەرگدا كوڕەكەی لە تەنیشت سەری ڕاوەستاو ووشەی شایەتمانی بە یاد دەهێناوە ، ئافرەتەكە وەڵامی كوڕەكـەی داوە، دوای ئـەوەی چـەندەها جـار كوڕەكـەی شـایەتمانەكەی دووبـارە دەكردەوە، ئافرەتەكە گوتی: سوێند بەخوا كوڕەكەم ئەو ووشـانە زۆر لەسەرم گرانترە لە شاخە پتەوو چەسپاوەكان، لاحول ولا قوة إلا باللە.

«الشيخ إبن فوزان»

٣٤. نووسینی بسم الله لەسەر کارتەکان، شەرعیەو دروستە.

وە ئەوەی ئەو کارتانە وەردەگرێت کە ناوی خوای تێدایە یان ئایەتێکی تێدایە نابێت فرێ بداتە ناو تەنەکەی خۆڵەکە (مزبلة)

«الشيخ إبن باز»

٣٥. بەکارهێنانی رۆژنامەکان وەکو سفرەیەك بۆ نان خواردن.

دروست نیە، یان بکرێتە لوولەیەك بۆ پێداویستیەکانت، ئەگەر هاتوو شتێك لە ئایەتەکان، یان باسی خوای تێدا بێت.

«الشيخ إبن باز»

٣٦. رێگای هەڵس و کەوت کردنت لە گەڵ ئەو رۆژنامانەی کە ئایەتی تێدایە، ئەوەی پێویستە بیپارێزیت و ئەوەی پێویستت پێی نیە بسوتێنرێت یان لە شوێنێك ژێر خاك بکرێت و دوور بێت لە رێگاو هاتوو چووکردنی خەڵك.

«اللجنة الدائمة»

٣٧. ئەگەرنا بخرێتە ناو تورەگەیەك و ببسترێت و جیا بکرێتەوە لە پاشماوەکانیتری ماڵ.

«الشيخ إبن عثيمين»

٣٨. گوێبیستنی ئەو پرگرامە بەسوودانەی کە ناوە ناوە مۆسیقای لە گەڵە.

هیچی تێدا نیە لەگەڵ قوفل دانی دەنگی ئێزگەکە لە گەڵ دەستپێکردنی مۆسیقایەکە هەتاکو کۆتایی دێت.

«الشیخ إبن باز»

## ❖ نوکتەو (گاڵتەو کەپ) کردن باسەکە درێژەی تێدا هەیە.

٣٩. ئەگەر هاتوو هەق بوو، ڕاست بوو هیچی تێدا نیە، بێ گومان نابێت زێدەڕەوی تێدا بکەی‌و زۆر ئەنجامی بدەی، پێغەمبەری خواش(ﷺ) گاڵتەی دەکرد، بەلام ئەوەی هەق نەبا نەیدەگووت.

٤٠. بەلام ئەگەر هاتوو درۆی تێدا بوو ئەوە دروست نیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( ویل للذي یحدث فیكذب ویضحك به القوم)) رواه أبو داود واتە شین‌و ڕۆ ڕۆ یان سزای وەیل بۆ کەسێك باس‌و خواسێك دەگێڕێتەوەو درۆی تێدا دەکات بۆ ئەوەی خەڵك پێی پێبکەنن. «الشیخ إبن باز»

٤١. بیرکردنەوە لە حەرام بەبێ ئەوەی ئەنجامی بدەی.

ئەو بیرکردنەوە خەراپانەی کە دەکەوێتە ناو دەروونی مرۆڤ بەلام هیچیان ئەنجام نادات‌و نایان کات، ئەوە چاوپۆشی لێ دەکرێت‌و هیچ گوناهی پێ ناگات.

«الشيخ إبن باز»

### ❖ قسه كردن‌و مشت‌و مڕ له‌سه‌ر بابه‌تێك (مجامله) درێژه‌ی تێدایه‌.

٤٢. ئه‌گه‌ر ئینكاری كردنی هه‌ق‌و ڕاستی تێدا بێت، سه‌لماندنی چه‌وتی‌و به‌تاڵی لێبكه‌وێته‌وه ئه‌وه دروست نیه‌.

٤٣. به‌لاّم ئه‌گه‌ر ئه‌و شتانه‌ی هیچ لێنه‌كه‌وته‌وه، به‌ڵكو چه‌ند ووشه‌یه‌كی جوان بوو، ماف فه‌وتانی هیچ كه‌سێكی تێدا نه‌بێت، وا بزانم هیچی تێدا نیه‌.

«الشيخ إبن باز»

٤٤. گوناهه‌كان هۆكاره بۆ نه‌مانی به‌ره‌كه‌ت.

وه هۆكارێكه بۆ توڕه‌یی خواو گرتنه‌وه‌ی باران‌و زاڵبوونی دوژمنان. پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی (( إن العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه)) واته به‌نده بێ به‌ش ده‌كرێت له ڕزق‌و ڕۆزی به هۆی گوناهێك كه ئه‌نجامی ده‌دات.

وه پێویسته له‌سه‌ر ئافره‌ت ئاگه‌داری خۆی بێت له گوناهه‌كان‌و ته‌وبه بكات‌و په‌شیمان ببێته‌وه له‌و گوناهانه‌ی ڕابوردووه له گه‌ڵ گومانی باشی به‌خوا .

«الشيخ إبن باز»

❖ سەر بڕینی ئاژەڵ لەکاتی کۆتایی هاتنی خانوو: درێژەی تێدایە.

٤٥. ئەگەر مەبەستەکەی پێی خۆ پاراستن بێت لە جنۆکە، یان سەلامەت بێت لە خەراپە ئەوە دروست نیە.

٤٦. وەئەگەر لە قالبی سوپاسگوزاری بێت لەسەر ئەو بەخششەو نیعمەتەی خوا داویەتی، خزمو نزیکەکانیو دراوسێیەکانی کۆ بکاتەوە هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن باز»

٤٧. جامو قاپی زێڕو زیو.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((الذي يأكل ويشرب في إناي الذهب والفضة إنما يجرجر في بطنه نار جهنم)) رواه مسلم. واتە ئەوەی لە جامی زیرزیو دەخواتو دەخواتەوە ئەوە بێ گومان غەرغەرەی بە ئاگر کردووە لە سکی.

وەقەدەغە کردنەکەی گشتگیرە: ئەو شتانەش لە خۆ دەگرێت کە بە زێڕو زیو بۆیە کراوە، بۆیە بەکار هێنانی شتی بچوکیش هەر دروست نیە وەکو هەموو جۆرە کوپەکان، کوپەکانی چاوو گەوچك بەکارهێنانیان دروست نیە.

«الشيخ إبن باز»

٤٨. گریان بە هۆی نەخۆشیو باسکردنی لە لای کەسانیتر.

هیچ گوناهی لەسەر نیە ئەگەر هاتوو تەنها فرمێسکی چاو بێت نەك بە دەنگ بێت، لە گەڵ سوپاسکردنی خواو شوکرانەکردنی، وەداوای لێبوردنوخۆڕاگرتنو ئارامی لیّ بکەیو بە تەمای پاداشتی بیت.

**«الشيخ إبن باز»**

٤٩. کۆ کردنەوەی وێنە بە مەبەستی یادگاری.

دروست نیە ( مەبەستم وێنەی خاوەن گیانە) لە وێنەی مرۆڤەکانو ئاژەڵەکان، بەڵکو دەبێت لەناو ببرێت. بەڵام وێنەی بێ گیانەکان وەکو شاخو دارو هاوشێوەی هیچی تێدا نیە.

**«الشيخ إبن باز»**

٥٠. هەڵواسینی وێنە.

دروست نیە، ئەگەر هاتوو ( وێنەکانی هی خاوەن گیان بوو)

**«الشيخ إبن باز»**

٥١. نووسین لەسەر قەبرەکان.

دروست نیە جا چ ئایاتی قورئانی بێت یان شتیتر بێت، جیاوازی نیە، وە چ لەسەر تابلۆ بێت یان لەسەر شتیتر جیاوازی نیە.

**«الشيخ إبن باز»**

٥٢. شەوی نیوەی شەعبان

هیچ فەرموودەیەکی دروستی لەسەر نیە، ئەو شەوە هیچ تایبەتمەندیەکی نیە، نەبەخوێندنی قورئان نە بەنوێژێکی تایبەت، هەموو ئەو فەرموودانەی لەسەری هاتووە لاوازن.

«الشيخ إبن باز»

٥٣. هۆیەکانی بە هێزی ئیمان.

– خوێندنی قورئان‌و وورد بوونەوەو لێکۆڵینەوەی.

– لێکۆڵینەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) زانینی ووردەکاری شەریعەت.

– هەست کردن بە چاودێری کردنی خوا، هەست کردنی دڵ بە گەورەییەکەی.

– تێکەڵ بوون لە گەڵ پیاو چاکەکان‌و دوورکەوتنەوە لە خەراپکاران.

«اللجنة الدائمة»

٥٤. چۆن مرۆڤ سەلامەت دەبێت لە زیانەکانی جنۆکەو شەڕو شۆڕیان.

– زۆر یادکردنی خوا لە هەموو حاڵەتێك.

– بەردەوام بوون لەسەر یادەکانی بەیانیان‌و ئێواران پێش نووستن.

– دوور کەوتنەوە لە گوناهەکان، کردنی واجبەکان.

«اللجنة الدائمة»

٥٥. دابین کردن یان دڵنیایی کردن (التأمین)

دروست نیه، نه بۆ ئۆتۆمبێل، نه بۆ تەندروستی، نه بۆ ژیان، نه بۆ کەلوپەلەکان، لەبەر ئەو غرورییەی کە تێدایە. ئیماندار پارەیەکی کەم دەدات زۆر وەردەگرێت، لەوانەشە هیچ وەرنەگرێت، وەلەوانەشە کۆمپانیایەکە پارەیەکی زۆر، زیانی لێ بکەوێت.

«الشیخ إبن باز»

٥٦. دوعا کردن بۆ تەمەن درێژی.

هیچی تێدا نیه، بەڵام چاکتر وایە پەیوەستی بکات بە شتێك، سوودی بۆ دوعا بۆ کراوەکە هەبێت، وەکو ئەوەی بڵێت خوا تەمەن درێژی بکات لەسەر گوێرایەڵ کردنی.

وەدیاریشە کە دوعا پێچەوانە نیە لە گەڵ قەدەری خوا، بەڵکو خۆی قەدەری خوایە، وەهەموو ئەو هۆکارانەی کە پێچەوانەی شەرع نیە، هەمووی لە قەدەری خوایە. «الشیخ إبن باز»

٥٧. مۆمیا کردنی ئاژەڵو باڵندەکان دروست نیه.

- وە هۆکارێکە بۆ هەڵواسینی وێنەی گیاندارەکان.

-چونکە زایەع کردنی پارەو دەستبلاوی تێدایە لە خەرجی مۆمیاکردنەکە، بێ گومان خواش دەستبلاوی لێمان قەدەغە کردووە.

«اللجنة الدائمة»

٥٨. خوێندنی سورەتی (یس) لە کاتی گیاندان و سەرەمەرگ.

فەرموودەکە لاوازە، تایبەت کردنی بۆ ئەو شتە دروست نیە.

«الشیخ إبن باز»

## ❖ هەڵوێست بەرامبەر بانکە سوو خۆرەکان.

٥٩. سوو یەکێکە لە هەرە گوناهە گەورەکان و قەدەغەکراوەکان.

خوای گەورە نەفرەتی لە سوو خۆر وەکیلەکەو نووسەرەکەو شاهێدەکانی...کردووە.....فەرموودەکە.

٦٠. ئەو قازانجانەی کە لە بانکەکەت وەرگرتووە بۆی مەگێڕەوەو مەشیخۆ، بەڵکو خەرجی بکە بۆ کاری چاك، وەکو بە خشینی بۆ فەقیرو هەژارەکان.

«الشیخ إبن باز»

٦١. شت سپاردن بە بانکە سوو خۆرەکان، دروست نیە ئەگەرچی بەبێ سوودیش بێت.

«الشیخ إبن باز»

٦٢. وەرگرتنی قەرزی بانك دروست نیە، ئەگەرچی قەرزەکە بۆ شتێکی چاکیش بێت وەکو ئەوەی بۆ کاری بیناسازی بێت، یان بۆ چارەسەکردن بێت، یان بۆ هاوسەرگیری بێت، یان بۆ قەرزدانەوە.

«الشیخ إبن باز»

٦٣. حوکمی ئەو قسەیە چیە؟ ئەتوو شایەن نەبووی تووشی ئەم نەخۆشیە بیت، بۆ یەکێك کە سەردانی نەخۆشێك دەکات.

ئەو زاراوەیە دروست نیە چونکە ڕەخنە گرتنە، لە کاری خوای گەورە، خوای گەورەش خۆی شارەزاترە بە حاڵی بەندەکانی، بەڵام ئەوە شەرعیە بڵێت (( لا بأس طهور إن شاءالله))

«الشیخ إبن باز»

٦٤. گوڵ کردنە دیاری بۆ نەخۆش.

دروست نیە، لەبەر ئەوەی دەستبڵاویەو زایەع کردنی پارەی تێیدایە بەبێ هەق، وەلێك چوونیشی تێدایە لە گەڵ دوژمنانی خوا لەو کارەدا.

«اللجنة الدائمة»

٦٥. مەرجەکانی چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ بازاڕ.

- پابەند بوون بە باڵا پۆشینی شەرعی تەواو
- دوورکەوتنەوە لە تێکەڵبوونی پیاوان.
- پابەند بوون بە ئادابە شەرعیەکان.

- مۆڵەت وەرگرتنی پیاوەکەی.

«اللجنة الدائمة»

٦٦. حوکمی هاتن‌و چوونی بەردەوام بۆ بازاڕەکان بۆ زانینی شت‌و مەك‌و کاڵای نوێ.

زانینی کاڵای نوێ پێویستیەك نیە چوونە دەرەوەی لە ماڵەوە دروست بکات، ترسناکیەکە زۆر گەورەیە بە تایبەتی لەو زەمانەی کە خەراپەی تێدا زۆر بووە. وەئەوەی داوا کراوە لە ئافرەت مانەوەیە لە ماڵەکەی، هەڵسانیەتی بە کارەکانی ناو ماڵی ، وە بۆ پێویستیشی نەبێت نەچێتە دەرەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

٦٧. مەرج نیە لە گەڵ ئافرەت مەحرەم هەبێت بۆ چوونە دەرەوەی بۆ بازاڕ، مەگەر ترسی گرفت‌و ئاشوبی هەبێت، لەم حاڵەتە پێویستە لەسەری نەچێتە دەرەوە مەگەر لە گەڵ مەحرەمەکەی نەبێت بۆ پاراستن‌و پارێزگاری لێ کردنی، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)ئافرەتەکان دەچوونە دەرەوە بۆ بازاڕ بەبێ مەحرەم.

«الشيخ إبن عثيمين»

٦٨. پشتکردن لە موسڵمان

حەرامە لەسەر موسڵمان پشت لەبرایەکەی بکاتو قسەی لە گەڵ نەکات بەبێ هۆکارێکی ئاینی، وەگوێرایەڵی باوكو کەسانیتر ناکرێت بۆ پشت لە موسڵمان.

«الشيخ إبن جبرين»

٦٩. خوێندنەوەی دوعا لە کاغەز.

هیچ لاریەك نیە، ئەگەر هاتوو لەبەری نەبێت، بەڵام ئەگەر بۆی کرا لەبەری بکاتو بەترس بیخوێنێتەوە لەگەڵ ئامادە بوونی دڵی، ئەوە چاکترە

❖ بەڵام لە کاتی نوێژدا : چاکتر وایە بە ئەزبەر بیخوێنێتو دوعایەکانیش کورتو پوخت بێت، وەئەگەر لە کاغەزێکیش بیخوێنیتەوە هیچ گوناه نیە.

«الشيخ إبن باز»

٧٠. (( النساء شقائق الرجال))

فەرموودەکە دروستە أبو داود ڕیوایەتی کردووە واتاکەشی – خوا چاکتر دەزانێ– ئافرەتان وەکو پیاوانن لە مافەکانو ئەركو واجبات، مەگەر لەو شتانە نەبێت کە دانەری شەرع (خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ) دایاننناوە وەکو میراتو شایەت دانو شتیتر لەو شتانەی کە بۆمان هاتووە. «الشيخ إبن باز»

٧١.   ڕێگای گەڕانەوە بۆ لای خواو تەوبە کردن.

تەوبە گەڕانەوەیە لەسەرپێچی خوا بۆ گوێڕایەڵی کردنی.

مەرجەکانی.

- دڵسۆزیو خۆیەکلایی کردنەوەی بۆ خوای گەورە: بەوەی کە تەنها مەبەستی زاتی خوای گەورە بێتو پاداشتەکەیو ڕزگار بوون بێت لە سزایەکەی.

- پەشیمان بوونەوە لە ئەنجام دانی گوناهەکان، بەشێوەیەك کە غەم بخوات لەسەر کردەوەکانیو خوزگە بخوازێت کە گوناهەکانی نەکردبایە.

- ڕاستەو خۆ دەستبەردابوونی گوناهەکەبێت: وەئەگەر مافەکە پەیوەندی بە دروستکراوەکانی خوا هەبوو، بە پەلە گەردەنی خۆی پێیان ئازاد بکات بەوەی شتەکەیان بۆ بگەڕێنێتەوە، یان داوای چاوپۆشییان لێ بکاتو گەردەنی خۆی پێیان ئازاد بکات.

-سوور بوونو بڕیاردان لەسەر نەگەڕانەوە بۆ گوناهەکە لە ڕۆژانی داهاتوو.   «الشیخ إبن عثیمین»

٧٢.   حوکمی ئەو کەسەی تەوبە دەکاتو پاشان دەگەڕێتەوە بۆ کردنی گوناهەکە.

ئەگەر تەوبەکەی ڕاستو دروست بوو بڕیاڕی دابوو نەگەڕێتەوە سەر گوناهەکە، ئەگەر جارێکی تر گەڕایەوە سەر گوناهەکە، ئەوە تەوبەکەی نافەوتێت، بەڵکو تەوبەکەی یەکەمی دروستە، وەئەگەر چەندەها جاریتر گوناه بکاتو تەوبە بکات خوا تەوبەی لێ وەردەگرێت.

٧٣. خوێندنی بورجەکانو ناو لەپو فنجانە.

هەموو ئەو شتانە بەشێکە لە جادوو فرۆفێلو تەڵەکەبازی، وە جۆرێکە لە جادوو کردنو لاف لێدانی زانینی پەنهانو هەڵخەڵەتاندنی خەڵكو تێکدانی عەقڵیان.

«الشيخ إبن فوزان»

٧٤. مەبەست لەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ((إن المرء خلقت من ضلع أعوج )) واتە ئافرەت لەپەراسوێکی خوار دروستکراوە، مەبەست لە ( خواری) یانی ئافرەت جۆرە خواریەکی تێدایە لە خووڕەوشتی وەکو پەراسوو، ئەوەی بیەوێت ڕاستی بکاتەوە ناتوانێت، مەگەر بە تەڵاق دانی نەبێت. بۆیە لەرووی شەرعەوە دەبێ پیاو خۆڕاگرو بە ئارام بێت، چاوپۆشی لە هەندێك خواریەکانی بکات، لە گەڵ ئەوەش بەردەوام ئامۆژگاریو ڕێنمایی بکات.

«اللجنة الدائمة»

٧٥. به ڕۆژوو بوون له مانگی ڕەجەب.

له پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ فەرموودەیەکی جێگیر نەبووە تایبەت بە گەورەیی و خێروپاداشتی ڕۆژوو لەمانگی رەجەب.

«اللجنة الدائمة»

٧٦. گاڵتەکردن بە باڵاپۆشی.

ئـەوەی گاڵتـە بـە ئـافرەتێکی موسـڵمان بکـات لەبـەر خـاتری دەستگرتنی بە شەریعەتی ئیسلام ئەوە کافرە.

«اللجنة الدائمة»

٧٧. ئەوەی پێی دەگوترێت ( ئازادی بیروبۆچوون)

ئەو شتە بە تاڵەو هیچ بنچینەیەکی نیە لە ئیسلام، بەڵکو ئـەوەی واجبە لەسەرمان شتی بەتاڵو پڕو پووچ قەدەغـە بکـەین بکرێـت، ڕێ بـە هـەق بـدرێت، وەدروسـت نیـە ڕوخـسەت بـە هـیچ کەسێك بـدرێت بانگـەوازی بـۆ شـوعیەتو بـت پەرسـتی بکـات....یـان بانگەوازی بۆ زیناو قومار یـان شـتیتر لـەم بابەتانـە بکـات، جـاچ بەشـێوازێکی ڕاسـتەوخۆ، یـان نـا ڕاسـتەوخۆ، بـەڵکو قەدەغـە دەکرێتو تەمێ دەکرێـت، بەڵکو ئەوە بـەڕەڵلاییو ناڕەواییـەکی حەرامە.

«الشيخ إبن باز»

٧٨. ئەوەی لە گۆڤارەكان بڵاو دەكرێتەوە لە باوەڕهێنان بە بورجەكان...

بورجەكان شوێنگەكانی خۆرن، لەو شوێنگانە باسی دوانزە بورج دەكەین،ئەویش بورجی كاوڕو بەران و بورجی مانگاو بورجی دووانە(جمك) ئەوانەش مانگە ئاساییەكانن، هیچ كەسێك جگە لە خوای گەورە نازانێت چی تێدا ڕوو دەدا، ئەوەی لافو كەزافی ئەوە لێبدات كە لە بورجی مانگا ئەو شتە ڕوو دەدات، یان لە بورجی دوو پشك ئەوە ڕوودەدات، ئەوە لەو كەسەیە كە وا پیشان دەدات زانستی نهێنیو پەنهان دەزانێ كە جگە لە خوا كەس نایزانێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٧٩. حوكمی گرەو كردنو (المراهنة).

ئەویش ئەوەیە دوو كەس لە شتێك بۆچوونی جیاوازیان هەبێت، یەكێكیان بڵێت ئەگەر كارەكە ئاوا بێت وەكو ئەوەی من دەڵێم، ئەوە لەسەرت پێویستە وابكەیو وابكەی لەو شتانەی كە خۆیان دایدەنێن، وەئەگەر كارەكە ئاوا بێت وەكو تۆ دەڵێی ئەوە لەسەرم پێویستە وا بكەمو وا بكەم لەو شتانەی كە دایدەنێن. ئەوەش حەرامە چونكە وەكو قومارە.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٠. خەراپترینی خەڵك دوو ڕووەكانن.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( تجدون شر الناس ذا الوجهين ، الذي يأتي هؤلاء بوجه و هؤلاء بوجه)) واتە خەراپترینی خەڵك دوو ڕووەكانن ئەوانەی بەڕوویێك دێنە لای خەڵكێكو بەڕوویێكیتر دێنە لای خەڵكیتر.

❖ واتاكەشی ئەوەیە كاتێك ڕووبەڕووی كەسێك دەبنەوە زۆر ستایشی بكاتو پێیدا هەڵبڵێت، لەبەر مەبەستێكی دونیایی، پاشان لە پاشملە زەمی بكاتو عەیبدارو لە كەداری بكات لە لای خەڵكی، ئیتر ئەوە كارو پیشەیانە لە گەڵ زۆربەی ئەو خەڵكەی لە گەڵیان ناگونجێن ، ئەوەش لە خەسڵەتی دوو ڕووەكانە.

«الشيخ إبن جبرين»

٨١. دەستپەڕ (العادة السرية):

دەستپەڕ، مەنی هێنانەوەیە بە دەست (دەستپەڕ) حەڕامەو زیانی گەورەی هەیە سزاكانی زۆر سەختە، هەروەك چۆن پزیشكەكانو زانایەكان فەرموویتیان، وەواجبە لەسەر بكەری ئەو كارە خۆی بشوات.

«الشيخ إبن باز»

٨٢. ئەو خزمانەی كە واجبە سیلە ڕەحمیان بكەی.

ئەو خزمە نزیکانەن لە لای دایكو باوکەوە، وە ئەوانیش مەبەستن لە فەرموودەی خوای گەورە (( وأولوا الأرحام بعضهم أولى ببعض في كتاب الله))

بەلاّم خزمە نزیکەکانی ئافرەتەکەت ئەو خزمو کەسانە نین کەسیلەی ڕەحمی واجب بێت، ئەگەر هاتوو لە خزمی خۆی نەبوو، بەلاّم دەبنە خزمو کەس‌وکار بۆ منداڵەکانی.

«الشيخ إبن باز»

٨٣. پێنج شت بۆ چاکەکردن لە گەڵ دایكو باوکی دوای مردنیان.

- دوعاو پاڕانەوە بۆیان.
- داوای لێبوردن بۆیان
- جێ بەجێ کردنی سپاردەو وەسیەتیان.
- ڕێز گرتنی دۆستو برادەریان.
- سەردانی ئەو خزمو کەس‌و کارانەی کە سیلەی ڕەحم جێ بەجێ ناکرێت مەگەر بەوان نەبێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٤. دایكو باوکم ئەو بژێوەی کە پەیدای دەکەن حەڕامە.

واجبە ئامۆژگاری بکرێت، ئەگەر نەکراو نەگونجا، بۆیان هەیە لێی بخۆن بەپێی پێویست، لەم حاڵەتە هیچ گوناهێکی لەسەر نیە،

بەڵام دروست نیە زیاتر لە پێویست ببەی، لەبەر هەبوونی گومان لە خۆراکی کەسێك کە بژێوی حەڕام بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٨٥. حوکمی وەڵامدانەوەی دەعوەتی کەسێکی ریباکار.

ئەگەر دەتزانی خۆراکی بانگەرەکە هەمووی حەڕامە وەکو ریباو شتیتر، ئەوە بۆت نیە وەڵامی بانگردنەکە بدەیەوە، لە خواردنەکەی بخۆی.

٨٦. بەڵام ئەگەر خواردنەکە تێکەڵ بوو لە حەڕامو شتیتر، وەنەتدەزانی ئەوە حەڕامە، خواردنی هیچی تێدا نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٨٧. موسڵمان بە موسڵمانێك بڵێت ( ئەی گەمژە، ئەی نەزان، ئەی شێت) ئەوەی شەرعی بێت دروستە بۆ ئیماندار ئاخاوتنو گفتو گۆ لە گەڵ برایەکانی بکات بە زاراوەی ڕێكو پێكو جوان، بەو ناوانەی کە ناو نرانە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی(( ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش والبذئ)). واتە ئیماندار تانەو تەشەر لێدەرو نەفرەتکارو بەدرەوشتو زمان پیس نیە.

«الشيخ إبن باز»

٨٨. دەستبڵاوی لە شتە خەراپەکانی ژیانە.

ئافرەتی ئیماندار دەبێت لە هەموو شتێك مام ناوەند بێت، بێ گومان خوای گەورە باس‌و خواسی دەستبڵاوەکانی بۆ باس کردوینە کە لە چ ئاستێك دانە وەکو دەفەرمووێت (( ولا تبذر تبذيرا إن المبذرين كانوا إخوان الشياطين وكان الشيطان لربه كفورا ))

واتە دەست بڵاویش مەبەو ماڵ‌و سامانت بە فیڕۆ مەدە. چونکە بە ڕاستی ئەوانەی ماڵ‌و سامانیان بە فیڕۆ دەدەن ( لە ڕێگای خەراپدا سەرف دەکەن)، ئەوانە هەمیشە وەك برای شەیتانەکان وان، شەیتانیش لە بەرامبەر (نازو نیعمەتەکانی) پەروەردگاریەوە زۆر ناشوکرو بەد نمەکە.

دەستبڵاوی خەرج کردنی پارەو پولە لە شوێنی نا دروستی خۆی، یان لە گوناهو تاوان یان لە شتیتری بێ سوود خەرجی دەکات، وەکو گەمەو گاڵتە کردنێك‌و بایەخ نەدانێك بە پارەو پول، پێغەمبەریش (ﷺ) قەدەغەمانی کردووە پارەو پولی خۆمان زایەع بکەین.

«الشيخ إبن باز»

٨٩. چوونە ناو گەرماو بە چەند کاغەزێك کە ناوی خوای لەسەر بێت.

دروستە مادەم شاراوە بێتو دیار نە بێت، وە زۆربەی ناوەکان لە ناوی خوا بێ بەش نین، وەکو عبدالله و هاوشێوەکان.

«الشيخ إبن عثيمين»

٩٠. لەبەر کردنی ئەو ملوانکەی کە ناوی خوای لەسەر نووسراوە: دروستە بەڵام لەبەر نەکرێ چاکترە، چونکە لەوانەیە بێ حورمەتیو بێ ڕێزی بەرامبەر بکرێت، وەدروست نیە ببرێتە گەرماو، مەگەر لە کاتی پێویست نەبێت، پێویستە لە کاتی خەوتنی لەبەری بکاتەوە نەوەك ئەو ناوە پیرۆزە بێ ڕێزو حورمەت بکرێت.

«الشيخ إبن جبرين»

## ❖ گۆشتە هاوردوەکان لە سێ حاڵەت بەدەر نیە.

٩١. ئەگەر بزانین کوژراوەتەوە بەڕێگای شەرعی ((ناوی خوای لەسەر هاتووە... )) ئەوە دروستە.

٩٢. ئەگەر زانیمان گوژراوەتەوە بە ڕێگایەکی نا شەرعی، ئەوە خواردنی دروست نیە.

٩٣. ئەگەر گومانمان هەبوو نەمانزانی، ئایا بە شێوەیەکی شەرعیو دروست کوژراوەتەوە یان نا، حوکم لەسەر ئەم جۆرە

کوژراوه حه‌ڵاڵه، وه‌له‌سه‌مان واجب نیه بپرسین‌و بگه‌ڕێین ئایا چۆن کوژراوه‌ته‌وه، وه‌ئایا ناوی خوایان له‌سه‌ر هێناوه یان نا .

«الشيخ إبن عثيمين»

## ❖ حوکمی جیلاتین

٩٤. ئه‌گه‌ر هاتوو له هه‌ندێك شتی حه‌ڕام گیرابۆوه، وه‌کو به‌راز یان به‌شێك له ئه‌ندامه‌کانی وه‌کو پێست‌و ئێسکه‌کانی،یان شتی‌تری هاوشێوه‌ی ئه‌وانه، ئه‌وه حه‌ڕامه.

٩٥. به‌ڵام ئه‌گه‌ر هیچ شتێکی حه‌ڕام نه‌چووبێته ناو پێکهاته‌ی ماده‌ی جیلاتین ئه‌وه هیچی تێدا نیه.

«اللجنة الدائمة»

٩٦. نیشته‌جێ بوونی ئافره‌ت له وڵاتێك (که وڵاتی خۆی نه‌بێت) به‌بێ مه‌حره‌م.

هیچی تێدا نیه، ئه‌گه‌ر هاتوو له‌و نیشته‌جێ بوونه‌ی هیچ مه‌ترسی تێدا نه‌بوو، بۆی وه‌ئیشکردنه‌که‌شی له‌ناو ئافره‌تان بێت‌و له پیاوان پارێزراو بێت، له‌و ئیشانه‌ش بێت که خوا ڕێی پێداوه.

«الشيخ إبن باز»

٩٧. تێکه‌ڵ بوونی پیاوان له‌گه‌ڵ ژنان به‌ هه‌نجه‌تی نیه‌ت پاکبوون.

دروست نیه، چونکه به هۆی ئەو کارە، خەراپەیەکی بێ سنووری لێدەکەوێتەوە،جا چ لەشوێنی کار کردن، بێت یان لە کۆبوونەوەی سەر سفرەی نان خواردن بێت، یان لە دانیشتنە خێزانیەکان.

«الشیخ إبن باز»

٩٨. گۆڕینەوەی پەیام (رسالە) لە نێوان دوو ڕەگەزەکە (کوڕو کچ).

ئەم کارە دروست نیە، چونکە شەهوە لە نێوان هەردووکیان دەوروژێنێت، ئەوەش پاڵنەرە بۆ خۆشەویستیو یەکتر بینینو پەیوەندی بەیەکەوە بەستن .

«الشیخ إبن جبرین»

٩٩. قسە کردن لە تەلەفۆن.

قسە کردن لە گەڵ ئافرەتی بێگانە دروست نیە، بە شێوەیەك کە شەهوەت بوروژێنێت، وەکو پێدا هەڵگوتنیو خۆ بە ناز کردنیو ناسك قسەکردنی،جاچ لە تەلەفۆن بێت یان لە شتیتر بێت.

❖ بەڵام قسەی حاڵاتی پێویستی لە ناکاو، هیچی تێدا نیە ئەگەر لە خەراپە دوور بێت (( بەڵام بە کوێرەی پێویست بێت))

«الشیخ إبن جبرین»

١٠٠. بەکارهێنانی (ألو) لە قسە کردنی تەلەفۆنی.

ئەو زاراوەیە لە فەڕەنسیەکان هاتووەو پەیدا بووە، زمانی عەرەبی ڕەتی دەکاتەوە، نابێت بە کاربهێنرێت.

«الشیخ بکر أبو زید »

١٠١. ئافرەتێك دەیەوێت قوربانی بکات.

بۆی دروستە قژی شانە بکات یان بیشوات، ئەگەر قژەکەی هەڵوەرا هیچی تێدا نیە، چونکە مەبەستەکە دەرنەهێنانی قژە بە ئەنقەست.

«الشیخ إبن جبرین»

١٠٢. کاتێك مرۆڤ سەری سوڕدەمینێت لە شتێك چی بکات؟

شەرعیە بۆ پیاوانو ئافرەتان کاتێك گوێ بیستی شتێك دەبن یان شتێك دەبینن کە پێیان خۆشە یان پێیان ناخۆشە: بڵێن (سبحان الله) و (الله أکبر) بەبێ چەپڵە لێدان، ئەوەش وەکو لاسایی کردنەوەیەکە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) چونکە کاتیك شتێکی سەرسوڕهێنەری ببینایە یان گوێبیستی شتێکی سەرسورهێنەر بوایە، دەیفەرموو ( سبحان الله) یان (الله أکبر) هەروەها ئەگەر شتێکی ناخۆشی ببینایە یان گوێ بیستی بووبایە هەمان شتی دەکرد.

«اللجنة الدائمة»

١٠٣. ئایا وێنه حەڕامە.

ئەگەر مەبەستت وێنەی دارو درەختو دەریاو ئەستێرەکان بێت، وەهاوشێوەی ئەوانە کە گیانیان تێدا نیە، کێشانی وێنەی ئەمانە دروستە. ئەگەر مەبەستت لە وێنە وێنەی، گیانلەبەرەکان بێت وەکو مرۆڤو حوشترو گوێ درێژو باڵندە....... وەهاوشێوەی ئەو شتانە، ئەوە حەڕامە.

«الشیخ إبن عثیمین»

١٠٤. پاراستنی ئەو کتێبو گۆڤارانەی کە وێنەی تێدایە.

هیچ لاریەك نیە لە پاراستنیان، ئەگەر چی هەندێك وێنەشی تێدا بێت بەلام ئەگەر هاتوو وێنەی ئافرەتی تێدا بێت واجبە بسرێتەوە. بەلام ئەگەر وێنەی پیاوان تێدا بوو سڕینەوەی سەری بەسە.

«الشیخ إبن باز»

١٠٥. حوکمی خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی کە سوودبەخشەو وێنەشی تێدایە؟

بۆت هەیە ئەو گۆڤارو رۆژنامە بە سوودانە بخوێنێتەوە، سوودی دینیو ئەدەبیو ئەخلاقی لێی ببینی، بەلام وێنەکان دەبێت بە مەرەکەبێك بسڕیەوە شوێنەوارەکەی نەهێڵی، یان وێنەی ڕووخسارەکەی بسڕیەوە، یان بەداپۆشراوی وازی لێ بینێت، یان

لە ناو سندوقێك، یان دۆلابێك بە داخراوی دابنرێت، وەئەگەر پێویستیش نەبێت بیسوتێنێت.

«الشیخ إبن جبرین»

١٠٦. ئایا بوونی پیاوو ژنێك بە یەكەوە بە تەنیایی لە مەصعەدی كارەبایی بە خەڵوەت دادەنرێت.

خەڵوەت: كۆ بوونەوەی ژنێكە لە گەڵ پیاوێك لە شوێنێك كە كەس نەیان بینێت، وە پێویستە لەسەر مرۆڤ دوور بێت لە شوێنی گومانو دڵەڕاوكێ.

«الشیخ إبن منیع»

١٠٧. ئەگەر خاوەن قەرزەكەی نەدۆزیەوە.

پێویستە لەسەرت زیاتر بە دوایدا بگەڕێ بە كوێرەی توانات. ئەگەر نەدۆزراوە پارەكە بكە خێرو صەدەقە بە ئومێدی ئەوەی پاداشتەكە بە خاوەن پارەكە بگات، ئەگەر دوای بەخشینەكە هات هەواڵی پێ بدە، كە پارەكەیت بەخشیوە، ئەگەر ڕازی بێت چاكە، ئەگەر ڕازی نەبوو دەبێ پارەكەی بۆ بگەڕێنیەوەو پاداشتی خۆت هەیە إن شاء الله.

«اللجنة الدائمة»

١٠٨. بەكار هێنانی ئاوازی مۆسیقی

دروست نیە بە كار بێت بۆ مۆبایلو ئامێری تری جگە لە مۆبایل.

«اللجنة الدائمة»

١٠٩. حوكمی وێنەی فۆتۆگرافی.

ڕای ڕاستو دروستر كە بەڵگە شەرعیەكان دەیسەلمێننو زۆربەی زانایەكانیش لەسەرن: بەڵگەكانی حەرامبوونی وێنەگرتنی گیانلەبەركان وێنەی فۆتۆگرافو دەستیش لە خۆی دەگرێت،ئەگەر تەندار بێت (مجسم) یان تەندار نەبێت، لەبەر كۆی گشتی بەڵگەكان.

«اللجنة الدائمة»

❖ **ئەو كەسەی چاوو زار ایێی داوە چۆن چارەسەر دەكرێن. چارەسەری شەرعی لە گەڵ بەكار دەهێنرێت.**

١١٠. خوێندنەوەی هەردوو سورەتی (الفلق) وە ( الناس) ئەو سورەتانە (آية الكرسي، الكافرون، الفاتحة، دوو ئایەتی كۆتایی البقره )

١١١. خۆشوشتن: چاولێدەرەكە دەستنوێژێك هەڵبگرێتو ئاوەكە بێنێت بەسەر چاو لێدراوەكە دابكرێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

❖ بەکار هێنانی ووشەی (حەڕام)

١١٢. ووشەکە بۆ شتێك بەکار بێنێت کە خوا حەڕامی کردووە، وەکو ئەوەی بلێن حەڕامە ئەو پیاوە تووشی زینا بێت، ئەگەر ئەو شتە بە حەڕام وەصف کرا ئەوە تەواوە.

١١٣. بەڵام ئەگەر شتەکە خۆی حەڕام نەبوو، ئەوە دروست نیە بە حەڕام وەصف بکرێت ئەگەر چی تەنها بە زاراوەش بێت چونکە حەڕامکردنی حەڵاڵەکان نیشان دەدات

«الشيخ إبن عثيمين»

١١٤. حوکمی صەدەقەو خێر بۆ خەڵکیتری نا موسڵمان.

دروستەو پاداشتی تێدایە ئەگەر هاتوو پێویستی پێ هەبوو، بەڵام شوێنی صەدەقەی واجب ( الزكاة) ناگرێتەوە، مەگەر لەو کەسانە بێت کە دڵەکانیان خەریکە نەرم دەبێتو هۆگری ئیسلامەتی دەبن.

❖ **خێر کردن پێیان مەرجی ئەوەی هەیە: لەو کەسانە نەبن کەشەڕ لە گەڵ موسڵمانان دەکەن.**

«الشيخ إبن عثيمين»

١١٥. حوکمی بەتاڵ کردنەوەی جادوو بە جادوو.

جادوو لە گەورەترین قەدەغەکراوەکانە، بەڵکو کوفرە ئەگەر جادووکەرەکە داوای یارمەتی لە شەیتانەکان بکات بۆ جادووەکەی.

❖ **بە تاڵ کردنەوەی جادووی جادووکەر دابەش دەکرێتە دووبەش.**

١١٦. بە دوعاو پاڕانەوەی ڕێپێدارو قورئان بێت، ئەوە دروستەو هیچی تێدا نیە.

١١٧. بە تاڵ کردنەوەی جادووەکەی بە جادووێکیتر بێت، ئەوە دروست نیە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١١٨. ئایا جادوو هەقیقەتی هەیە؟

بەڵێ هەقیقەتی هەیە. جادووکەرەکان لە شەیتانەکان دەترسن و گوێڕایەڵیان دەکەن. خوای گەورەش هەندێك توانای داوەتە شەیتانەکان کە دەتوانن کردەوەی سەیرو سەمەرە بکەن.

«الشيخ إبن جبرين»

١١٩. دڵە ڕاوکێی دەروونی بەو نوشتەو مووروانە چارەسەر ناکرێت، کە بە گەردەن هەڵدەواسرێت بە ئومێدی ئەوەی کە سوودێك بێنێت یان زیانێك دوور بخات. بەڵکو چارەسەرکردنەی بە:

- به قورئانی پیرۆزو بەو دوعایانەی کە بۆمان هاتووە دەبێت.
- زۆر یاد کردنی خواو کردنی کردەوەی چاك.
- دوور کەوتنەوە لە گوناهو تاوانو خەڵکی تاوانکار.

هەموو ئەو شتانە دڵنیاییو ئارامیو ژیانێکی خۆش فەراهەم دێنێت. «الشیخ إبن جبرین»

١٢٠. حوکمی جگەر کێشان.

دروست نیە لەبەر ئەو زیانە گەورانەی کە تێدایە.

«الشیخ إبن باز»

١٢١. ئاهەنگ گێران بە بۆنەی چەژنی خۆشەویستی.

دروست نیە، چونکە جەژنێکی داهێنراوە، لەشەریعەتی خوا هیچ بنچینەیەکی نیە، وەلەبەر ئەوەی بانگەوازی بۆ عەشقایەتیو خۆشەویستی دەکات.

❖ **وە پێویستە لەسەر موسڵمان شانازی بە ئایینەکەی بکاتو بە دوای هەموو کەسێکی نەزان نەکەوێت.**

«الشیخ إبن عثیمین»

١٢٢. پێناسەی ریا.

ریا ئەوەیە مرۆڤ کاری چاك بکات، بۆ ئەوەی خەڵك ببیبننو پیّ ی دا هەڵبڵێن، ئەویش بە تاڵ کەرەوەی کردەوەکەیەتی، شایەنی

سزایە لەسەر ئەو کردەوەی، وە ئەو کردەوەش پەیوەندی بە دڵ هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ناوە هاوبەش پەیدا کردنی شاراوە.

❖ **لە نیشانەکانی ریا: گورج و گۆڵ چالاك بوون لە ئیش و کار کاتێك کە خەڵك دەیبینن، وە واز لە کردەوە دێنێت ئەگەر خەڵك نەیبینن.**

«الشیخ إبن فوزان»

١٢٣. حوکمی دانیشتنی ئافرەت لە گەل خزمە نزیکەکانی پیاوەکەی بە چەند مەرجێك هیچی تێدا نیە.

- ئەگەر لەو شوێنە بە تەنیا بوون (خەڵوەت) روو نەدات.
- ئەگەر بالاپۆش بێت بالاپۆشینێکی تەواو رێك و پێك کە دەست و روخساریشی داپۆشراو بێت.
- دەبێت خۆ داپۆشەر بێت ( لە قسەو دانیشتنی)و نابێت جێی گومان بێت.

«الشیخ إبن فوزان»

١٢٤. پلان و فێڵەکانی شەیتان چیە؟

هەموو گوناهو شەهوەتە حەرامەکان و وەسوەسەکان، لاوازی ئیمانەو هاورێیەتی کردنی خەراپەکاران، وەهەموو ئەو هۆکارانەی کە سەر بۆ حەرام دەکێشێت، وەکو سەیر کردنی وێنەی رووت و فلیمی ووروژێنەرو گوێگرتنی ئەو شتانەی کە دروست نیە، لە

گۆرانیو غەیبەتو قسە هێنانو بردنو جنێو دانو...... ئەوە هەموو لە فێڵو تەڵەکانی شەیتانە کە نەوەکانی ئادەمی پێ ڕاو دەکات، بۆ ئەوەی لە گەڵ خۆی بە دۆزەخ شادیان بکات

«الشیخ إبن فوزان»

١٢٥. حوکمی ئەو کەسەی کە دەڵێ (( ئیمان بە دڵە، کاتێك قەدەغەی گوناهێکی لێ دەکەی وەکو باڵا نە پۆشی)).

ئەو ووشەیە زۆر جار هەندیك لە نەزانەکان دەیڵێنەوە، ئەو ووشەیەش ووشەیەکی هەقە بەڵام بۆ مەبەستی ناڕەوا بەکاری دەێنن ( چونکە خاوەنی قسەکە دەیەوێت خۆی بێ تاوان بکات لەو گوناهانەی کە لەسەریەتی) چونکە وا پیشان دەدات ئەو ئیمانەی کە لە دڵدا هەیەتی بەسیەتی، پێویست ناکات کردەوەی چاك بکاتو واز لە گوناهەکان بێنێت، ئەوەش هەڵەیەکی دیارو ئاشکرایە، چونکە ئیمان تەنها لە دڵدا نیە بەڵکو ئیمان وەکو ئەوەی ( أهل السنه والجماعه) پێناسەیان کردووە، قسەیە بە زمان، باوەڕ هێنانە بە دڵ (إعتقاد)، وەکردەوەیە بە ئەندامەکانی لە شت.

❖ وەکردەوەی خەراپیش بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئیمانی ناو دڵو کەم بوونی، چونکە ئیمان بە کردەوەی پاش زیاد دەبێت بە کردەوەی خەراپ کەم دەبێت.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٦. خێزانێك كێشەو گرفتی تێدا زۆر بوو، وە لە جانتای خزمەتكارەكەیان هەندێك تاڵە موویان دۆزیەوە.

ئەو تاڵە مووەی كە دۆزیانەوە دەیهێننو لە ناوی دەبەن، وە بە پەلە خزمەتكارەكە دەگوازنەوەو دووریدەخەنەوە بۆ دەرەوەی وولآت، نابێت وازی لێبێنن لە لای خۆیانو بیهێڵنەوە، یان لە لای خەلكی دیكەی جگە لە خۆیان.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٧. ئایا دروستە واز لە كردەوەی چاك بهێنرێت لە ترسی ریابازی؟ نەخێر دروست نیە واز لە كردەوەی چاك بهێنرێت لە ترسی ریا بازی، چونكە ئەو ساردكرنەوەیە لە شەیتانەوەیە، بەلآم پێویستە لەسەر موسڵمان كردەوەی چاك بكاتو نیەتەكەشی بۆ خوا یەكلا بكاتەوە.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٨. ئایا كردەوەكانی مرۆڤ لە ژیانیدا كۆنترۆڵی شێوازو چۆنیەتی مردنەكەی دەكات.

كردەوەی چاكو گوێرایەڵی بوون، لەو هۆكارانەیە كە ئومێد دەبەخشێت بە خاوەنەكەی كە كۆتاییەكەی بە خێر تەواو بێت، بەلآم گوناهو تاوانو واز هێنان لە واجبات، لەو هۆكارانەیە كە

مەترسی بەخشە خاوەنەکەی کۆتایی بەشەڕو خەراپە بێت، هیچ گومانی تێدا نیە کۆتایی هاتن بەباشە یان بە حەراپە پەیوەستە بە قەزاو قەدەری خوای گەورە، وەئەوەندەش لەسەر مرۆڤ پێویستە کە ئەو هۆکارانە جێ بەجێ بکات کە چاکی چارەنووسی بۆ دێنن. وەواز لەو هۆکارانە بێنێت کە خەراپی چارەنووسی بۆ دێنن. وەهەموو کەسێك ئەوەی بۆ ئاسان دەکرێت کە بۆی دروستکراوە.

«الشيخ إبن فوزان»

١٢٩. چارەسەری ئەو کەسەی کە حەسود پێ بردنی لە دڵدا هەیە.

– بزانێ ئەو نازو نیعمەتە بەخششی خوایە، حەسودی پێ بردنی، ناڕەزایی‌و تووڕە بوون لە خۆ دەگرێت لە قەزاو قەدەری خوا.

– دەبێ بزانێت ئەو حەسود پێ بردنە هیچ سودێکی نیە، مەگەر زۆری گوناهو ڕۆیشتنی چاکەکان نەبێت.

– دەبێ بزانێت ئەو حەسودی پێ بردنەی نابێتە بەربەستی بەخششی خوا لە حەسودی پێ بردراو، بۆیە هیچ سوودێکی بۆ نیە، بەڵکو تەنها غەمو پەژارەی بۆ زیاد دەکات، هەرچەند بەخششەکانی خوا لەسەر بەندەکانی زیاد بێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٣٠. حوكمی چوونه لای جادووكەرەكانو كاهینەكانو هاوشێوەیان بۆ وەرگرتنی چارەسەر.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ((من أتى عرافا أو كاهناً فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد ) رواه الترمذي.

واتە ئەوەی بچێتە لای فاڵچییێك یان جادووكەرێكو باوەڕ بە قسەكانی بكات ئەوە بێ باوەڕ دەبێت بەرامبەر ئەو پەیامەی بۆ محمد (ﷺ) نێردراوە.

❖ كاهینەكانو فاڵچیەكانو هاوشێوەیان درۆ لە گەڵ خەڵك دەكەنو قسەی نا بەجێو ناڕاست لە سەر خوا دەكەن. جا واجبە ئاگەداری خۆمان بین لێیان، لە پرسیار كردن لێیانو چارەسەر كردن لە لایان.

«الشيخ إبن باز»

١٣١. ئاگەداری: ئەوەی داوای ناوی نەخۆشو ناوی دایكو باوكی دەكات، ئەوە لەو كەسانەیە كە جنۆكە بە كار دەهێنن.

«الشيخ إبن باز»

١٣٢. حوكمی ئەو كەسەی بە شە خواردنەكەی فڕێ دەدات، كاتێك یەكێك سەیری دەكات، لە حاڵەتی خواردنی.

ئەو بیرو بۆچوونە بە تاڵەو پێچەونەیە لە گەڵ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) (( إذا سقطت من أحدكم اللقمة فليمط ما كان بها

من أذى ثم ليأكلها )) واتە ئەگەر پارووی یەکێکتان کەوتە سەر زەوی با پاکی بکاتەوە لە پیسی پاشان بیخوات.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٣٣. حوکمی ئەو بوخارو دوکەڵەی کە بەرووەكو گیا پەیدا دەبێت، بۆ خۆ پاراستن لە چاووزار.

دروست نیە، چونکە لە هۆکارە شەرعیەکان نیە بۆ چارەسەرکردن، لەوانەیە مەبەست لەو بوخورو دوکەڵە ڕازی کردنی شەیتانە جنۆکەکان بێتو داوای یارمەتی کردن بێت لێیان بۆ چاکبوونەوە، بەڵکو دەبێ بە دوعاو پاڕانەوەی شەرعی چارەسەر بکرێت.

«اللجنة الدائمة»

١٣٤. چارەسەرکردنی ئەو کەسەی بەستراوە لە کۆ بوونەوە لە گەڵ خێزانەکەی( ناتوانێت لە گەڵ خێزانی جووت بێت).

١. حەوت گەڵای دارنەبك (سدر)ی سەوز دێنێتو دەیکوتی بە بەردێك یان بە شتێکی تر. وە دەخرێتە ناو جامێكو ئەوەندە ئاوەی دەخرێتە سەر کە بەس بێت بۆ خۆشوشتن.

٢. ئەو سورەتو ئایەتانەی لە ناو دەخوێنێت، آية الكرسي ،المعوذتين (الفلق، الناس)، الإخلاص، الكافرون، ئایەتەکانی بە تاڵ کردنەوەی جادوو لە سورەتی الأعراف (١١٧-١٢٢) وە

ئایەتەکانی سورەتی یونس (٧٩-٨٢)، سورەتی طه (٦٥-٦٩).

٣. پاش خوێندنەوەی ئەوەی باسمان کرد لە ناو ئاوەکە هەندێکی لێ دەخواتەوەو پاشماوەکەی خۆی پێ دەشوات. وە بەو شێوەیە نەخۆشیەکەی لادەچێت (إن شاءالله)، وە ئەگەر پێویست بوو بەکاری بێنێت دوو جار یان زیاتر، ئەوە هیچی تێدا نیە هەتاکو نەخۆشیەکەی لا دەچێت.

«الشيخ إبن باز»

١٣٥. فوو کردنە ناو ئاو

❖ **فوو کردنە ناو ئاو دوو بەشە.**

١. مەبەست لەو فوو کردنە بە پیرۆز دانانی تفی فووکەر بێت، ئەوە گومانی تێدا نیە حەرامەو جۆرێکە لە هاوبەش پەیدا کردن، چونکە تفی مرۆڤ هۆکارێك نیە بۆ چاکبوونەوە، وەهیچ کەسێك نابێت پاشماوەو نیشانەکانی بە پیرۆز دابنرێت مەگەر پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت.

٢. مرۆڤ فووێك بکات بە تفەوە لە شتێك قورئانی تێدا خوێندرا بێت. ئەوە ئاسایەو هیچی تێدا نیە. وە هەندێك پێشینە چاکەکان کردوویانەو تاقی کراوەتەوەو سوود بەخش بووە بە (إذن الله)، پێغەمبەریش(ﷺ) فووی لە ناو دوو دەستی خۆی دەکرد لەکاتی

نوستنیداو سوڕەتی (الفلق) و ( الناس) دەخوێندو ئەوەندەی توانا هەبوایە لەشی خۆی پێ دەسڕی

«الشيخ إبن عثيمين»

❖ ئاگەداری: مەبەست لە باسکردنی ئەو مەسەلەیە ئەوە بوو کە هەندێك لەو ئافرەتانەی کە داوای خوێندن لە شێخەکان دەکەن، وا گومان دەبەن کە تفی شێخ بەرەکەتی تێدایە، بۆیە حەزمان کردو پێمان خۆش بوو ئاگەداری ئەو مەسەلەیە بین.

١٣٦. مەرجەکانی نوشتەی شەرعی.

١. دەبێت نوشتەکە بە فەرموودەی خوا یان بە ناوەکانی، یان بە سیفاتەکانی بێت.

٢. دەبێت بە زمانی عەرەبی بێت، یان بە زمانێك بێت ماناکەی دیار بێتو بناسرێتەوە لە شتیتر.

٣. دەبێت باوەڕت وا بێت ئەو نوشتەیە خودی خۆی هیچ کاریگەری نیە، بەڵکو کاریگەریەکە لە لایەن خوایە.

٤. نابێت نوشتەکە بە شێوەیەکی حەرام بۆی بکرێت، وەکو ئەوەی بەتەنیا بوونی ( خەڵوەت) لە گەڵ یەکێکی بێگانە یان دەرکەوتنی عەورەتی نەخۆشی تێدا بێت، بەڵکو واجبە خۆی داپۆشێتو سوور بێت لەسەر ئەمە

# ﴿ ئافرەتو قوتابخانە ﴾

❖ (١٨) وەڵامی تێدایە.

١. لێدانی کچە قوتابیەکان لەبەر مەبەستی فێربوون.

هیچی تێدا نیە، تەمبێ کردنی ئەو کەسەی شایەنی تەمبێ کردن بێت، کاتێك کەم تەرخەم دەبێت لە ئەنجام دانی ئەرکێکی تەمبێ دەکرێت هەتاکو لە سەر خورەوشتە بەرزەکان ڕادێت. بەڵام دەبێت لێدانەکە سووك بێتو زیانی تێدا نەبێت، مەبەستەکەش بپێکێت.

«الشيخ إبن باز»

٢. حوکمی گاڵتە کردن بە مامۆستایەکان

پێویستە لەسەر موسڵمان زمانی خۆی بپارێزێت لەو شتانەی کە ئەزیەتی موسڵمانان تێدایە، یان کەم ڕێزی ئەوانی تێدایە، خوای گەورە فەرموویەتی ( ولا تنابزوا بالألقاب) واتە ناوو ناووتۆرە لە یەکتر مەنێین. خوای گەورە دەفەرمێت ( ويل لكل همزة لمزة) واتە سزاو لە ناوچوون بۆ هەموو نەنگ گرێکی بەدگۆ (عەیب گرێکی تانەدەر).

کەم ڕێزی کردنی موسڵمانو ئەزیەت دانی حەرامە.

«الشيخ إبن جبرين»

٣. کامەیان چاکترە زانستو زانیاری یان خزمەتی ماڵ.

دەبێت لەم کارە مام ناوەند بێت، بۆ تێگەیشتنی لە دین کاتێك دابنێت ئەگەر کەمیش بێت، وەبۆ کارەکانی ناوماڵیش کاتێکی گونجاو دابنێت.

٤. قۆبیە کردن لە ماددەی ئنگلیزی.

دروست نیە بکرێت لە هیچ ماددەیەك لە ماددەکان، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) (( من غشنا فلیس منا)) واتە ئەوەی فێڵ و تەڵەکە بکات ئەوە لە ئێمە نیە. لێرەش زاراوەی فێڵ گشتیە بۆ هەموو شتێك دەبێت.

«الشيخ إبن جبرين»

٥. وانە گوتنەوەی پیاوێکی کوێر بۆ کچەکان.

چاکتر وایەو دڵنیاترە، ئافرەتان بە ئەرکی بە وانە گووتنەوە هەڵسن بۆ ئافرەتان، چونکە ئەوە دوورترە لە گێروگرفت. لە کاتی پێویستیش دروستە پیاوی کوێر وانەیان پێ بدات، یان پیاوێکی بینەر لە دوای پەردە،یان لە ڕێ شاشەی ئەلیکترۆنی.

«الشيخ إبن فوزان»

## ❖ دیاری بۆ مامۆستایەکان.

٦. واجبە لەسەر مامۆستا واز لە وەرگرتنی دیاری بێنێت لە قوتابیەکان بە شێوەیەکی گشتی.

«الشيخ إبن باز»

٧. ئەگەر دیاریەکە لەبەر خاتری گواستنەوەی مامۆستا بێت بۆ قوتابخانەیەکی تر، ئەوە زیانی نیە. «الشيخ إبن باز»

٨. یـان دیاریەکـە دوای دابڕانــی بێـت لەکارەکـەی، یـان دوای خانەنشینی بێت، ئەوە هیچی تێدا نیە.

«الشیخ إبن باز»

٩. ئەگەر دیارییەك دوای تـەواو بـوونی نمـرەو شـەهادەکان بـوو، ئەوە هیچ گوناهێکی تێدا نیە.

«الشیخ إبن باز»

١٠. دروسـت نیــەو نابێـت دیـاری وەربگیرێـت لـەو شـتـەی کـە پەیوەندی بە کارەکەی هەیە ، چونکە هۆکارێکە بۆ پێشێلکاری سپاردەو ئەمانەت.

«الشیخ إبن باز»

١١. ئەو شتەی پێی دەگوترێت (( الجمعیة))

کۆمەڵێك لە مامۆستایان هەڵدەستن لە کۆتایی هەر مانگێك بـە کـۆ کردنەوەی بڕێك لە پارەی ڕاتبیـان و دەیدەنـە ئـافرەتێکی دیـاری کــراو لـــە خۆیـــان، وە مـــانگی داهـــاتوو ئـــەو بـــڕە دەدرێتـــە ئافرەتێکیتر..... هیچی تێدا نیە، ئاسایە. ئەوە قەرزێکە مـەرجی سوودی زیادی بۆ کەس تێدا نیە.

«الشیخ إبن باز»

١٢. خوێنـدی قوتـابی کـچو کـوڕ بەیەکـەوە: خوێنـدنی کـوڕو کـچ بەیەکـەوە لـە یـەك شـوێنو لەیـەك قوتابخانـەو لەیـەك کورسـی، دروست نیەو نابێت، بەڵکو لـە هۆکـارە هـەرە گـەورەکانی فیتنـەو ئاشوبە.

١٢. هەڵسانەوەی قوتابیەکان بۆ مامۆستا (وەکو ڕێز گرتنێك لێی)

دروست نیە، کەمترین حوکمی ئەوەیە زۆر ناپەسندە ( مەکروهە).

«الشیخ إبن باز»

١٤. حوکمی خوێندنی ئەندازەو کیمیا بۆ ئافرەتان.

بۆ ئافرەت نیە پسپۆری لە شتێك وەربگرێت کە هاوشانی ئەو نەبێت. کاتێك لە بەردەمی زۆر بواریتر هەیە گونجاوو لەبارترە بۆی . بەلام پسپوری وەرگرتنی لە کیمیاو ئەندازەو بیناسازیو فەلەكو جوگرافیا بۆی گونجاو نیە. پێویستە لەسەری ئەو شتە هەڵبژێرێت کە سوودی بۆ خۆیو کومەڵگای خۆی هەیە.

«الشیخ إبن باز»

١٥. حوکمی ئەو کەسەی کە شەهادەیەکی بە دەست هێناوە بە فێڵو تەڵەکە. پێویستە لەسەری تەوبە بکاتو پەشیمان ببێتەوە لەوەی کە کردوویەتی، بە لام کار کردنو وەزیفەکەی تەواوە، پارەکەشی حەلالە مادەم ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە بە چاکی رایدەپەڕێنێتو پێی هەڵدەستێت.

«الشیخ إبن باز»

١٦. حوکمی دوا کەوتنی مامۆستا لە هۆڵی خوێندن.

دروست نیە بۆ مامۆستا دوا بکەوێت لە چوونە ژوورەوەی پۆل دوای ئاگەدارکردنەوەی لە دەستپێکردنەوەی وانەکان ، خوا دەفەرمێت ( وأوفوا بالعهد إن العهد کان مسؤلا) واتە وەفا بکەن بە

بەڵێن‌و پەیمان، چونکە بە ڕاستی بەرپرسیارن لە بەرامبەر بەڵێن‌و پەیمانەوە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٧. ئەگەر سەرپێچی لە قوتابیەکان روویدا یەکەمجار واجبە ئامۆژگاری بکرێن، ئەگەر ئامۆژگاریەکە سوودی نەبوو، دەبێت ئەو سەرپێچیە بەرز بکرێتەوە بۆ بەر پرسەکان، ئەوەش بە دوو زمانی دانانرێت. بەڵکو ئەوەش بەشێکە لە ئامۆژگاری.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٨. ئایا دروستە بۆ کچە بالاپۆشەکان سەیری ئەو پیاوانە بکەن کە فێریان دەکەن بە تایبەتی ئەگەر گەنجێکی بەرچاو بێت.

سەیرکردنی ئافرەت بۆ پیاو دروست نیە، ئەگەر گرفت‌و ئاشوبی لێبکەوێتەوە، بەڵام ئەگەر سەیرکردنەکەی ئاسایی بوو، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو تەمەنی پیاوەکە گەورە بوو، ئەوە سووکترە لە گەڵ دڵنیا بوون لە گرفت‌و ئاشوب‌و چاو پاراستن.

❖ وەپێویستە لەسەر ئافرەت بە قوڵی لە پیاوان ڕا نەمینێت لە ترسی ڕوودانی فیتنەو ئاشوب.

«الشيخ إبن جبرين»

# ﴿ئافرەت و زۆر سوێند خواردن﴾

## ❖ (٣١) وەڵامی تێدایە

١.سوێند خواردنی مرۆڤ لە حاڵەتی تورەیی.

كفارەتی سوێندەكەی لەسەر واجب دەبێت، وەكو ئەوەی بڵێت: (( والله قسه لە گەڵ فولان دەكەم)) یان بڵێت: (( والله سەردانی دەكەم) ، ئەو شتەی سوێندی لەسەر خوارد بوو نەیكرد، ئەوە كەفارەتی سوێندەكەی لەسەر پێویست دەبێت، ئەگەر هاتوو خاوەن عەقل و ژیر بوو دەیزانی چ دەڵێت.

– بەڵام ئەگەر هاتوو زۆر تورە بوو، لەسەر هۆشی خۆی نەبوو، ئەوە سوێندەكەی جێگیر نابێت، هیچ كەفارەتیشی لەسەر نیە، وە بۆی هەیە واز لەو شتە بێنێت كە سوێندی لەسەر خواردبوو بیكات، ئەگەر بینی بەرژەوەندیەكەی لە كردنیدا بێت، وەكەفارەتی سوێندەكەی دەدات. پێشخستن و دوا خستنی كەفارەتەكەشی گوناه نیە

«الشیخ إبن باز»

٢. دایكێك زۆر سوێند لەسەر منداڵەكانی دەخوات، وەزۆربەی جاران منداڵەكانی سەرپێچی فرمانی دەكەن، ئایا كەفارەتی لەسەر واجبە؟

وا دەبینین ئەو سوێندە سوێندێکی بەتالە ( لغو الیمین) ، لەبەر ئەوەی لەسەر سوێندەکەی سوور نیە، وەزۆربەی جاریش لە بۆ ترسان و هەڕەشەیە، پێویست بە کەفارەت ناکات.

«الشیخ إبن جبرین»

٣. سوێندی درۆیی بە خوا خورادو پاشان تەوبەی کرد، ئەگەر سوێندی خوارد لە سەر شتێك و دەیزانی کە درۆیە، ئەوە تاوانبارە، وە پێویستە لەسەری بگەڕێتەوە لای خواو هیچ کەفارەتی لەسەر نیە، وە هەندێك پێی دەڵێن ( الیمین الغموس) ، واتە سوێندی نقوم کەر لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی نقومی گوناهو تاوان دەکات، پاشان نقومی ئاگری دۆزەخی دەکات.

«الشیخ إبن عثیمین»

٤. سوێندی نقوم کەر (الیمین الغموس)

حەڕامە، ئەویش ئەوەیە لەسەر شتێکی رابوردوو بە درۆ سوێند بخوات، کاتێك بزانێت ئەو شتە بەو شێوە نیە، ئەو گوناهەش لە گوناهە گەورەکانەو هیچ کەفارەتی تێدا نیە، چونکە زۆر لەوە گەورەترە کە کەفارەتی هەبێت (بە کەفارەت دان گوناهەکە بسڕێتەوە) ، بەڵام دەبێ مرۆڤ تەوبە بکات و بۆ خوا بگەڕێتەوە.

٥. سوێندی بەتاڵ ( لغو الیمین)

ئەو شتەیە بە سەر زمانیدا دێت، بە بێ مەستێك وەكو ئەوەی بڵێی نا والله ، ئەرێ والله ئەوە كەفارەتی تێدا نیە.

٦. سوێند خواردن بە جگە لە خوا

دروست نیە جا چ بە كەعبە، یان بە ئەمانەت، یان بە شەرەف، یان بە متمانە، یان بە سەر سوێندەكە بخوات جیاوازی نیە.

٧. ئەو قسەیە (سوێندم بەسەرت خوارد) ئایا حوكمی سوێندی هەیە.

وا دیارە ئەو زاراوەیە حوكمی سوێند نادات، چونكە سوێندی ڕاستەقینە نیە، سوێند خواردن دەبێت بە خوای گەورە بێت، یان بە سیفەتێك لە سیفاتی بێت، وەكو ئەوەی بڵێت: والله ، ورب العزة ، وە ناویتری هاوشێوە.

«الشیخ إبن جبرین»

٨. سوێندی خوارد شتێك نەكات بەڵام لەبیری چوو كردی.

ئەو حاڵەتە كەفارەتی لەسەر نیە، لەبەر ئەوەی ئەو شتەی كە كردویەتی لەبەر لە یاد چوونی بووە، بەڵام ئەگەر ئەو شتەی لێ ڕوویدات لە ڕۆژانی داهاتوو، كاتێك لە یادی بوو، یان بە ئەنقەست بیكات، ئەوە كەفارەتی سوێندی لەسەر پێویست دەبێت.

«اللجنة الدائمة»

### ❖ جۆنیەتی دەرهێنانی کەفارەتی سوێند.

٩. ئەوەیە خواردنیان بداتێ ژەمێك هەتا تێر دەبن، وەئەگەر خواردنێکی نە کوڵاوی پێیاندا ، ئەندازەی یەك کیلوو نیو دەبێت بۆ هەر هەژارێك لە خواردنی باوی ئەو شارە.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٠. لە جلو بەرگ: دەبێت ئەوەندە بێت کە نوێژی پێ دروست بێت، ئەویش (إزار)و (رداء) بێت، إزار: لە ناوکەوە بۆ خوارەوە دادەپۆشێت. رداو: لەسەر شانەوە بۆ خوارەوە دادەپۆشێت.

١١. نابێت پارە لە جیاتی خواردن بدەی، دروست نیە، بەڵکو هەر دەبێ خواردن بێت.

١٢. سوێندی زۆر چۆن کەفارەتەکەی دەدرێت، ئەگەر ژمارەکەی نەزانرا؟

دەبێت هەوڵ بدەی ژمارەی ئەو سوێندانە بزانی کە شکاندویەتی بە شێوەیەکی نزیکراوی، پاشان کەفارەتەکەی خۆی دەدات لەسەر ژمارە نزیکراوەکە، ئەگەر هاتوو لەسەر شتی جیا جیا سوێندی خوارد بێت.

«اللجنة الدائمة»

❖ پەیمانم دا لەسەر کردنی شتێك بەڵام نەمکرد.

١٢.ئەگەر ئەو پەیمانە بە زاراوەی سوێند گوترا بێت وەکو : واللە ، تاللە ، وباللە ئەوە کەفارەتی سوێندەکە دەدات.

١٤.بەڵام ئەگەر پەیمانەکە زاراوەکەی سوێند نەبوو ، ئەوە پێویستە لەسەری تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، وە هیچ کەفارەتی لەسەر نیە، ئەگەر سوێندی نە خوارد بوو.

«الشیخ إبن باز»

١٥.پێناسەی نەزر:

ئەوەیە یەکێکی ئەرکبار شتێك لەسەر خۆی واجب بکات بە پێ ی شەرع لەسەری واجب نەبووبێت؟

١٦. حوکمی نەزر

ناپەسندە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( إنه لا يأتی بخیر.....) چونکە خێری پێوە نیە، بۆ نموونە هەندێك خەڵك هەیە ئەگەر نەخۆش کەوت نەزر لەسەر خۆی دەکات، خێر بکات یان ئاژەڵ سەر ببڕێت، کاتێك لە نەخۆشیەکەی چاکبۆوە، بڕوای وا دەبێت خوای گەورە چاکی نەدەکردەوە ئەگەر هاتوو نەزری نەکردبا. «الشیخ إبن جبرین»

١٧. ئافرەتێك نەزری کرد قوربانی بۆ خوا بکات (( لە کاتێکی دیاری کراو)) بەڵام نەیتوانی ، ئایا سەدەقە بکات بەسە؟

واجبه لەسەری وەفای بۆ نەزرەکەی هەبێت، ئەگەر دواشی خست بێت، وەکو قەرزێك بیگێڕێتەوەو جێبەجێی بکات، وە لەسەری پێویستە لە جیاتی دواخستنەکە (( کەفارەتی سوێندەکەی بدات)) ، تەنها سەدەقەو خێر بەس نیە بۆ نەزرەکەی، چونکە نەزرەکەی تایبەتە بە سەربڕین.

«الشيخ إبن فوزان»

۱۸. حوکمی گۆڕینی ئاڕاستەی نەزرەکەی .

ئەگەر مرۆڤ نەزری کرد لە شوێنێكو لە شتێك بەڵام بینی جگە لەو شتە چاکترو بە سوودترە بۆ بەندەکانی خوا، ئەوە هیچی لەسەر نیە ئاڕاستەی نەزرەکەی بگۆڕێت بۆ شوێنێکی چاکتر.

«الشيخ إبن عثيمين»

۱۹.ئایا دروستە نەزرکەر لە نەزرەکەی بخوات ؟

هەڵسو کەوت لە گەڵ نەزر بە پێ نیەتی خاوەنەکەی دەبێت لە سنووری شەرعی خوا، ئەگەر نیەتی لەو گۆشتەی کە نەزری کردووە بۆ فەقیران بوو، نابێت لێی بخوات، وە ئەگەر نیەتی لە نەزرەکەی کەسو کارو ماڵی خۆیو هاوڕێیەکانی بێت کە خۆی یەکێکیانە، دروستە بۆی بخوات وەکو یەکێك لەوان.

«اللجنة الدائمة»

٢٠. نەزر کردن بۆ جگە لە خوا

هاوبەش پەیدا کردنە، بە تاڵەو جێگیر نابێت، وە ئەو ئاژەڵەی بۆ ئەو نەزرە سەردەبڕێ مردار بووە، جا ئەوەی نەزر بکات بۆ جگە لە خوا، بۆ ( قەبرێك، یان فریشتەیەك، یان پێغەمبەرێك، یا پیاو چاکێکی نزیك لە خوا، ئەوە هاوبەشی بۆ خوا پەیدا کردووە).

«اللجنة الدائمة»

## ❖ نەزر کردن چەندەها بەشە.

٢١. نەزری رەها

وەکو ئەوەی بڵێ ( والله نەزرم لەسەر بێت)، بەڵام ناوی هیچ شتێك نەهێنێت، ئەوە پێویستە کەفارەتی سوێندەکە بدات.

«الشیخ إبن فوزان»

٢٢. نەزری قین و تورەیی.

ئەوەیە نەزرەکەی پەیوەست دەکات بە مەرجێك بە مەبەستی نەکردنی کارەکە، یان کردنی، یان پێ هەڵسانی، یان باوەڕ پێ کردنی، یان بەدرۆ خستنەوەی وەکو ئەوەی بڵێت: ئەگەر قسەت لە گەڵ بکەم، یان ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست نەبوو ، ئەوە حەجم لەسەر بێت...... ئەو نەزرە سەرپشکی دەکات نێوان جێ بەجێ کردنی نەزرەکەی، یان کەفارەتی سوێندەکەی.

«الشیخ إبن فوزان»

٢٣. نەزری ڕێپێدراو.

وەکو ئەوەی نەزر بکات کە جلەکەی لەبەر بکات، یان سواری سواریەکەی بێت ( ئەوە سەر پشك دەکرێت لە نێوان کردەوەکەی یان کەفارەتی سوێندەکەی) ، ئەگەر نەیکات.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٤.نەزری گوناهو تاوان.

وەکوئەوەی نەزر بکات کە مەی بخوات..... دروست نیە وەفای بۆ نەزری گوناهو تاوان هەبێت، وە لەسەر کەفارەتەکەشی دووبەرەکی هەیە لە نێوان زانایەکان، بە پێی ڕای کۆمەڵێك لە زانایان کەفارەتی لەسەر پێویست نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٥.نەزری پاکانە کردن.

ئەو نەزرەش نەزری پەرستن و گوێڕایەڵیە، وەکو ئەنجام دانی نوێژو ڕۆژوو.... هتد، وەکو ئەوەی بڵێی والله لەسەرمە نوێژ بکەم، یان بەڕۆژوو بم، یان بە مەرجێك پەیوەستی بکات وەکو ئەوەی یەکێك بڵێ: ئەگەر خوا لە نەخۆشیەکەم چاکم بکاتەوە، بە خوا لەسەرمە بۆ خوا وابکەم و وابکەم. ئەگەر مەرجەکەی بۆ هاتە دی، ئەوە پێویستە وەفای هەبێت و کارەکە بکات، بەلام ئەگەر نەیتوانی وەفای هەبێت و کارەکە بکات، پێویستە کەفارەتی سوێندەکە بدات.

«الشيخ إبن فوزان»

٢٦. ئەو قسەیە (سوێندم بەسەرت خوارد) ئایا حوكمی سوێندی هەیە .

وا دیارە ئەو زاراوەیە حوكمی سوێند نادات، چونكە سوێندی ڕاستەقینە نیە، سوێند خواردن دەبێت بە خوای گەورە بێت، یان بە سیفەتێك لە سیفاتی بێت، وەكو ئەوەی بڵێت: واللە ، ورب العزة ، وە ناویتری هاوشێوە.

«الشيخ إبن جبرين»

٢٧. لكاندنو بەستنەوەی سوێند بە حەزو ویستی خوا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (( من حلف على يمين فقال إن شاء الله فلا حنث عليه )) واتە ئەوەی سوێندی خواردو گوتی ( إن شاء الله ) ئەوە هیچ گوناهو تاوانی لەسەر نیە، واتای فەرموودەكە ئەگەر مرۆڤ سوێندی خوارد گوتی بە خوا ئەو شتە دەكەم ( إن شاء الله) پاشان نەیكات، ئەوە هیچ كەفارەتی لەسەر نیە، چونكە گوتبووی (إن شاءالله)

❖ ئاگەداری : پێویستە بۆ ئەو كەسەی سوێند دەخوات بۆ كردنی شتێك سوێندەكە ببەستێتەوە بە گوتنی ( إن شاء الله) ، هەتاكو ئەگەر سوێندەكەی بۆ جێبەجێ نەكرا، ئەوە كەفارەتی لەسەر نابێت.

«الشيخ إبن عثيمين»

٢٨. دەستپێکردنی بە ڕۆژوو بوون دروست نیە پێش خواردن بەخشین ( لە کەفارەتی سوێند) چونکە ڕۆژوو گرتن دەرهەق بە کەسێکە کە توانای خواردن بەخشین‌و جل‌و بەرگ کردن‌و ئازاد کردنی بەندەی نەبێت. ئەگەر بەرامبەر هەموو ئەو شتانە بێ توانا بوو، ئەوە سێ ڕۆژ لە دوای یەکتر بە ڕۆژوو دەبێت.

«الشيخ إبن باز»

٢٩.ئەو پەیمانەی دووبارە دەبێتەوە لەسەر کردنی شتێك بەیەك پەیمان دادەنرێت.

وەکو ئەوەی بڵێت ( والله سەردانی زەید ناکەم، والله سەردانی زەید ناکەم........) کەفارەتەکەی یەك جارە.

«اللجنة الدائمة»

٣٠. سوێندەکەی چەند دووبارە کردەوە لەسەر کردەوەی جیا جیا. وەکو ئەوەی ( والله قسە لە گەڵ فولان ناکەم ، والله خواردنی فولان ناخۆم، والله بۆ فولانە شوێن سەفەر ناکەم) ئەوە بۆ هەر سوێندێك کەفارەتێکی لەسەرە.

«اللجنة الدائمة»

٣١.سوێند خواردنی زۆر، نا پەسندە.

لەبەر فەرموودەی خوا ( واحفظوا أيمانكم) واتە سوێندو پەیمانەکان بپارێزن.

## ﴿ئافرەتو پزیشك﴾

### ❖ (١٤) وەڵامی تێدایە

١. دروست نیە بۆ پزیشك ئەو شوێنە ببینێت، یان دەست لێبدات کە پێویست نیە ببینرێت.

«اللجنة الدائمة»

٢. پێویستە لەسەر ئافرەت هەموو ئەو شوێنانە داپۆشێت کە پێویست نیە دەریبخات لە کاتی چارەسەر کردن.

«اللجنة الدائمة»

٣. دروست نیە بۆ ئافرەت لە گەڵ پزیشك بە تەنیا بێت، ئەگەر چی بۆ چارەسەرکردنیش بێت، بەڵکو دەبێت لە گەڵ مەحرەمێك بێت، یان پیاوەکەی، یان ئافرەتی نەخۆشەوان، هەتاکو خەڵوەت ڕوو نەدات.

«اللجنة الدائمة»

٤. ئەگەر دەکرا، ئاسان بوو لە لای ئافرەتێکی موسڵمان بپشکنرێتو چارەسەر بکرێت، لە م حاڵەتەدا دروست نیە پزیشکێکی پیاو بیپشکنێت یان چارەسەری بکات، ئەگەر چی موسڵمانیش بێت.

«اللجنة الدائمة»

٥. ئەگەر هاتوو نەدەگونجا ئافرەت بێتو ناچاریش بوو چارەسەر بکرێت، دروستە پزیشکێکی موسڵمان بیبشکنێت بە

ئامادە بوونی پیاوەکەی یان مەحرەمێکی لەترسی ڕوودانی گرفتو ئاشوب.

«اللجنة الدائمة»

٦. حوکمی جلو بەرگی تەسك بۆ ئافرەتی نەخۆشەوانو ئافرەتە پزیشکەکان.

واجبە لەسەر ئافرەتە پزیشکەکانو ئەوانیتر جلو بەرگی ڕێكو پێكو داپۆشەر لەبەر بکەن، لە گەڵ لەبەر کردنی جلەکانیان قەبارەی ئەندامەکانو عەورەتیان دەرنەخەن، بەڵکو جلو بەرگێکی مام ناوەند بێت نە زۆر فراوان بێت، نە زۆر تەسك بێت، داپۆشەر بێت بۆیان داپۆشینێکی شەرعی، بەر بەستێك بێت لە هۆکارەکانی گرفتو ئاشوب.

«الشيخ إبن باز»

٧. ئایا دروستە بۆ پزیشکێك ئافرەتێك بپشکنێت لەبەر منداڵ نەبوونی.

دروست نیە بۆ پیاوێك ئافرەتێك بپشکنێت لەو شتەی پەیوەندی بە عەورەت هەیە، مەگەر لە حاڵەتی پێویستو حاڵەتی تەنگانە نەبێت، بەڵام لێرە پێویست نیە، چونکە دەکرێت پشکنینەکە دوا بخرێت، هەتاکو ئافرەتێکی شارەزا دەبینێتەوە لە کاروباری ئافرەتان ، ئەو جۆرە ئافرەتانەش زۆرن.

«الشيخ إبن جبرين»

٨. ئایا واجبە لەسەر پیاو چارەسەری ئافرەتەکەی بکات لە ڕووی شەرعی؟

# ﴿ئافرەتو پەیوەندی هەبوونی بە خەڵکی دیکەی جگە لە موسڵمان﴾

❖ (٢٢) وەڵامی تێدایە.

١. ئەگەر هاتوو کافرێك دراوسێی موسڵمان بوو، پێویستە لە گەڵی چاکە بکرێتو خەراپەی بەرامبەر نەکرێ. بەلاّم نابێت لە گەڵی هۆگر بێتو دڵی پێی ئۆقرە بگرێت.

«الشيخ إبن فوزان»

٢. هەڵسو کەوت کردن لە گەڵ کافرەکان هیچی تێدا نیە، لە سنووری ئەو شتانەی کە شەریعەت ڕێ پێداوە لە کڕینو فرۆشتنو شتیتر.

«الشيخ إبن فوزان»

٣. ئەگەر بانگمان کردن بۆ وەلاّتی خۆمانو ئەمانەتمان پێ دان، دروست نیە دەستدرێژییان بۆ سەر بکەین یان زیانیان پێ بگەینین، بۆیە واجبە لەسەرمان بە دادوەری هەڵسو کەوتیان لە گەڵ بکەین، ستەمیان لێ نەکەینو مافەکانیان پێ بدەین.

«الشيخ إبن فوزان»

٤. سۆزو خۆشەویستی دەربڕین بۆ کافرەکان دروست نیە.

چـونكه دوژمنـانی خـواو پێغەمبـەرن(ﷺ)، دژایـەتی كردنیـان لەسەرمان پێویستە.

«الشيخ إبن فوزان»

٥. دروست نیە بۆ موسـڵمان خـۆش دوو (زمـان شـیرین) بێـت بەرامبەر كافرەكان لە سەر حیسابی دینەكەی، یان لە گەڵیان كۆك بێت لە كردەوەكانیان.

«الشيخ إبن فوزان»

٦. نا بێت پیرۆزبایییان لـێ بكرێـت بـە بۆنـەی جەژنـەكانیان، چونكە دان پێدانێكی تێدایە لەسەر دینە پوچەڵو بەتاڵەكەیان.

«الشيخ إبن فوزان»

٧. دروسـتە دیـاری لـە كـافر وەربگیرێـت، چـونكە پێغەمبـەر (ﷺ) دیاری وەرگرتووە لە هەندێك كافران.

٨. چاكتر وایە لە گەڵ كافر بەیەكەوە نەژیو تێكەڵی نەبی، لە گەڵیشی نیشتەجێ نەبی، بەڵام ئەگەر هاتوو پێویستو گرنگ بوو، هیچ لاریەك نیە لەوەی كە موسڵمان لە گەڵ كـافر لەیـەك ژووریـش بێـتو لـە گـەڵ یـەكتر بخـۆن، بـە مـەرجی ئـەوەی موسـڵمانەكە پارێزگاری لە دینەكەی بكات.

٩. بەشداری گاورە دیانەكان ناكەین لە مێژووی زایینی.

پێویسته لەسەر موسڵمانان دەست بکشێننەوەو پاشگەز ببنەوە لە دابو نەریتی کافرەکان، لە گەڵ ئەوەی مێژووی زایینی لە کاتی هاوەڵەکان هەبوو بەکاریان نەدەهێنا، لەو مێژووەوە لایاندا بۆ مێژووی کۆچی.

«الشيخ إبن فوزان»

.١٠ گەشت کردن بۆ وولاتی گاورەکان دروست نیە، مەگەر بە چەند مەرجێك :

- دینەکەی خۆی دەربخاتو هەڵبستێت بەو شتانەی کەخوا لەسەری واجب کردووە، نەرمو نیانی شلی نەنوێنێت لە دینەکەی، وە تەمبەڵ نەبێت لە جێ بەجێ کردنی ئەو شتانەی کە خوا لەسەری واجب کردووە.

- دەبێت ئەو گەشتە بۆ پێویستی بێت، وەکو چارەسەرکردنو فێربوونی ئەو شتەی کە ناکرێت لە وولاتی موسڵمانان فێری بێت.

- بەڵام گەشت کردن بۆ گەڕانو سەیران دروست نیە.

«الشيخ إبن فوزان»

.١١ سڵاو کردن لە کافر.

بە هیچ جۆرێك سەرەتا سڵاو لە کافر ناکرێت، وەهەر کاتێك ئەو دەستی بە سڵاو کردن کرد، واجبە وەڵام بدرێتەوەو بڵێی (وعليکم

)، وە هیچ لارییەك نیە پاشان پێی بگوترێت حاڵت چۆنە، منداڵەکانت چۆنن.

١٢. هاوەڵایەتی کردنی کافر

ئەگەر هاتوو ئومێدی ئیسلام بوونی هەبوو، بە پێشکەش کردنی ئیسلام بۆی، ئەوە هیچی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر ئومێدی ئیسلام بوونی ئەو کافرانەی نەبوو، ئەوە نابێت لە گەڵیاندا بژیت، لەبەر ئەو گوناهو تاوانانەی مرۆڤ تووشی دەبێت لە بەیەکەوە ژیانی لە گەڵ ئەوان.

«الشيخ إبن عثيمين»

١٣. بەشداری کردنی گاورەکان لە جەژنەکانیان.

دروست نیە، چونکە ئەوەی خۆی بە گەلێك بچوێنێت ئەوە لەوانە، وەنابێت یارمەتیان بدات بە هیچ شتێك.

«الشيخ إبن باز»

١٤. بە کار هێنانی کافر بۆ چێشت لێنان و شووشتن.

دروستە، بێ گومان هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەندەی پیاوو کەنیزەی ئافرەت کافریان بە کار دەهێنا.

❖ بەلآم لە فەرمووده‌ی پیغەمبەر (ﷺ) بۆمان هاتووه باس لـه شوشتنی قاپەکانیان دەکات پـێش ئـەوەی خـواردنی تێـدا لێ بنرێـت، ئەگـەر هـاتوو مـەییان تێـدا خواردبـۆوەو گۆشـتی بەرازیان پێ لێ نابوو.

«الشيخ إبن جبرين»

١٥. حوکمی بە کار هێنانی خزمەتکارێکی ئافرەتی نا موسلّمان.

– بـەکار هێنـانی خزمـەتکاری پیـاوو ژن و وشـوفێرو کرێکـاری نـا موسلّمان دروسـت نیـه لـه دوورگـەی عـەرەبی. چـونکه پێغەمبـەر (ﷺ) فرمانی کـردووه بـه دەرکردنـی جولەکـەو دیانـەکان تێیـدا، فرمانی کردووه تەنها موسلّمانی تێدا بژی.

– چونکه لـه پێشخسـتنی کافرەکـان بـه پیـاوو ژنـەوه کاریگـەری ترسناکی بـۆ سـەر موسـلّمانان هەیـه، لـه بـیرو بۆچـوون و بـاوەڕو خوڕەوشت و پەروەردەی منداڵەکانیان.

«الشيخ إبن باز»

١٦. خواردنی کوژراوەکانی خاوەن کتێب،

خـواردنی دروسـته، ئەگـەر نەمانـدەزانی کـه بـه شـێوەیەکی نـا شەرعی سەربڕاوه، چونکه حەلال بـوونی کوژراوەکانیـان ئەصـله، وەکو کوژراوەکانی موسلمان.

«الشيخ إبن باز»

١٧. خواردنی کوژراوەی کافرەکانیتر جگە لە خاوەن کتێبەکان دروست نیە، جا چ ئاگر پەرست بێت، یان بت پەرست بێت ،یان شیوعی بێت یان جۆریتر بن لە جۆرەکانی کافرەکان.

«الشیخ إبن باز»

١٨. جیاوازی نێوان ووشەی (( نصرانی)) وە (( مسیحی))

(مسیحی) ئەوانەن کە وا نیشان دەدەن گوایە ڕەچەڵەکیان دەگەرێتەوە سەر المسیح ابن مریم (علیه السلام)،،بەڵام ئەویش لێیان بەرییە. چاکتر وایە پێیان بگوترێت: (نصاری) هەروەك چۆن قورئان ئەو ناوەی لەوان ناوە.

«الشیخ إبن باز»

١٩. دوقە کردن لە گەڵ جولەکەو دیانەکان ئایا دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە؟

لە گەڵ ئەوانو جگە لەوانیش لە کافرەکان دەستنوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام بۆی نیە دوقەیان لە گەڵ بکات یان سەرەتا سڵاویان لێ بکات

«الشیخ إبن باز»

٢٠. بانگکردنی کافران بۆ زیافەت (وەلیمە):

- ئەگەر دەعوەت کردنەکە لەبەر ئەوە بوو کە حەزی بچێتە ئیسلامو ئامۆژگاریان بکات، ئەوە هیچی تێدا نیە، یان ئەگەر هاتوو میوان بوو لە لای هیچی تێدا نیە بانگی بکات.

- بەڵام دەعوەت کردنیان لە بۆ خواردن ئەگەر لەبەر خاتری برادەرایەتیو خۆشەویستی بێت دروست نیەو نابێت.

«الشیخ إبن باز»

٢١. چۆن هەڵسو کەوت دەکەی لە گەڵ دراوسێی دیان (نصاری)؟

چاکە بکەن لە گەڵ ئەو کەسانەی چاکەتان لە گەڵ دەکەن، ئەگەر هاتوو دیارییەکی ڕێپێدراویان پێشکەش کردن ئێوەش پاداشتیان بدەنەوە لەسەر دیاریەکە، بێ گومان پێغەمبەریش دیاری وەرگرتووە لە گەورەی ڕۆمەکان کاتێك کە گاوریش بوو، وەلە جولەکەکانیش دیاری وەرگرتووە.

٢٢. وە دروستە بۆت خۆت دەربخەی بەرامبەر ئافرەتەکانیان هەر وەك چۆن خۆت دەردەخەی بەرامبەر ئافرەتە موسڵمانەکان بەو جلو بەرگانەی کە خۆیان پێ دەڕازێننەوە.

«الشیخ إبن باز»

# ﴿ ئافرەتو بەرگری کردنو دوو دڵیو دڵەڕاوکێ ﴾

## ❖ ئامۆژگاری گرنگ بۆ لابردنی دڵەڕاوکێو هێنانی بەختەوەری.

١. إحفظ الله يحفظك، إحفظ الله تجده تُجاهك، وإذا سألت فاسأل، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أنَّ الأمة لواجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، وإنِ اجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رفعت الأقلام وجفت الصحف. رواه الترمذي

خوا بپارێزە دەتپارێزێت ، خوا بپارێزە هەمیشە یارمەتیدەرت دەبێ، ئەگەر داوای شتێکت کرد، داوا لە خوا بکە، ئەگەر پشتت بەست، پشت بە خوا ببەستە، وەبزانە ئەگەر خەڵك هەموو لەسەر ئەوە کۆ بن سودێکت پێ بگەینن ناتوانن پێتی بگەینن تەنها ئەوەندە نەبێ کە خوا بۆتی نووسیوە، وە ئەگەر لەسەر ئەوەش کۆ بن کە زیانێکت پێ بگەینن ناتوانن پێتی بگەینن تەنها ئەوەندە نەبێ کە خوا بۆتی نووسیوە، قەزاو بڕیاری خوا بڕاوەتەوەو نووسراوە.

(ڕەتکردنەوە: خوا بپارێزە: ئەو کردەوانە مەکە کە خوا قەدەغەی کردووە)

٢. دڵنەوایی‌و یادی خوا ( الذين آمنوا وتطمئن قلوبهم بذكرالله الا بذكر الله تطمئن القلوب ) واتە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو دڵ‌و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان‌و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگەردار بن دڵەکان: هەر بە قورئان‌و یادی خواو (پابەند بوون بە ئاینەکەیەوە) ئارام دەبێت‌و ئۆقرە دەکرێت؟

٣. پشت بەستن بە خوا: بە چاکی پشتی خۆت بە خوا ببەستە.

کاروباری خۆت بەو بسپێرە، بە حوکمەکەی ڕازی بە، پەنات بۆ ئەو ببە، باوەڕو متمانەت لەسەر ئەو بێت، ئەو بەسە بۆ تۆ ، ئەوەی پشت بەستنی بە خوا بێت، ئەو زاتە بەسە بۆی، بۆ ئەوەی یارمەتیدەری بێت. چونکە بەڕاستی خوا کارو فرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت. بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك، نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیار داوە، کە دەبێت پەیڕەو بکرێت.

٤. ئیش‌وکاری ئەمڕۆ دوا مەخە بۆ بەیانی، ئەرك‌و واجباتت یەك بە دوای یەك کۆتاییان پێ بهێنە.

٥. ئاگەدارو وریای گوناه بە ، چونکە سەرچاوەی غەم‌و پەژارەیە، وەهۆکاری گیرو گرفت‌و دەرگای بەلاو موصیبەتە.

٦. هەست بە فەرموودەی خوای گەورە بکە (( فإن مع العسر یسرا ، إن مع العسر یسراً )) واتە بەڕاستی لە گەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی‌و ئاسانی دێت، بێ گومان لە ڕاستیدا لە گەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی‌و ئاسانی دێت.

٧. ئازاو چەربەزەو دڵ بە هێزو دەروون چەسپاوو وورە بەرز بە، نیازو بڕیارەکانت ڕۆشن بێت.

٨. سوور بە لە گەڵ چاکە کردن لە گەڵ دایکو باوکت.

چونکە ئەوە لە دەروازە گەورەکانی بە ختەوەرییە. جا بە هەڵی بزانە سەردەکەویت.

٩. بزانە گومانو دوو دڵی لە گەورە هۆیەکانی دڵەراوکێن، دوای پرسینت لە خوا (الأستخارة) ، وەرگرتنی پرسو ڕای خەڵکی (الأستشارة) ، سوورو بەردەوام بە لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانت، بەرەو پێشەوا برۆ.

١٠. دوعاو پارانەوەی بەلاو بە سەرهات ئەزبەر بکە.

(( هو الله لا إله إلا الله العظيم الحليم، لا إله إلا الله رب العرش العظيم، لا إله إلا الله رب السموات ورب الارض ورب العرش الكريم).

**رواه البخاري**

واتە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)ی کەورەو خاوەن حیلمو هێدی. هیچ پەرستروێك نیە بە هەق جگە لە پەروەردگاری عەرشی گەورە. هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە پەروەرگاری ئاسمانەکانو زەویو پەروەردگاری عەرشی بەڕێز.

❖ وە دوعای تریش هەیە ( لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالیمن) واتە هیچ پەرستراوێکی هەق نیە جگە لە تۆ، خوایە پاکیو بێ گەردی بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە لە ستەم کارانمو ستەمم لە خۆم کردووە.

١١. بزانــه بەختــەوەریو خۆشــبەختی لــە ڕەســەنی وەجــاخ زادەییو ڕەچەڵەك (نسب)دا نیە. وەلە پارەو پوولو زێڕیشدا نیە، بەڵکو هەموو لە دینو زانستو خوڕەوشتی بەرز دایە.

١٢. قورئــان خــوێن بــە، چــونکە خوێنــەری قورئــان هەســت بــە دڵەڕاوکێو بێ زار بوونو دەستبەتاڵیو هەراسان بوونو بێ تاقەت بوون ناکات.

١٣. لە پەیدا کەرانی دڵەڕاوکێ، کات بە زایەع دانــە، دواخــستنی تەوبــەو پەشــیمان بوونەوەیــە، دەســتدرێژ کردنــە ســەر خــەڵك، ئەزیەت دانی دایكو باوكو بڵاوکردنەوەی نهێنیەکانە.

١٤. داوا کردنــی لێخۆشــبوونو لێبــوردنی خــوا هۆکارێکــە بــۆ نەهێشتنی غەمو پەژارەو دڵەڕاوکێ، گرێیە کوێرەکان دەکاتــەوەو حالو گوزەرانت فراوان دەکات.

❖ حــوکمی خۆکوشــتن (الانتحــار) : ئەوەیــە مــرۆڤ بــە ئەنقەســت خــۆی بکوژێــت بــە هــەر هۆکارێــك بێــت، ئــەوەش لــە گوناهــە گەورەکانە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (من قتل نفسه بشئ فإنه یعذب به في نار جهنم خالداً مخلداً فیها أبداً) (ئەوەی خۆی بە شتێك بکوژێت، ئەوە بەو شتە سزا دەدرێت لە ئاگری دۆزەخ بە نەمری هەتا هەتایێ.

«الشیخ إبن عثیمین»

# ﴿ئافرەتو ئامادە بوونو بۆ ڕۆژی دوایی﴾

❖ لە خوا بترسە ئەی بەندەی خوا چـاودێری بکـە، ئـەمرۆ ئـیش کردنەو لێپێچینەوە نیە، بەیانی لێپچینەوەیە ئیش‌وکـار نیـە.... وەبزانە مرۆڤـ بەردەوام خـەریکی گەمـەو گاڵتەیـە، هـەتاکو مردن دەگاتـە سـەری‌و ئـەو کـات ئاگـەدار دەبێتـەوە. بۆیـە گوتراوە:

فالعیش نوم و الردی یقظة

المرء بینها کالخیال

واتە ژیان نوستنەو مردنیش بە ئاگا بوونە

مرۆڤیش لە نێوانیان وەکو خەیاڵە.

حاڵت چۆنە ئەی بەندەی خـوا کاتێـك گیانـت دەگاتـە قورگتو قاچەکانت لە یەکتر ئاڵانو ماڵ ئاواییت لە پیاوەکەتو کەس‌وکارو کوڕەکانو خۆشەویستەکانت کرد، دەبێ حاڵت چۆن بێت کاتێك لەسەر شانەکان هەڵگیرای، خۆڵ وەکو سەرین خرا ژێر سەرت.!!

جا کەوتیە ناو شەوە زەنگی تاریکیەکانو تەسکی قەبر.

حاڵت چۆن دەبێت کاتێك هەر دوو فریشتەکە ( منکر، نکیر) دێن‌و داتدەنیشێنن ، تامەزرۆی ئەوەن پرسیارت لێ بکەن.

- حاڵت چۆن دەبێت کاتێك لە قەبرستان هەڵدەستیەوە لە رۆژی زیندوو بوونەوە.

- حاڵت چۆن دەبێت کاتێك پەڕاوەکانی کردەوەکەت دەدرێتەوە، پەڕاوەکان دەخرێتە دەستی خاوەنەکەی‌و پردی (الصراط) دادەنرێت‌و میزان دادەنرێت.

الله الله ئەی بەندەی خوا ئەوە گەڕانەوەو چارەنووسمانە.

خوا دەفەموێت ( حتى إذا جاء أحدهم الموت قال رب ارجعون.لعلي أعمل صالحاً فيما تركت كلا إنها كلمةٌ هو قائلها ومن ورائهم برزخ إلى يوم يبعثون. فإذا نفخ في الصور فلا أنساب بينهم يومئذ ولا يتساءلون.) ا(المؤمنون، ٩٩-١٠١)

واتە (خوا نەناسان بەردەوام لە سەر رێبازی چەوتیانن) هەتا ئەو کاتەی مردن یەخەیان دەگرێت، ئەوسا هەر یەکەیان دەڵێت پەروەردگارە بمگێڕەڕەوە بۆ دونیا. بەڵکو چاکە ئەنجام بدەم‌و کاری باشە بکەم‌و ئەو هەلانەی کە لە دەستم چووە لەمەودوا لە دەستی نەدەم،(بەلام تازە کار لە کار ترازاوە، شتی وەها مەحاڵە، بۆیە بە توندی پێ دەوترێت): نەخێر، ئەو قسەیەکە ئەو بۆ خۆی

دەیڵێت، بەڵکو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا ، لە نێوان مردن و زیندوو بوونەوەدا تا کاتێك زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت. جا کاتێك فوو دەکرێت بە (صور) دا، ئەوە هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی لەو ڕۆژەدا نیەو کەس لە کەس نا پرسێتەوە.

شاعیر دەڵێ:

اليوم تفعل ما تشاو وتشتهي

وغداً تموت وترفع الأقلام

واتە ئەمڕۆ ئەوەی دەتەوێت و حەزت لێیە دەیکەی

بەیانیش دەمری و قەلەمەکان هەڵدەگیرێن

وە پێشەوا شافیعی ڕاستی فەرموو کاتێك گوتی

يوم القيامة لا مال ولا ولد

و ضمة القبر تنسي ليلة العرس.

واتە لە ڕۆژی دوایی نە ماڵ و نە منداڵ سوودی هەیە،

وە گەستنی قەبر خۆشی زاوایيت لە یاد دەباتەوە.

رسالة كلمات عابرة للمرأة المسلمة

# ﴿ ڕۆژێكی پڕ لە خوا پەرستنی ﴾

خـوا پەرسـتی ( العبـادە) هـەروەك چـۆن زانایـەكان پێناسـەیان كردووە، لەوانەش شیخ الأسلام إبن تیمیە : ناوێكی كۆ كەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی خـوا پـێی خۆشەو پـێی ڕازیـە لـە قسەو كـردەوە دیـارو نادیارەكـان، ئەگـەر ئـەوەمان بـۆ روون بـۆوەو تێگەیـشتین، بۆمـان هەیـە بڵـێین لـە ژیـانی مرۆڤـ كاتێـك نیـە بـۆ پەرستن بێت كاتێكیتر بۆ پەرستن نەبێت، وە ئەوانـەی وا گومـان دەبەن كە كاتی پەرسـتن تـەنها كاتـەكانی پێـنج نوێژەكەیـە، یـان تەنها ڕەمەزانە كە ڕۆژی فەرز دەگرن، یـان ئـەو كاتەیـە كـە حـەج جێ بەجێ دەكەن، یـان پایـەكانی ئیـسلام جێبـەجێ دەكـەن كـە پەیوەستە بە كاتێكو شوێنێكی دیاری كـراو، ئەوانـەی ئـەو جـۆرە تێگەیشتنەیان هەیە، كە تەنها ئەو شـتانە پەرسـتشن، ئەوانـە زۆر هەڵەن لە تێگەیشتنیان، بەڵكو ئەو شتانە شتی سەرەكین لـە دیـن بەڵام چەمكی پەرستن زۆر فراوانترە.

چەمكی پەرستنی دروستو تەواو ئەوەیە: مرۆڤــ بـەردەوام ئـەوە بێنێتە پێش چاوی خۆی، كە ئەو بەندەی خوایـە. جـا چ لـە نوێـژ بێت یـان دەرەوەی نوێژ بێـت، یـان لـە حاڵـەتی خۆشـی بێـت یـا ناخۆشی، یان لە حاڵەتی كۆبوونەوەی لە گەڵ خەڵك بێـت یـان لـە حاڵـەتی خــەڵوەتی بێـت جیـاوازی نیـە. كاتێـك موسـڵمان بـەو

تێگەیشتنە دەست بە ڕۆیشتن دەكات، ئەوە لە ناو پەرستنی خوادا دەبێت، چونكە بە هەر كردەوەیەك هەڵبستێت پارێزگاری لایەنی خوا دەكاتو هەست بە چاودێری ئەو دەكات، ئەوەش بە پەرستنی خوا دادەنرێت.

هەتاكو ئەو پارەی لە كەسو كاری خەرج دەكات، بەڵكو هەتا ئەو كاتەی كە شەهوەتەكەی خۆی تێر دەكات لە حەلال، ئەوە لە ناو پەرستنی خوای گەورەو تاكو تەنیادا دەبێت.

وە كاتێك لە چەمكی دروستی پەرستن تێدەگەین، ئەوە دەبێتە فاكتەرێكی یارمەتیدەر بۆمان بۆ وەبەر هێنانی كاتەكانمانو بەكارهێنانی بۆ ئەو شتانەی سوودبەخشە، بەڵكو ئەو كاتەی كە كاتەكانمان بەزایەع دەدەیەن بەبێ سوود، ئەوە دەگەینێت بەڕاستی ئێمە چەمكی پەرستنی دروستمان پێشێل كردووە.

تۆ ئەی ئافرەتی موسڵمان: تۆ كاتێك لە ماڵەوە پارێزگاری لەو شتانە دەكەی كە خوای گەورە پێتی سپاردووە لە سپاردەكانی پارەی مێردو شەرەفو ناموسی، یان پەروەردەكردنی منداڵەكانی، یان هەر كارێك كە پێی هەڵدەستێت لە ماڵەوە، لەو كاتەی كە ئەو كارە بەمەستێكی ڕاستگۆیانە، بە ئامانجو ئومێدیكی چاك ئەنجام دەدەی، ئەو جۆرە نیەتە كارەكانی بۆ دەكاتە پەرستنێك لەسەری پاداشت دەكرێت.

## ﴿ ئافرەتو بە تاڵی ﴾

عبدالله کوڕی مسعود فەرموویەتی:

(( لەسەر هیچ شتێك ئەوەندە پەشیمان نەبویمەوە، بە قەد پەشیمانیم لەسەر ڕۆژێك کە خۆر تێیدا ئاوا بووبێت تەمەنەکەم کەم بووبێت، ئیشێکەم تێدا زیاد نەکردبێت.

❖ تەمەنی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئەو سالآنە نیە کە بەسەری دەبات لە ڕۆژی لە دایك بوونی تاکو مردنی، بەڵکو تەمەنی ڕاستەقینەی مرۆڤ بە قەد ئەو چاکەو کردەوە پڕ خێرو بێرانەیە کە لە لای خوای گەورە بۆی نووسراوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( لن تزول قدما عبد یوم القیامة حتی یسأل عن أربع خصال و ذکر " عن عمره فیما أفناه") واتە دوو قاچی هیچ بەندەیەك لە بەردەم خوا لا ناچێت هەتا چوار پرسیاری لێ نەکرێت. لەوانە باسی تەمەنی کرد (( عن عمره فیما أفناه)) واتە تەمەنەکەی لە چی بە سەر بردووە.

❖ ژیان شتێکی ڕۆتینو دووبارە بوو نیە، هەروەکو چۆن وەها دێتە پێش چاوت، تەنها خواردن .... خواردنەوەو نوستنو گاڵتەو گەپو..... خۆڕازندنەوەو شانازی کردن لەسەر یەکتر بێت. بەڵکو ئەو جۆرە ژیانە، ژیانی بێ ئاگایانە.

❖ بەڵکو تۆ بۆ شتێكو ئامانجێکی بەرزتر دروستکراوی لەو ژیانە، ئەویش پەرستنی خوای تاقانەو بێ هاوەڵە.

❖ ئەو بەربەستانەی کە ئافرەت دوور دەخاتەوە لەوەی کە کاتەکەی وەبەربێنێت

❖ ١. دووررو درێژی هیواو ئاواتی، دواخستنی کاری چاکی، دواخستنی تەوبە کردنی.

هەر کاتێك مرۆڤ ویستی کارێك بکات شەیتان دێتە لایەو هەڵیدەخەڵەتێنێت بۆ بەدواخستنی کارە چاکەکە، پێی دەلێت بەیانی بیکە یا دوو بەیانی بیکە... ئیتر بەو شێوە تەمەنەکەی بەسەر دەباو هیچ شتێك لەو شتانەی کە دەیەوێت بۆی جێ بەجێ نەبوو،

❖ با دوا خستنی کارە چاکەکانمان بە سوور بوونو بەردەوام بوون ببڕینو کۆتایی پێ بهێنین.

٢. خۆ خەریك کردن بە شتی بێ سوود بەڵکو هەندێك جار بەشتی حەڕام.

❖ لە نموونەکانی زایەع کردنی کات بەبێ سوود.

بەدوا چوونو سەیر کردنی پەڕاوو گۆڤاری بەد ڕەوشتیو ڕووت، گوێگرتنی کاسێتی حەڕامو.... بە دوا چوونو سەیرکردنی زنجیرە فلیمی هیچو پوچی خەراپ.... درێژە پێ دانی قسەو گوفتار لە تەلەفۆنەکان .... بە دوا چوونی جلو بەرگی نوێ... زۆر چوونە دەرەوە بۆ بازاڕ.

## ئەی ئافرەتی پیرۆزی بەڕێز.

سوود لە کاتەکانت وەربگرە بۆ خوێندنەوەی کتێبی دینیو چیرۆکی پێغەمبەرانو خوێندنەوەی قورئان... جا دەبینی چۆن بەرەکەتو پاكو خاوێنیو باڵ دەکێشێت بۆ سەر ماڵەکەت.

٣. پێشڕەوایەتیو هاوەڵی خەراپ.

هەندێك لە ئافرەتان سەیری لە خۆی لە ژێرتر دەکات لە کەم وەبەرهێنانو بەکارهێنانی کاتەکانی، وە سەیری لە خۆی چاکتر ناکات، ئەو شتەش بۆ خۆی دەکاتە بیانو، دەڵێ فولانیش زیاتر لە من کاتەکانی بە فیڕۆ دەدات.

٤. هەست کردن بە کەمو کوڕیو لاوازی.

لەوانەیە هەندێك لە ئافرەت هەبن وورەیان بە هێز بێتو توانای سوود بینینی هەبێت لە کاتەکانی، بەڵام بە خۆی دەروونی خۆی دەشکێنێتەوە، هەر کاتێك ئەگەر ویستی کردەوەیەك بکات، هەست دەکات کە ئەو لەو کردەوەیە کەمترەو ناتوانێت بیکات.

**چارەسەر:**

داوای یارمەتی لە خوا بکات، بزانیّ ئەو شتە لە وەسوەسەکانی شەیتانە

❖ ڕاهێنانی دەروونو مەشق پیّ کردنی، جار دوای جار هەتاکو لەسەر ئەو کردەوەیە ڕا دێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

( والذين جاهدوا فينا لنهديهم سبلنا)

❖ پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم

پرۆگرامێکی ڕۆژانەی ئیشکردنت هەبێت، بۆ وەبەرهێنانی هەموو ساتێك لە ساتەکانی کاتەکانت لە بەیانیەوە تاکو ئێوارە، وە هەوڵ بدە بە پیّی توانات دەستگرتوو بیت بەو پرۆگرامە هەتاکو کاتەکانت بە فیرۆ نەچێت کاتێك تۆش بێ ئاگاو هەست ناکەی

( کات کە ڕۆیشت ناگەڕێتەوە)

❖ پارێزگاری لە هەموو ویردەکانی ئێوارەو بەیانی بکە.

چونکە خۆشەویسترین کەس لە لایەن خوا ئەو کەسەیە کە بەردەوام لێوەکانی تەڕە بە یادی خوا.

(رسالة كيف تقضي المسلمة وقتها)

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە یارمەتی دانو بەخششی، کاری چاك تەواو دەبێت.

**ناوەرۆك**